جەمال بابان

# گەشتێ بە ناخی تەمەندا

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي








ناوی کتێب: گەشتێ بەناخی تەمەندا

نووسینی: جەمال بابان

بابەت:یاداشتنامە

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج

هەڵەچنی: سارا عەبدوڵلا

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٤٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ١٢٩ی ٢٠٠٧

چاپخانەی: دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم

چاپی : یەکەم ساڵی٢٠٠٧

کوردستان سلێمانی

www.sardamco.com

# پێرست

# پێشەکی

ساڵی (١٩٤٧) قوتابی ساڵی یەکەمی (کۆلێجی ماف- حقوق) بووم لە بەغدا. ئێستگەی ڕادیۆی کوردی هەر لە بەغدا کە ساڵی (١٩٣٨)دامەزرابوو. خوالێخۆشبوو (کامیل کاکەمین) بەڕێوەبەری بوو، ناردی بەدوای چەند قوتابییەکی کۆلێجەکانی بەغدا (ئەوسا زانکۆ نەبوو). من یەکێکبووم لەوانە، کەچووم بەڕوویەکی گەلێك خۆشەوە پێشوازی کردم زیاتر دۆستایەتی پیشانداو خزمەتی نیشتمان و زمانی کوردی کرد بەسەر باشقەی قسەکانی. داوای کرد کە یارمەتی بدەین، چونکە ئێستگەکە هی سەرجەم میللەتی کوردە، بەڕاستی ئێمەی سەرگەرمی کوردایەتیش هەر زوو بەدەنگیەوە چووین، من خوێندنەوەی شتی کۆمەلایەتی پێ سپاردم. یەکەم باس کە پێشکەشم کرد (کۆشی دایك) نووسینێکی خوالێخۆشبوو (شێخ محەمەدی خاڵ) بوو، کە هەموولایەك پێیان خۆش بوو. ئەوە زیاتر هانیدام کە بەگەرمی و دڵسوزییەوە بەدوای سەرچاوەی کوردی و عەرەبیدا بگەڕێم کە ئەم جۆرە باسانەی لێهەڵیەنجم. ئیتر هەر لەگەڵ ئێستگەی کوردی بەغدادا ڕامکێشا تا خوێندنم تەواوکرد. بۆ هەر باسێکیش کە پێشکەشم دەکرد کە (حدیث- اذاعي)یان پێ دەوت(٣) سێ دینارم وەردەگرت کە ئەوسا پارەیەکی کەم نەبوو بۆ ئەو ڕۆژانە.

ناڵێم (خلفیه یاخود باکگراوند)ی پێش ئێستگەم نەبوو، بەڵکو کە قوتابی ناوەندیو ئامادەیی بووم لە سلێمانی لە ماڵی باپیرم بووم، چونکە باوکم بەڕێوەبەری ناحیە بوو، ماڵی باپیرم کتێبخانەیەکی مامناوەندیان هەبوو کە زیاتر کتێبەکانی خوالێخۆشبوان (ئەمین زەکی بەگ و حوزنی موکریانی)یان

گرتبووەخۆ، لە بابەت(مێژووی کورد)ەوە. منیش لەپاڵ دەرسەکانی قوتابخانەمداو کە هەلم بۆ دەرەخسا وردە وردە ئەوانیشم سەیردەکردو دەم خوێندنەوە، تاکو لەدوایدا کە سەیرم کرد هەروا ئەو کتێبانە لەوێدا کەوتوون و کەس لێیان ناپرسێتەوە، هەموویانم برد بۆ خۆم و ئێستاش هەموویانم لاماون.

ساڵی (١٩٥٠) دوای تەواوکردنی (حقوق) بە بەڕێوەبەری ناحیە دامەزرام، هەر لەو ناحیەیەی کە باوکم و مامم و لەوەپێشتر خزمەکانی ترم واتا (ناحیەی تانجەرۆ – عەربەت)بوو، وەك وتیشم لەبەرئەوەی کە باوکم لەوێ کارگێربوو منیش تەمەنی مێردمنداڵی و هەندێ ساڵی گەنجیم لەوێ ڕابوارد، باوکم ئەوپەڕی ئازادی پێبەخشی بووم بۆ تێکەڵاوبوون لەگەڵ دانیشتوانی دێیەکەو ناوچەکەدا، کە زۆری هەڵسوکەوت پیشەو کارە فۆلکلۆریەکانیانم هەزم کرد کە ئەوەش گەلێك یارمەتی(پاشەڕۆژی ئەدەبی) دام.

ساڵی (١٩٥٣ تا ١٩٥٤)لە خورماڵ بووم، لەوکاتەدا کودەتاکەی شای ئێران دژی وەزارەتەکەی (محەمەد مصدق) سەرەك وەزیرانی ئێران ڕوویدابو دادگایی مصدق دەستی پێکردو (دارمنشورات البصری) بە زنجیرە محاکمە مصدقی بڵاو دەکردەوە، منیش خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژم لە سلێمانی ڕاسپاردبوو کە هەمووی بۆ دەناردم. ئەوانەم وەك پیاوێکی (مافناس) کورت کردەوەو محاکمەی مصدقم بەکوردی لێ پێك هێنا، لەوەپێش (محاکمەی سوقرات)م هەبوو ئەویشم وەرگێڕا، دوای ئەوە گەلێك (محاکماتی مێژوویینی) ترم ئامادەکردو لەدواییدا وابزانم ساڵی (١٩٧٨) لە بەغدا بەچاپم گەیاند.

ساڵی (١٩٥٦) لە (میرزا ڕۆستەم) بووم کە هێشتا نەبووبوو بەژێر ئاوی حەوزی دوکانەوە، یەکەم نووسینم لەوێوە نارد بۆ ڕۆژنامەی ژین (خواردەمەنییە بەناوبانگەکانی کوردستان) وەك (گوێزی هەورامان، ڕێواسی کەلی خان، کاڵەك و شووتی قەڵاچوالان...) ئیتر خوێندەوارو نووسەر قۆستیانەوەو بەدوای منا

دەستیان پێ کرد.. ئەمە ئەوەندەی تر هانی دام بۆ شت نووسین و بڵاوکردنەوەی، بەڵام ئەوەی کە وەك کتێب بۆ یەکەمجار چاپم کردو بڵاوم کردەوە، چیرۆکی (خانزاد) بوو کە باسەکە تێکڕا لەسەر ژیانی ئەوسای لادێ و زۆرداریی خاوەن موڵك و کچ بەزۆر بەشوودان و دابونەریتی لادێ کە بەڕاستی (الهام)ی نووسینەکەیم لە (لالۆ کەریم)ی مامۆستا (جەمال نەبەز)ەوە وەرگرت و زانیاری فۆلکلۆری خۆمم پێ تاقی کردەوە کە دەنگێکی زۆری بەباشی دایەوە.

کە لافاوەکەی ڕۆژی (١٩٥٧/١٠/١٨) یەخەی دانیشتوانی شاری سلێمانی گرت، من ئەوسا بەڕێوەبەری ناحیەی (کندیناوە- دیبەگە) بووم، گورج هاتمەوە سلێمانی بۆ بەسەرکردنەوەی شارە نازدارەکەم و دانیشتوانی، ئیتر هەرکەسێکم دەدی هەریەکە لەلای خۆیەوە کارەساتەکەی چۆن دیبوو بەوجۆرە بۆی دەگێڕامەوە، تا وردە وردە ئەو قسانە هەموویان لە مێشکما چەکەرەیان کرد، منیش(چیرۆکی پەڵە هەورێکی چڵکن)م لێ دەرهێنا کە ساڵی (١٩٥٨)بڵاوبۆوە.

ئەمەبوو دەستپێکردنەکەم.. ئیتر لەوەبەدواوە زیاتر قەڵەمم بۆ تیژکردەوە، کە لە خوا بەزیادبێ تائێستاش لەکارایەو نەوەستاوە.

لەبەرئەوەی دوای (١٤ی تەمموزی١٩٥٨)گواستمەوە بەغداد هەربە ئەرکی میری و لەدواییدا وەك(پارێزەر) لەوێ مامەوە. ساڵەکانی (١٩٦٧- ١٩٦٩)ی لێدەرچێ کە بە (سەرۆکی شارەوانی) هاتمەوە سلێمانی، ئەو ماوەیە هەتا ساڵی (٢٠٠٣)هەر لە بەغدا مامەوەو زۆریشم حەزدەکرد پێش ئەو ماوەیە بێمەوە سلێمانی، بەڵام کتێبخانەکەم بۆ نەدەگوێزرایەوە کە کتێبەکانم خۆراکی گیانم و هێزی ژیانم و ڕووناکی چاومن، ئەگەر هەوڵی هاتنەوەم بدایەو دوسێیەك لەو کتێبانەم پێ بگیرایە بێگومان ئێستا منیش لە یەکێك لە (گۆڕە بەکۆمەڵەکانا) ئێسقانم ڕزیبوو، بۆیە زۆری کتێبەکانم هەر لە بەغدا بەچاپ گەیاند (لەدوای ڕزگاربوونی کوردستان دووانیان لە دەزگای چاپەمەنی سەردەم و یەکێکیان

وەزارەتی رۆشنبیری بەسوپاسەوە بۆیان چاپکردم). هەر لەبەرئەوەی کە ئەو ماوەیە لە بەغدا بووم، بۆیە سەرجەم نووسینەکانی ئەم کتێبەم لە گۆڤارو رۆژنامە کوردییەکانی ئەوسای بەغدادا بلاّوکردۆتەوە.

بەم کتێبەوە کە دەردەچێت نزیکەی(٣٠ )کتێبم هەیە بە کوردی و بە عەرەبی، بە راڤەکردن و لێکۆڵینەوەو پێشکەشکردنەوە، سیانیشم چاوەڕێی چاپن، بەڵکو ئەوانیش خوای گەورە هەلیان بۆ برەخسێنێ، ناوی هەموو کتێبەکانم و شوێن و ساڵی چاپیان لەدواوە نووسراوە.

لە کۆتاییدا دەڵێم: لەخوا بەزیادبێ کەلەم دواداوییەی تەمەنما بەشارە گەشاوەکەمی شادکردمەوە، ئەوەندە هێزی چاوو لەشی پێبەخشیوم کە تائێستا بتوانم قەڵەمم لەکارابێ بۆ خزمەت و ڕوونکردنەوەی مێژوو ئەدەب و دابونەریت و چمکە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی... میللەتەکەم کە ئەوە ئەوپەڕی شادیێ و کامەرانی منن.

جەمال بابان

حوزەیرانی (٢٠٠٤) سلێمانی

# گەشتێك بەناخی تەمەندا

## ١

ئای کە بیری منداڵی تیژو ڕوون و بێگەردە ! پەڵەو لەکەی پێوە نییە، خۆ منداڵ هەر شتێکی بینی یا بیستی گورج لە دەفتەرە سپیەکەی مێشکیا لەچاپ دەدرێت، بەڵام بە مەرەکەبێك کە هەرگیز نەسرێتەوە.

ماڵەکەمان نزیك سەرای ئێستاو نزیك مزگەوتی شێخەلی بوو لە سلێمانی. هەمیشە وەك منداڵێك بەدوای دایکمەوە بووم، ئەویش منی بە تەنها بەجێ نەدەهێشت. تەمەنم چوار ساڵ بوو شەڕی بەردەرکی سەرا وەك ڕووداوێکی گرنگ لە ئاوێنەی ژیانما باش لەبەرچاومە (ئەوندەی مێشکی منداڵێکی بچووك ئاخنیبێتیە ناو پوولەکەکانی مێشکییەوە) واتا شەڕی (ڕۆژی ڕەشی ٦ ی ئەیلوولی ساڵی١٩٣٠) گوێم لە تەقەی تفەنگ و شریخەی مەترەلوێز بوو. خێرا خێرا ملم دەنا ڕاکەمە دەرەوە بۆ ناو هەڵبەستە بەرزەکەی (ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە).

ساڵی (١٩٣٥) لە قوتابخانەی (فەیصەلیە) بووم نزیك سەرا کە ئێستا کراوە بە بازاڕو هیچ شوێنەواری نەماوە، لەکاتی خۆیدا واتا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئنگلیزدا (١٩١٩) شوێنی (حاکمی سیاسی) بوو.

ئەوسا کە تەنها سێ قوتابخانەی سەرەتایی کوردان هەبوو لە سلێمانیدا. فەیصەلیە بەناوی (مەلیك فەیصەل) و(خالدیە) بەناوی (خالید کوڕی وەلید) لە نزیك سەرشەقام و(ئەیوبیە) بەناوی (سەلاحەدینی ئەیوبی)ەوە کە لە خوار سەر شەقامەوە بوو نزیك گەڕەکی جولەکان. یەك قوتابخانەی کۆیەندەکە، بەڵام هەر کە (ڕەعنا خان)ی دراوسێمان داوێنی (عەلی) کوڕی دەگرت و وەك پاڕانەوە پێی دەوت: "دەخیلت بم نەچیتە دەرەوە، گوللەیەکی وێڵت بۆ (نازێ) دەبێت و تووش دەبی."

ئەوسا منیشیان ڕاکێشابە دواوەو دەرگایان خڕ لەسەر داخستم، بەڵام لەدوایدا لە دایکم دەبیست کە باسی (فایەق بێکەس)ی ئامۆزای دەکرد کە یەکێك بووە لە پێشەواکانی ئەو خەڵکەی کە ڕووەو سەرا ملیان دەنا. هەر لەدوایشدا بیستم کە فایەق و (عەزمی بەگی باپیرم و شەوکەت بەگی مامم و میرزا تۆفیقی قەزازو حەماغای ئەورەحماناغاو ئەورەحماناغای ئەحمەد پاشای خاڵی باوکم) و گەلێکی تریان گرتووە، هەندێکیان ناردوون بۆ کەرکووك.

یەك دوو ڕۆژ دوای شەڕەکە لەگەڵ منداڵی گەڕەك دەهاتینە دەرەوە، دەمان بیست کە گوایە سەرەتایی کچانیش هەبووە نزیك مزگەوتی گەورەی ئێستا کە بووە بە شەقام و قوتابخانەیەکی ناوەندیش هەبوو لە سەرەوەی شار نزیك خەستەخانە (نەخۆشخانە)ی سلێمانی ئەوسا خەستەخانەی کۆن کەرخی ژوورووی و گەڕەکی جولەکان کەرخی خوارووی و ماڵی باپیرم (ماڵی عەزمی بەگ و ئاشی گاوران و سەدەکەو کەرخی ڕۆژهەڵات و باخچەی گشتی و ماڵی متصرف (کە ئەوانیش لەم دواییەدا دروستکران) کەرخی ڕۆژئاوا بوون و حەماڵێکی هەژاری بێ تاوان لەو شەڕەدا بوو بە گولەی وێڵەوەو ناوی (ئەلەگون سوتاو)بوو، لە ترسی هەڵگیرساندنەوەی شەڕو بۆ هەواڵپرسینی باپیرم و مامم باوکم هەموومانی بردە ماڵی باپیرم لە قەراخ شاری سلێمانی کە ماڵێك نەبوو لەولایەوەو لەسەر کارێزی دایکی پاشا بوو (کە ئێستا بەداخەوە شوێنەواریان نەماوە)، لەوێ لەبیرمە خزمان هەموو کۆبیبوونەوە، مات و خەمبار. فاتمە خانی ژنی باپیرم شەو لەسەر زەوی (بێ لێفەو دۆشەك) پاڵ دەکەوت و پانی بەرزی دەکرد بەسەرین. ئەی گوایە چۆن ئەو لە جێگای گەرم و نەرما بنوێ و مێردەکەی لە بەندیخانەدا هیچ نەبێ لەژێر خۆیا ڕاخات. کە باپیرم و مامم دوای بەینێك بەربوون و ڕزگاریان بوو، کوڕێکی مامم لەو کاتەدا لە دایك بوو، بەو بۆنەیەوە ئەو کوڕەیان ناونا، هەر بەو بۆنەیەوە مەڕ درا بەعەرداو مەولود کرا. منداڵە وردەکان تێر نوقڵ و گوێزو مێوژیان خوارد.

٢

لە قوتابخانەی فەیصەلیە ڕابەری پـۆل(مرشـدی صـف)، (خالیـد ئەفەنـدی)بـوو، پیاوێکی بەتەمەن و تووڕەو بێ چیکدانە بوو، کۆنە ئەفسەریش بوو، لام وایە هاوڕێی (یاسین پاشای هاشمی یا نوری سەعید) بوو لە سوپای عوسمانیدا پارمەتیان دابـوو، کرابوویان بە مامۆستا، بەڵام (ئـصولی تەربیـە)و دەرسـوتنەوەی نـەدەزانی، هـەموو شتێکی بەکوتەك و زللە دەکرد. قوتابیـەکمان لەگـەڵ بـوو (مـەحمودی لالـەمین--- خولەی ئەمین)، یەکێکی تریش (سالح ئەمین بالدار) لەگـەڵ ئەوانـدا بـەینی نـەختێك باش بوو، چونکە لە ئێمە گەورەتر بوون و بەدڵی ئەو دەجوڵانەوە، هەرچـەندە کاکـە مەحمودیـــشی نـــاو نـــابوو (مـــەحمودە فەنـــدی بلبـــستان) نـــەم دەزانـــێ مەبەستی(بالبستان)ە یان لە بلبلەوە هێنابوویەوە !

ناخۆشترین سزا کە ڕۆحی هەموومانی پێ بردبـوو تۆقانـدبوونی سەرتاشـینەکەی بوو، قوتابی (منداڵ)ی دەنایە ژێر باڵێکی، پەنجە گەورەی دەستەکەی تری بەهەموو هێزێکیەوە بەناو توکە سـەریا وەك چـەقۆ دەیـبردو دانـی ڕیـچ دەکـردەوە، بێگومـان قژی منداڵ تەنکە بۆیە ئازەخمان بەچـاوی خۆمـان دەدی، جـار جـار لـە پەلەقاژێـدا دەستمان بەر ستارە خوریەکەی دەکەوت کە بەهاوین و زستان لە سەریا بوو، ئێـرەو ئـەوێ دەپـەڕی، ئـیتر ئـەویش ئەوەنـدەی تـر شـێتگیر دەبـوو. (صـالح ئەفەنـدی قەفتان)یش کە مدیرمان بـوو، نەیدەویـست دڵـی بشکێنێ. ئـەو سـاڵەمان بـەوجۆرە لەگەڵ ئەو ڕابوارد. ئەوسـا (قرائـەتی خلدونیـە)ی (سـاطع الحـصری)مـان دەخوێنـد بەعەرەبیە. کوردیش خوێندنەوەیەك بـوو خوالێخۆشـبوو (ئەحمـەدی عـەزیز ئاغـا) دایناپوو. هەنـدێك وشـەیم لەبـەرە (هـاوین گەرمـە، بـەهار خۆشـە، هـەورلمان شـاخی زۆرە)، (نەختێك ئاوم بۆ بهێنە، ئەم هێلانەیە هی هەڵۆیە...) ئەمە لەسـەر پیتـی(ه). لەسەر پیتـی(پ) (پیـری گێیـەمان بـوو، ڕیـۆقی زۆر بـوو...). لـە(محفوظـات)یـشدا (غنمی غنمی ما اجملها في موقفها تحت الـشجر. سـیری سـیری نحـو المرعـی، واجـری

فوق الارض الخضرة، ذئب يعوى فى وادينا... اسرع اسرع يا راعينا قرب الذئب القاسى منا، ان لم تدركنا او ذبنا...).

(سوفى حەمەمین)ێکی ناسیاومان هەبوو، خۆش خۆش هاتوچۆی دەکردین. پیاوێکی سەرووریش سپی کەڵەگەتی ئێسکسووکی دەم بەپێکەنین وقسەخۆش و سەرو زمان شیرین، هەمیشە کە دەهات بندەستیم بەرنەدەدا هەر(حەکایەت)و سەرگوزشتەی بۆ دەگێڕامەوە، لەبنەڕەتا لام وایە خەڵکی دێی (پارەزان)بوو. یەکێك لە حەکایەتەکانی ئەم بەیتە فۆلکلۆریە بوو:

کەرێکم بوو کیت و میتە بارم کرد لە پروپیتە، چوومە شاری گۆپیتە. لام دایە گەرەکێ بە دوو ژن دەیان ڕست. خەرەکێ وتم پورەکێ مستێ جۆ بدە بە کەرەکوڵەکێ. وتی حاشابێ لە دەنکێ. وتم کەرەکوڵ برۆ هەورازە. وتی نابم بە ئێستری جامبازە. وتم کەرەکوڵ برۆ شەوە. وتی سەعاتێ لەکنم هەڵخەوە.

کاتێکم زانی بە دوو گورگی سەرقەوی سەرقەوی کەرەکوڵیان داوەتە بان زەوی. کەرەکوڵ نەماوە، جەرگی بریاوە، چوومە ئاڵیاوە، نان و پێخەف دانریاوە، مریشکێك ڕاوەسیاوە. هەرچەند وتم کشە کشە ئەو سەگبابەی باڵقشە سی و دوو نانی ڕاکێشا، کوتەکێکم پیا کێشا، چرچەی لنگیم ڕاکێشا، کەرەتێك قووقانی، دوو جوجکی هانی، یەکێکی دەنووك پۆڵایە، شەق شەق دەیدا لەدەرگایە، وامزانی هەمزاغایە، یەکێکی کونجە، ڕاوی نام تا بەرزنجە.

دەمەرواش بوو، مام حەمەمین ئەوەندەی ئەم بەیتە بۆ وتین تاکو باوکم کە فەرمانبەر بوو گوێزرایەوە بۆ بەرزنجە. ئەو ساڵەش من لە پۆلی یەکی سەرەتاییەوە دەرچووبووم بۆ پۆلی دوو، ساڵیش بوو بە (١٩٣٦).

# بەرزنجەی جوان و پیرۆز

دێی بەرزنجە کە دێیەکی شێخ نشین بوو. گۆڕی پیرۆزی جووتە برا (شێخ عیسیٰ و شێخ موسیٰ)ی لێیە کە شێخ موسیٰ فەرمانی یەزدانی بەجیٰ هێنا منداڵی نەبوو، شێخ عیسای برای ژنەکەی مارە کرد لەخۆی و دوانزە منداڵی لیٰ بوو، کە ئەوانە دەبن بە باپیرە گەورەی (سادات) واتا زۆربەی شێخانی ناوچەی سلێمانی و کەرکوك و هەولێرو خانەقین و شوێنانی تر. ئەوەندەی بیرم بێت کورەکانی شێخ عیسیٰ (سەید صادق— کە گوندی سەید صادقی ئیستەی بەناوەوەیەو گۆڕی پیرۆزیشی لەوێیە)، (میری سوور، لەدێی میری سووری سەر بە ناحیەی خورماڵ)، (وصال الدین)، (بایەزید، حسن، حسین). ئەوەی شایانی باسە (حاجی شێخ مارفی نۆدیٰ و حاجی کاك ئەحمەدی شێخ و شێخی نەمر شێخ مەحمودی حەفید...) هەموویان دەچنەوە سەر ئەم ساداتی بەرزنجەیە.

ڕێگای بەینی سلێمانی و بەرزنجەی ئەو سەردەمە زۆر ناخۆش بوو تاکو ڕێگاکە گەیشتۆتە سەریٰ گەلێك پێچ و پەنای ناقۆلای تێخراوە، لەوەش بەدواوە تووشت دەبوو بە تووشی دەشتی (زەڵی)وە کە لە زستاندا گامێشی قووت دەدا و ڕێگا دەبڕا. تەنها (مفتش)ێکی ئینگلیز هەبوو کە دەهات زنجیری دەبەست بە تایەی ئۆتۆمۆبیلەکەیەوە، لەبەرئەوە نەدەچەقی و دەگەیشتە ناو دیٰ. دێی بەرزنجەش وەك دێهاتە شاخاوییەکان وەك (عەقرە) قات قاتە، واتا چەند ڕیزێکە یەك لەدوای یەك سەر دەکەوێت. ئەو مزگەوتەی لە بەرزنجەدا هەیە داستانی سەیری لیٰ دەگێڕنەوە !. مزگەوتەکەش جووتە برا شێخ عیسیٰ و شێخ موسیٰ دروستیان کردووە بەیارمەتی (حاجی شێخ خاڵ— خالد). ئیتر ئەوسا بەیەك دەگەینەوە.

دەگەڕێمەوە بۆ یادلشتەکانیشم بزانم لە بابەت خوالێخۆشبوو (زێوەر ئەفەندی)یەوە چیم هەیە کە ئەو دەمە بەڕێوەبەری قوتابخانەی بەرزنجە بوو.

## ٣

دێی بەرزنجە دەکەوێتە ناوچەی شارباژێڕەوە. ناوچەیەکی شاخاوی و سەختە، وەك سەختی ژیانی دانیشتوانی، زۆریەی ژیانی ئابوریبان بە میوەهات، واتا بە ڕەزو باخاتەوە بەندە، چونکە زەویبان کەمە بۆ مەرەزەو توتن و گەنم و جۆ، بەلام لەو دەشتی مۆریاسەی نزیك بەرزنجە نیسك و نۆك باش دەچێنرا، باقی زۆریەی بەرهەمیان ترێ و ئەوەی لە ترێ دروست دەکرێت وەك مێوژو باسوق و سجوق. ئەوسا واتا سالی (١٩٣٦)کە ئێمە لەوێ بووین (بەڕوو)شیان بەکار دەهێنا بۆ خواردن، لەو دار قەزوانەی ئەو ناوە تەزبیحی ئەبلەقی ئەوەندە جوان وپڕ لەخاڵ و نەقش پەیدا دەبوو، پیاو دڵی نەدەهات سەیری بکات! بێگومان بە گرتن زیاتر بە دەستەوەو سوونەوەی بە هەردوو دەست ئەوەندەی تر بریقەی لێ پەیدا دەبوو.

بەرزنجەیی ناوی سەیریان لە خۆشیان و لە خەڵکیش دەنا، بەجۆرێك کەس نەبوو (لەقەب)ێکی نەدرابێتە پاڵ وەك (کەریمە کەڵە، حسە دەڵبە، ڕەشە ڕەپە...)و زۆری تر لەم بابەتە.

هۆی هاتوچۆو گواستنەوەیان ئەوسا زیاتر ئێستر بوو، بەوەدا کە وڵاخێکی بەهێزو پتەوە بۆ ناو شاخ و داخ دوای ئەو (نێرەکەر)، بەلام هەرگیز (ماکەر)یان ڕانەدەگرت، نازانم هۆی چی بوو، ڕەنگ هەیە لەبەرئەوە بوبێت (مێ) وەك (نێر) نەتوانێ لەو چیایەداو لە هاتوچۆدا بەرگە بگرێت.

هەروەها ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام لە بەرزنجەی ئەوسا ئەوەبوو گەنجەکانیان بەزۆری دەبوون بە سەربازو پێیان دەوتن (کوڕی حکومەت). جا کە بۆ پشوو دەهاتنەوە، کەواو سەڵتە، یا شەرواڵ و مرلخانییان لەبەر دەکرد، پشتێنێکی قەف ئەستوریان دەبەست خەنجەرێك بە تەزبیحێکی موروی زەرد یا سورەوە دەیاندا لە پشتێنەکەو سەریان (قۆچی تاش) دەکردو کڵاو مشکیان لەسەر دەنا، لەسەر

بانێژەو بەلای كانی ژناندا پیاسەیان دەكرد، شایان بەگەدا دەزانی. خۆ ئەگەر شاییەك یا هەڵپەڕكێیەك بووایە قریوەو های و هووی ئەوانە پیاوی كەڕ دەكرد.

مەلا فایق (بەختیار زێوەر) كوڕی زێوەر ئەفەنی ئەوسا لە بەرزنجە لای باوكی بوو، بەڵام من زیاتر بە فەقێ دەهاتە پێش چاوم، لام وایە ئەوسا كانی (شیعر)ی هێشتا بەتەواوەتی لە دەروونیا هەڵنەقوڵا بوو، باری تەندروستیشی زۆر تەواو نەبوو، بەڵام یاخوا بە ڕەحمەت بێ زێوەر ئەفەنی نەك هەر مامۆستاو شاعیرو ئەدیب بوو، بەڵكو باوكێكی دڵسۆزو پیاوێكی ئەوەندە بەڕێزو ڕووخۆش بوو، منداڵێكی وەك ئەوسای من نەك هەر لە قوتابخانە، بەڵكو حەزم دەكرد هەمیشە لە خزمەتیا بم. ئەوسا (جەمعیەی تەیران) لە جەژنەكاندا بۆ (تبرعات) كۆكردنەوە، وردە كاغەزی بڵاودەكردەوە كە تەمغەی سوری فڕۆكە نیشانی پێوە بوو دەیاندایە قوتابی. بە دەرزیەكی سەرخڕ دەمان كرد بە یەخەی خەڵكدا، سا هەر كەسە فلسێك یا دوو فلس یا عانەیەك (چوار فلس)ی بدایە ئەوە بە دەوڵەمەند دادەنرا. من كە ئەم ئەركەم بەرەو ڕوو كرابێوە لە یەكێك لە جەژنەكانا، لەگەڵ هاوڕێكەم خۆمان كرد بەماڵی مامۆستا زیوەردا، خەڵكێكی زۆر دانیشتبوون، دوای ئەوەی تەیارەی كاغەزمان كرد بە بەرۆكی دانیشتواندا، امۆستای بەڕێز سەد فلسی خستە سندوقەكەمانەوەو فەرمووی هەموو میوانەكان وێڕی منن و پارەیان لێوەر مەگرن.

٤

لە بەرزنجە بووین. ساڵ ساڵی (١٩٣٦) بوو. من لەپۆلی دووی سەرەتایی بووم. بەرزنجە جەمسەر(مەركەز)ی ناحیەی سرۆچكەو شوێنی مێژوویینی زۆر تێدایە. مزگەوتەكەی وەك جاری پێشوو وتم لەسەردەمی جووتە برای پیرۆز شێخ عیسی و شێخ موسێدا دروست كراوە كە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەكانی (٧٦٠ ك) بەرامبەر (١٣٥٩ ز).

منداڵبووم دەمبیست گوایە شێخ عیسی و شێخ موسیٰ لە (مەکە) دەبن بۆ حەجکردن، لەوێوە بەردێکی زۆر گەورە بە جووتە هەڵدەدەن، بەرد وەك باڵی لیٰ پەیدابێت دەفریٰ دێ لەم شوێنەی ئێستای مزگەوتەکەی بەرزنجە دەکەوێتەوە خوارەوە جووتە براش دوایدەکەون دێن لەوشوێنەدا نیشتەجیٰ دەبن و مزگەوتەکە دروست دەکەن. گوایە لەو ناوەدا (زنجێك) دەبێت مولکی حاجی شێخ خالیٰ – خالد دەبێت کە ئەویش پیاوێکی ئاینی و دەستڕۆیشتوو دەبێت لە سەردەمی خۆیدا، دەبیسیٰ کەوا دوو کەس هاتوون لەبەرزنجەکەی ئەودا مزگەوت دروست دەکەن خۆی لە دێی گێڵدەرەی خوار بەرزنجەوە نیشتەجیٰ بووە کە دەیان بینیٰ و سەیری ڕەوشتی بەرزیان دەکات، نەك هەر شوێنی مزگەوت و خانوو، بەڵکو کچەکەی خۆشی کە خاتوو فاتمەیە دەیدات بە شێخ موسیٰ کە منداڵی لیٰ نابیٰ لەدوای وەفاتی شێخ عیسای برای مارەی دەکات ئەو دوانزە کوڕی لێی دەبێت و بەهەموو وڵاتدا بڵاودەبنەوە. بێگومان فڕینی بەردەکەی مزگەوت ئەفسانەیە، بەڵام ناوی بەرزنجە لە دیٰ و ماڵەکانی (بەر –زنجەکەوە) هاتووە کە باسمان کرد.

بەرزنجە قەڵای سرۆچکی لێوە نزیکە کە نزیکەی (٢٦٠)ساڵ پێش ئێستا دروستکراوە بەسەر شاخێکەوە نزیك دێی (مۆریاس) دورستکردنی قەڵاو دیوارەکەی و هەڵکەندنی بیری ئاوەکەی هەموو لەلایەن (سەلیم بەگ— سەلیم پاشا)ی کوڕی (بەکر بەگی بابان)ەوە بووە، (بەکرە سور کە بەکرەجۆشی بەناوەوەیە) کە لە ساڵانی (١١٦٠– ١١٧١ کۆچی)دا لەو ناوەدا ئەو قەڵایەی بنیات ناوە، بۆ خۆڕاگرتن بەرامبەر بەهێرشی ( ئەحمەد پاشا)ی والی ئەوسای بەغداد.

هەروەها لەوناوەداو بەرامبەر بەرزنجە، لوتکە شاخێکی بەسام چووە بە ئاسماندا کە ئەویش لوتکەکەی (کورە کاژاو)ە.

لەبیرمە دانیشتوانی ئەوناوە موورییەکی پرشنگداریان دەهێنا بچووك بەقەد هەڵماتێك مانگەسەوە یان پیٰ دەوت، بەبڕوای ئەوان لەگەڵ بەفرا دەبارێت. گوایە

وەك ئەڵماس تیژەو شووشەش دەبڕێتەوە. من ئەوسا کە عەقڵم بەوە نەدەشکا تاقی بکەمەوە نازانم شتەکە ڕاستبوو یان نا، وە ئایا ئێستاش ئەوە ماوە؟!

کەچوومە بەرزنجە زێوەر ئەفەندی (مەلا عەبدوڵا)ی خوالێخۆشبوو بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی بەرزنجە بوو، کە تەنها چوار پۆلی هەبوو. یەکەم ڕۆژ کە لەگەڵ منداڵە وردەکان چووم بۆلای قوتابخانەکەوە، مامۆستا زێوەر بانگی کردم لێی پرسیم..

— تۆ کێی؟

دوای وەڵامم وتی:

— شاگردی؟

منیش بەشاگرد نانەواو شاگرد قەساب تێگەیشتم وتم:

— نەخێر.

بۆ ڕۆژی دواتر کە باوکم بردمی بۆ (تسجیل) وتی:

— ئەی بۆچی دوێنێ وتت من شاگرد نیم؟

وتم:

— ئەفەنی تێنەگەیشتم.

من لەگەڵ (عەلی کوڕی شێخ عەبدولی سەرکان)دا پێکەوە دادەنیشتین و لەسەر (رحلە)یەك، دیتە تۆزێك خۆم خەریك دەکرد، زێوەرە فەنی زۆری خۆشدەویستم. مامۆستایەکی ترمان بۆ هات ناوی (مەجید ئەفەندی)بوو لاموایە برازای مەلای گەورەی کۆیە بوو، لەبەر بێ دەرلەمەتی و دەستکورتی میریی، یاسای زەیل (ذیل قانون) یان دامێنا، بەداخەوە مەجید ئەفەنی زوو بەر (ذیل) کەوت و گەڕایەوە. لەدوایدا (مظفر) برازای (ڕەشید مەستی)و برای (بهادری ئەفسەر)یان هێنا ئەو بە مەعاشی ڕۆژانە، دوای تەواوبوونی ساڵ ئەویش نەهاتەوە، چووە دانشگای (حربیە)و بوویە ئەفسەر.

بەهیمەتی زێوەر ئەفەندی قوتابخانەی (زانستی شەو) لە بەرزنجەدا کرایەوە، خەڵکی زۆرهانی خەڵکەکەی دەدا کە بخوێنن. لەڕاستیشدا ژمارەیەکی باش کۆبوونەوەو دەهاتن بۆ زانستی. زێوەر ئەفەندیش ئەم شیعرەی بۆ ڕێکخستن و کردی بە گۆرانی:

ئەهلی دێی بەرزنجە ئێوە هەموو

دەوەرنە پێشێ یەك یەك ڕوو بەڕوو

بزانن خوێندن چ جەوهەرێکە

هەر حەرفی بەقەد دانە دوڕێکە

لە سایەی مەکتەبی شەو، دێکەمان

بووە بە منبعی عیلم و عیرفان

دیسانەوە ئەم هەڵبەستەشی هەر بەسەر بەرزنجەدا هەڵداو پێی ڕەوان کردین کە دەڵێت:

خاکی بەرزنجە چەندە دلگیرە

جێگەی( قوتب و ئەولیاو پیرە)

ڕەبی ئەم جێگە خۆشە ئاوابێ

مەنبەعی عیلم و فەیزی مەولابێ

شاخەکانی بەرلمبەرو خەشنۆ

خۆشترن سەدجار لە لاهیجان و شنۆ

وەتەنێکی عەزیزە بۆ من و تۆ

مەسکەنی کوردە ڕەببی ئاوابێ

کوڕەکاژاوو شاخی ماياوە

سەیری دەشتی هەموو جەلای چاوە

جەننەتە خوا بەئێمەی داوە

وەتەنم خۆشەویستە، ئاوابێ
زەردەی ڕۆژئەدا لەسەر شاخی
سوور، ئەبێ بەفری وەك گوڵی باخی
سپی و زەردو سوورە بەیدلخی
ڕەببی ئەم جێگە خۆشە ئاوابێ
مەنزەرەی بارەشی بەهارانی
هاژەی ئاوی بەفری شاخانی
شاخی ئەکەم بە قوربانی
ڕەببی ئەم خاکە پاکە ئاوابێ

بێگومان مەبەستی لە (قوتب و ئەولیاو پیر) شێخ عیسێ و شێخ موسێ و کوڕو کوڕەزاو وەچەیانە کە زۆریان پیاوی ئاینی بەرزو زانای دین، خاوەنی کردەوەو ڕەفتاری پەسەند بوون. ئینجا مەبەستی لەو دیمەنە جوانانەی چیاکانی (کوڕە کاژاوو ماباوا) کە لە هەموو وەرزێکدا ئەوەندە جوان و ڕەنگین بوون پیاو لە تەماشاکردنیان تێری نەدەخوارد.

مامۆستا زێوەری خوالێخۆشبوو ئەم شتانەی پێڕەوان دەکردین، بەڵام زۆری بۆ دەکردین بە(شیعر)و لە شێوەی هەڵبەستدا پێی ڕەوان دەکردین. لە بابەت سنوری عێراقەوە ئەمەی پێ دەوتین:

سنوری عێراق، شەرقی ئێرانە
غەربی سوریە، هەر بیابانە
هەموو شیمالی هی تورکیایە
شیمال شەرقی ئێرانی تیایە
جنوبی خلیج، ئەمارەتی کوێت

سەحرای(نەجد)یشە، مەعلووم ببێ لێت

لە بابەت رووباری دیجلەو فوراتیشەوە ئەمەی پێ لەبەر دەکردین:

ئەهری ناو عێراق دیجلەو فوراتن

ئەلێی کەوسەرو ئاوی حەیاتن

خێرو نەفعیان ناکرێ ژمارە

دروستە بڵێی قەترەی دینارە

تێکەڵاو ئەبن لای قوڕنە هەردوو

ئەمجا گوم ئەکەن ناوەکەی پێشوو

بە (شەت ئەلعەرەب) شوهرەت وەرئەگرێ

بە هەموو نەوعێ ئاوی لێئەبڕێ

بەلیوای موصڵا دێتە وڵاتمان

سەرچاوەی دیجلە خواری گۆلی وان

فورات لەناو تورك دێتە سوریە

لە(درێز) بۆ عێراق وەستانی نییە

هەر وەك عاشقی مەجنون و موشتاق

هەردووکیان خۆیان ئەکوتن بۆ عێراق

بەڵام لە هەمووی خۆشتر باسی (لیوا)کانی ئەوسای عێراقە کە بەم هەڵبەستە ڕەنگینە باسیان دەکات، جا هەر بۆ مێژوو باسی دەکەم، جارێك منی هەڵسان لەوانەی جوغرافیا (کە دەرسی پۆلی دووش نەبوو، بەڵکو هی بەرەو ژوورتر، بەڵام چونکە قوتابخانەکە تەنها دوو ژووری هەبوو، یەکێکیان تەنها بۆ پۆلی یەکەم بوو، ژوورەکەی تر بۆ پۆلی دوو، سێ و چواریبوو، هەرئەوەبوو، ڕیزەکانمان جیاواز بوو، لەبەرئەوە هەرچییەکی بە قوتابییەکان بوتایە ئەوانی تریش ڕەولنیان دەکرد) چونکە

قوتابیەکی پۆلی چواری هەستان نەیزانی، منی هەڵسان گوایە من دەیزانم منیش یەکسەر وتم:

بە سێ مەنتیقە عێراق بەشکرا
شیمال و وەسەت، جنوب ناوبرا
هەموو شارێکی پێی ئەڵێن لیوا
هەژدە لیوایە بیزانە هەروا

دوای ئەوە هەر لەسەری ڕۆیشتم:

چوار لەم شارانە کەوتوونە شیمال
سلێمانی و کەرکوکی خۆشحاڵ
هەولێرو موسڵ شاری مەشهورن
بە زەراعەت و سەنعەت مەسرورن
مەنتیقەی وەسەت هەموو شەش شارە
یەکێ بەغدایە ئەڵێی گوڵزارە
دیالی و دلیم حلەو کەربەلا
شاری کوتیشە، دوورن لە بەلا
مەنتیقەی جنوب، ئەویش چوار شارە
شاری بەسرایە لەگەڵ عەمارە
سێیەم مونتەفیك چوارەم دیوانی
لازمە ناوی هەمووی بزانێ
لیوای دیالی شاری بەعقوبە
مەرکەزێکی زۆر جوان و مەحبوبە
لیواکەی دلێم شاری ڕومادی
بۆتە مەرکەزی لە دەشت و وادی

لیوای مونتەفیك ناصریەیە
شارێکی جوان و بە قاعیدەیە

کە لێبوومەوە، وتی:

—— کوا ئەوانی تر؟

وتم:

—— چی مامۆستا؟

وتی:

—— چوار لیواکەی تر.

وتم:

—— هەر ئەوەندەیە تەواو.

وتی:

—— تۆ وتت هەژدە لیوایە بیزانە هەروا.

دە ئەوە کاتی خۆی تەتەڵەی زمانی قوتابییەك بوو، ئێستا وا هاتەدی و بوویە (حەقیقەت).

# ئاورێك لە بارودۆخی ئەوسای وڵات

# وێنەیەك لە ژیانی ڕابردووی بەرزنجە

١

لەبیرمە ئۆتۆمۆبێلێك ڕووی بکردایە بەرزنجە، ئیتر ئەوە دەبوو بە ڕووداوێکی گەورەو دەبوو بە مێژوو لە ژیانی دێیەکەدا. بەدەیەها کەس لەو ئۆتۆمبیلەو لە سوارەکانی کۆدەبوونەوە بۆ بینین و دەنگوباسی ئەو ڕۆژانە ڕۆژی قەتارچی و کاروانچی بوو پیاوێکی زرنگ و زیرەك هەبوو (قادری پورە گوڵەباخ) کە بە (قالە گوڵەباخ) ناوی دەرکردبوو ئەمە عەسکەری تەواوکردبوو، لەوێ کوێرە خەتێکی پەیداکردبوو دوو ئێستری باشی هەبوو، ئەمانە (سوپر)و (مرسیدس)ی بەرزنجە بوون.

نەخێر پۆستەو ڕۆژنامەو تەلەفۆن و عەتارو بازرگانی دێیەکە بوون خاوەنەکەیان بەحوکمی ئیشەکەی گەڕەك و زۆربەی ماڵەکانی ئەوسای سلێمانی شارەزابوو، ئیتر کە ئەچوو بۆ شار، هەزارو یەك شت ڕادەسپێرا، ئەویش بێئەوەی یەکێکی لەبیربچێت، هەموو ڕاسپاردەکانی دەگەیان و کە دەگەڕایەوە شتەکان یاخود وەڵامەکانی دەهێنایەوە، بۆیە ئیشەکەی ئەو ڕۆژەی ئەو بەلای خەڵکەوە لە (کۆمپیوتەر) گرنگتربوو، چونکە دەبووایە یەك شتی لەبیرنەچووایە، ئەگینا تانەو تەشەری دنیا ڕووی تێدەکرد، لەم ئەرکە قورسەش شتێکی ئەوتۆی دەست نەدەکەوت، تەنها ئەگەر باری ببردایە یا بیهێنایە، لەوە کرێی خۆی وەردەگرت، بەڵام ماڵە مووچەخۆرەکانی میریی (کە ئەوسا مانگانەی ئەوان لەچاو دەستکەوتی خەڵکی ترا زۆر زۆربوو) یارمەتیان دەداو دریغیان لێنەدەکرد.

جارێك لەگەڵ مامەكان و ئامۆزاكان و باقی خزمەكانما كە هاتبوون بۆ سەردانمان بۆ بەرزنجە، بە كاروان گەڕانەوە بۆ سلێمانی و منیش لەگەڵیان چوومەوە، نزیكەی دە ولاخ بە هێسترو گوێدرێژەوە، بەسەركردەیی (قالە گوڵباخ) لە ڕێی (وێڵە)و (وەڵانە)و چایخانەكەی ئەوسای گوێژەو لەوێوە ڕێگاكە دەهاتە خوارەوە بۆ ناو شاری سلێمانی، من سواری كەرێكی زیتەڵەی خۆشڕەویان كردبووم، هەر تۆزێك لەقەم لێدایە، یا بە (نەقیزە) تۆزێكم (تێوەژەنایە)، ئیتر دەستی دەكرد بەغار، منیش دەچوومە بندەستی خزمەكانمەوە، كە هەریەكە سواری(بارگە)ی ئێسترێك كرابوون كە هەندێكیان ژێر بارگەكەیان (باوڵ) بوو، هەر ئەوەندە بەدارەكەی دەستم بمكێشایە بە باوەڵەكانا ئیتر پیرە ئێستر بەلەسە دەبوو. خاوەنەكەی هەڵدەگرت هەتا ماندوو نەبووایە، یا قالە گوڵەباخ دەنگی لێنەكردایە، نەدەوەستایەوە، بەم بەزموڕەزم و پێكەنینە لە بەیانیەوە لە بەرزنجە كەوتینە ڕێ ئێوارەی دەمەوتاریكی خۆمان كرد بەشارا، دوای ئەوەی لە دوو سێ جێگا لاماندا بۆ حەوانەوەو تەزووی قاچوقوول دەرچوون و خواردنی (تێشوو)ی ڕێ لە خورمای ئەشەرەسی و كورد كوژەو هێلكەی كوڵاو.

لەبیرمە:

لە بەرزنجە دراوسێیەكمان هەبوو بێوەژن بوو دوو كوڕیشی هەبوو، (زیە بێوە)یان پێدەوت، هەرچی دەستكەوت هەیە لە ماڵی دنیادا نەیانبوو، ڕەزە قرپۆكێك نەبێ، كە ترێیەكەی ساڵی بیست باری لێ نەدەهاتە بەرهەم، هەر نازانم بەچی بەڕێوە دەچوون، بێگومان خوا ئێمەی بۆ ڕەخساندبوون كە یارمەتی زۆرمان دەدان، بەڵام خۆ ئێمە لە ساڵێك شتێ زیاتر لەوێ نەماینەوە، ئەی دوای ئەوە؟ دە لەگەڵ ئەو دەستكورتی و نەبوونیەشدا، ئەو ژنە ڕۆژێك لە ڕۆژان سكاڵایەكی نەكردەوەو ناڕەزاییەكی پیشان نەدەدا، بە پێچەوانەوە ئافرەتێكی ئەوەندە گاڵتەچیش بوو هەرگیز لە سوحبەت و قسەی خۆش و (یاریكردن لەگەڵ مندا) نەدەكەوت.

باجی زیـە چوار پێنج سـەر ئـاژەڵی هـەبوو لەگـەڵ كەرێكدا. هـەر لـە پـایزەوە مشووری (كەما)ی دەخوارد بۆ ئاژەڵەكان، چونكە ئەوەی تەواودەكرد، واتا بەسواری كەرەكە دەچوو بۆ(شاخی كوڕەكاژاو)ی بەرامبەر بەرزنجە بـۆ (كـەما)كردن، زۆرجـار منیش لە گەڵیا دەچووم، بە هـەردووكمان كەرەكـەمان باردەكرد، لـەو سـەرەوە مـن سواردەبووم لەسەر كەماكەوەو ئەو بەپێ دەگەڕاینەوە، ئینجا دەكەوتە مشوری دارو گەڵای دار بۆ سوتاندنی لە زستانداو گەڵاكـەش بـۆ خـواردنی ئـاژەڵ و لقـەكانیش بـۆ سـوتاندن و خۆگەرمكردنـەوە. لـە ڕەزەكـەش چـی خـوا بیدایـە لـە دۆشـاوی تـرێ ڕەشـكەو مێـوژ جـار جـاریش (باسـوق)و (سـجوق) ئەگـەر سـاڵەكەی هـات بووایـە، ئەمانەی لە هاویندا ئامادە دەكرد بـۆ زسـتان، بـاجی زیـە خوشـكێكی هـەبوو ئـەوان حاڵیان خۆشبوو، بەڵام هەرگیز یارمەتییەكی ئـەو تـۆی نـەدەدان كـە جێگـا بگرێـت، وابزانم باجی زیەش خۆی ڕێگای ئەواتی نەدەدا كە دەستی یارمەتی بـۆ درێـژ بكـەن، چـونكە ئـافرەتێكی بەكەرامـەت و لووتبـەرز بـوو لـەو ڕووەوە، دە هـەر ئـەم بـاجی زیەیەش ئـافرەتێكی پاكوتـەمیزو ڕێكوپێـك لـە ماڵدا، خانووەكـەی هـەموو سـاڵ بـە (هێڵەساو) سـپی دەكـردەوە، دوای ئـەوەی (كـەنوو)ەكانی پڕدەكـرد لـە زەخـیرەی زستان، وەك ساوەرو مێووژ، سەرو بەری دەگرتن، لە زستانا دەیكردنـەوە، هەمیـشە ماڵەكەی پاك وجوان، خۆی بەو بێوەژنیە هەمیـشە ڕێـك و پـاك و بـەو جلـە شـڕانەوە هـەر ورشـەی دەهـات، چـەند كـەس داوایكـرد، شـووی بەكـەس نـەكرد، بەسـەر مناڵەكانیەوە بـە حـەیاو حورمەتـەوە دانیـشتبوو، هـیچ پیـاوێكی بەرامبـەر بـە خـۆی بەشت نەدەزانی.

شەو لەماڵی خۆمان كە دەنووستم، باجی زیەم لە تەنیشتەوە ڕانەكشایەو دەستم نەخستایە باخەڵیەوەو حەكایەتی بۆ نەكردمایە خەوم لێنەدەكەوت، بەڕاستی ئەویش مەیلێكی ئەوتۆی دابوو بە من، هەردوو كوڕەكەی لەلایەك و من لەلایەك.

زۆر مرۆی وام تاقیکردۆتەوە لە ژیانما، راستی و دڵسۆزی و پاکی زیاتر لەو جۆرە کەسانە دەوەشێتەوە، بۆیە کە باوکم لە بەرزنجەوە گوێزرایەوە بۆ عەربەت، باجی زیە دەستیکرد بە گریان و ئەو چەند رۆژەی پێش رۆیشتنمان دەتوت تەعزییەتی، شەو نەبوو کە دەهاتە باخەڵمەوەو دەبینوانم فرمێسکی نەکەوێتە سەر دەموچاوم منیش لەتاوا دەستم دەکرد بە گریان تا دایکم دەهات هەردووکمانی ژیردەکردەوە.

دوای ئەوەی گواستمانەوە بۆ عەربەت، لەوێش چەند جارێك هات سەری لێداین و هەرکە دەگەڕایەوە بەجلوبەرگ بۆ خۆی و منداڵەکانی و زەخیرەو پارەیەکی باشەوە دەرۆیشتەوە.

لە بیرمە:

لە بەرزنجەدا لە سەرەتاوە چایخانەیەك هەبوو، لەدواییدا بوویە دووان، هەردووکیان لە تەختاییەکەی ناو دێ و پشت مزگەوت و کانی ژنان بوون. چایەك بە دوو فلس، جار جار بە فلسێکیش دەدرا، چونکە ئەوسا کەلە شەکر بە(٣٧) فلس واتا (نیو روپیە)بوو، ئەم شەکرە وردەی ئێستا نەبوو. لە چایخانەکاندا تاوڵەو دۆمینە هەبوو، جارجاریش بەدزییەوە یاری کاغەز دەکرا، هەموو یاریەك هەر لە سەر چای براوەو دۆڕاوی هەردوولا، یاخود ئەگەر نوسەری خاڵەکانیش بووایە پارەی چای ئەویش لەلایەن دۆڕاوەوە دەدرا. ئەمە هەموو رابواردنی خەڵکەکە بوو. لەبیرمە شاییەکیش کرا، (کارمەندێکی حکومەت) ژنی هێنا، شایی بەرزنجە وەك هی زۆر شوێنانی تری کوردستان نەبوو، کە رەشبەڵەك بێت، واتا ژن و پیاو تێکەڵاو پێکەوە هەڵپەڕن، بەڵکو ژن بەجیاو پیاو بەجیا، تاکو هەندێك لە پیاوە ئاینییەکان ئەوەشیان لا حەرام بوو، لەبەر حورمەتی شێخ عیساو شێخ موسا، بەڵام هەندێکی تر وەڵامیان دەدانەوە (کەوا شێخ عیساو شێخ موسا حەز دەکەن میللەتەکەیان لە کەیف و خۆشیا بێت، ئەوان ئێستا پیرۆزبایی لە بووك و زاوا ئەکەن...) ئافرەت کە خۆیان

دەرلزانەوە، بەڕاستی هی وایان تێدابوو پیاو دڵی نەدەهات سەیریان بکات! ئەوەندە جوان بوون (ڕەعنا)یەکی تیابوو، ئافرەتێکی هێجگار بالابەرزی قەڵەم ڕێك و چاو گەورە گەورەو گەنم ڕەنگ، مێخەکبەندی دەکردە مل، بۆنی تەواو خۆش دەکرد، دەموچاوی بە (دیمە شۆڕە) دەشت، لە باتی ئارایشتی ئەم سەردەمە، سپی دەکردەو، (کەمەرەی) زیوی دەبەست بە (هەیاسەوە)، سەرێکی خانمانەی جوانیشی دەبەست و هەندێك پلپلەی زیوی پیا شۆڕ دەبۆوە، پێڵاوەکەشی (کەوش)بوو.

لە هەڵپەڕکێدا ئافرەت سەریان هەڵنەدەبڕی و هەر چاویان دەبڕیە زەویەکەی بەردەمیان، جگەلەوەی هەڵپەڕکێیەکە زۆر سست بوو، هیچ جووڵەیەکی ئەوتۆی تێدا نەبوو کە گیانێك بکات بە بەر خاوەنەکانیانا، ئەمەیش هەموو لەبەر قسەو تانەوتەشەر نەوەك ئافرەتێك چاو هەڵبڕێ و بڵێن (چاو بەلە)و چاو لەدەرەوەیە، یاخود ئەگەر بە تەوژم هەڵپەڕی بڵێن ئالۆشاوییەو وایەو وایە... لەبەرئەوە ئەو بەستەزمانانە وەك بووکی دەستکرد چۆنت بوێ وای هەڵپەڕێنی بەو جۆرە بوون. بەپێچەوانەی ئەوانەوە کوڕگەل کە هەڵدەپەڕین قریوەیان دەگەیشتە ئاسمان.

لەبیرمە:

ئەوسا ڕێگای ئۆتۆمبیل ساز نەبوو، هێجگار کە باران بباریایە ئیتر ڕێگای بەرزنجە دەگیرا، چونکە قیرتاو نەبوو، بەتایبەتی دەشتی (زەڵێ) کە لەزستاندا وەك دەیان وت (گا) قووت دەدات. دەیان وت:" شۆفێرێکی نەشارەزا لە زستاندا بەرەو بەرزنجە باری هێنابوو لە دەشتی زەڵێی خوار بەرزنجەوە ئەو چەقینەی چەقی تا هاوین نەیانتوانی دەری بهێننەوە". ئەوسا وەك ئێستا تراکتۆر یاخود مەکینەی تر نەبوو کە ئۆتۆمبیل بچەقێت یا ڕاوەستێ گورج دەری بێنێ یاخود ڕایکێشێت، بۆیە ئۆتۆمۆبیلی بچووك کە ئەوسا (قەمەرە) یان پێ دەوت، وەك قەمەرەکەی (غەفورە ڕەشی هندی)، ئەگەر بهاتایە بۆ بەرزنجە زنجیری بە تایەکانیەوە دەبەست،

جگەلەوەی پۆلیسیش دەچوون، ئەگەر بچەقیایە دەنگی دانیشتوانی دێهاتەکانی ئەو ناوەیان دەدا. ئەوان دەچوون دەریان دەهێنا.

## شایی و بەزمی ئەو ڕۆژگارەی بەرزنجە

ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان بەتایبەتی سەربازەکان (کوڕانی حکومەت) کە ئەوان خۆیان لە خەڵکەکەی تر بە زیاتر دادەنا، هەی وا هەبوو بە سەعات و دوو سەعات دەستی بەر نەدەدا، ئارەقی ڕەش و شینی دەڕشت بێ سوود بوو، مەگەر کابرای شایەر وازی بهێنایە ئەگینا ئەوان هەر وازیان نەدەهێنا، ئەوان حەزیان لە شتێکی تریش دەکرد، کابرای شایەر کە شاییەکەی دەگێڕا، هەموو دەستکەوتی ئەو (شاباشەکە) بوو، کە شاباشی کوڕی حکومەت دەکرا، مەعاشی ئەو چەند مانگەی کە کۆی کردبۆوە، کە هەمووی دوو یاخود سێ دیناری ئەوسای نەدەگرتەوە، ئەو دوو سێ دینارەی لەبەرچاوی خەڵکەکەو بۆ فیز دەدا بە کاکی شایەرو لەدواییدا کە شایی تەواوبوو دەچوو هەمووی لێوەردەگرتەوە، خۆ ئەگەر پەنجا یاخود سەد فلسی لەوە بدایەتێ ئەوە زۆر زۆربوو، شایەرەکەش گەلێک مەمنون و منەتبار دەبوو.

ئیتر هەرچۆنێک بووایە شایی ڕێگای هەناسەدان و یەکتری بینین و جارویار بزەو زەردەخەنەیەک بوو لە بەینی کچ و کوڕا، هەرچەندە کچ و کوڕی لادێی ئێمە هەمیشە تێکەڵاون لە ئیشکردن و تووچینی و درەوو گێرەو کێشەداو هیچ ڕۆژێک لە ڕۆژانی لای خۆماندا کچی لادێ واتا ژن لەدەرەوە عەباو پەچەو چارشێوی نەپۆشیووە، بەڵام هەرگیز سەریشیان ڕووت نەبووە، هەر نەبێ بەسەرپۆشێک یاخود لەچکێک قژیان شاردۆتەوە، بەڵام هەموو کاتێک ڕوویان بە دەرەوە بووەو جگەلەوەی کراس و دەرپێی و ئافرەتی کورد ئاوداماتن، هەمیشە هەموو لەشیان دەشارێتەوە.

لەبیرمە:

هەر لە ناوچەی (سرۆچك)دا کە ناوی ناحیەکەیەو بەرزنجە مەرکەزی بوو، قەڵای سرۆچك هەیە، ئەو قەڵایە بە قوتکەیەك لە قوتکەکانی شاخی کوڕەکازاوەوەیە هەر ئەم بیست دەیان وت:" ئەو قەڵایە پاشای بابان دروستی کردووە، ئێستا بۆم دەرکەوتووە ئەو پاشایەی ئەو قەڵایەی دروست کردووە (سەلیم بەگی بابان)ە کە لە دەورو پشتی ساڵی (١١٦٠ك)بەرامبەر (١٧٤٧)ز دروستی کردو خۆی و سوپاکەی لەوێدا حەشاردا تاوەکو لەدەست لەشکری بەغدا ڕزگاری بێت، ئەوەبوو شەڕەکەی بەینیان لەدواییدا بە ڕێککەوتن و ئاشتبوونەوە کۆتایی هات: ئەو سەلیم بەگە کوڕی بەکر بەگە، یاخود بەکرە سووری بابان کە جۆگەی بەکرە جۆی نزیك سلێمانی و (گردی بەکراوا)ی نزیك هەڵەبجەی بە ناوەوەیە.

دێهاتە گەورەکانی ئەو ناوچەیە، جگە لە بەرزنجە خۆی، دێهاتی گلێدەرە کە لەوەپێش ئەوێ مەرکەزی ناحیە بوو (مورياس، حاجی مامەند، وەندەرێنە، شوکێ، باراو...) بوون.

٢

لەبیرمە:

بەرزنجەیی زۆر زیرەك و قسە نەستەق بوون، لەبەرئەوەی کە پیاوە کۆنەکانیان فریای خوێندن و فێربوون نەکەوتن، زۆر هەوڵیان دەدا کە کوڕەکانیان وانەبن، بۆیە هەر تێکۆشان تاکو پلەی قوتابخانەکەی بەرزنجەیان گەیاندە ڕادەی (سەرەتایی- إبتدائی)و هەر شەش پۆلەکەی تێدا کرایەوە، کە کوڕەکانیان ئەوێیان تەواو دەکردو لەبەرئەوەی توانای پارە تیاخەرجکردنیان نەبوو کە بیان نێرنە شوێنێکی وەك سلێمانی کە (ناوەندی و ئامادەیی... ) تەواو بکەن، ئەو سەردەمەش لەبەغدا (دار المعلمین الريفيه) هەبوو، کە قوتابی لە شەشی سەرەتاییەوە وەردەگرت، شەش ساڵ لەوێ دەیان خوێند، دەردەچوون و دەکران بە مامۆستا لە لادێکاندا، ئەو

دەزگایە (دلخلی) بوو، میری هەموو خەرجییەکی گرتبووە ئەستۆ، بەوجۆرە ژمارەیەکی باش لە گەنجەکانی بەرزنجە لەوێ دەرچوون و هاتنەوە دێیەکەی خۆیان و دێهاتی تر دەستیان کرد بەخزمەت، جگەلەوە زۆریان لەسەر خوێندن سووربوون، خوێندنی بەرزیان تەواو دەکرد، بەمجۆرە وەك وتمان پیاوی زۆری تێدا پێگەیشت پیاوی ئەدەبی و زانستی ئەوتۆ کە شایانی شانازین، دە ئەگەر ئەمە لەگەڵ شارەزووردا بەراورد بکەیت سەیر دەکەیت دێهاتی ناوچەی شارەزوور دە یەکی بەرزنجە یاخود دێهاتەکانی قەرەداخ و هەورامانیان لە خوێندندا پێ نەگەیاندووە، ئەمەش بەلای منەوە بەهۆی ئەوەوەبوو کە لە ناوچەی شارەزوورو باقی شوێنە تەختاییەکانی تردا ماوەی کشتوکاڵ زیاتر بوو، دانیشتوانی ئەو ناوچانە منداڵەکانیان بە کشتسازییەوە خەریك دەکرد، بۆئەوەی شتێکیان زیاتر بۆ پەیدا بکەن، بەڵام ناوچە شاخاوییەکان ئەو ماوەیەیان بەو فراوانیە لەبەردەمدا نەبوو کە ئیش بکەن و بەرهەم وەدەست بهێنن، مانگانەی مووچەخۆری ئەو سەردەمەش مفت بوو.

یەکێك هەر قوتابخانەیەکی تەواو بکردایەو لەدایەرەیەکی میریدا دامەزرایەو(مانگی شەش دیناریشی وەربگرتایە لە سەرەتاوە) ئەوە پاشایەتی بوو.

دەچوویتە کەبابخانە دوو کەبابی گۆشتی مەڕو ترشیاتێك و ماستاوێك و لەواشەیەکی گەرم و لەدواییدا چایەکیشت دەکرد بەسەرا، خۆ ئەگەر تێرت نەخواردایە کەبابێکی تریشت داوا بکردایە، هەموو پارەکەی چوارده فلسی نەدەگرتەوە، شەربەتی مێوژی خەست و خۆڵ خوورەی نەدەهات لای (ئەلە سنەیی) لە سلێمانی بە دوو فلس بوو، نان و ماستاوێك بە (عانە) یەك بوو، ئۆتۆمۆبیلێکی تایبەتیت بەکرێ دەگرت لە سلێمانییەوە دەیبردی بۆ بەرزنجە ئەو پەڕەکەی دینارێکی دەسەند ئەویش لەبەرئەوەی ڕێگاکەی شاخاوی بوو. ژنێکت بهێنایە زۆر زۆر دە دیناری تێ نەدەچوو ئەم باروبۆخە تا ساڵەکانی چل وابوو، بەڵام دوای ئەوە بەتایبەتی کە شەڕی دووهەمی گێتی هەڵگیرسا، نرخی شتومەك زیادی کرد، یاخود

هەندێك شت دەست نەدەكەوت لەبەرئەوە (تەموین– تموین) داهات، واتا حكومەت دەستی گرت بەسەر زۆرشتداو ئەو بەنرخی دابڕاو كەم دەیدا بە خەڵك، بەڵام لەوەشدا دزی و پاشقوڵلێگرتن و بازاڕی ڕەش هاتە پێشەوە، قاچاخچێتی دەستی پێكرد، چاپ و گوپی كاربەدەستانی میری لە بێ ویژدانەكان، ئەوانە خەڵكەكەیان سەغڵەت دەكرد، بەتایبەتی چینی هەژارو جوتیار، كە ئەمەش نووسینێكی تایبەتی دوورودرێژی پێویستە، كە چۆنیەتی ژیانی كولەمەرگانەی هەژاری شارو لادێ لە ڕۆژە ڕەشەكانی شەڕدا ڕوون بكاتەوە،

بەڵام دوای تەواوبوونی شەڕ لەساڵی (١٩٤٥)دا ئیتر وردە وردە باری ژیانی ئابووری دەقی گرت و خەڵك كەوتنەوە ژیانی ئاسایی، بۆ نموونە من خۆم ساڵی (١٩٥٠)كە حقوقم تەواوكردو بە بەڕێوەبەری ناحیە دامەزرام، مانگانەكەم (١٨)دینار بوو، (٩) دیناریش (غلاو المعیشە)ی دەچووە سەر، هەمووی كردیە (٢٧) دینار، بەو پارەیە شاهانە ڕام دەبواردو لەدواییدا كە ژنیشم هێنا ماڵ و منداڵیشم پێ بەخێو دەكردو لەهەر ناحیەیەكیش بوومایە دیوەخانمان لێ ڕادەكێشا. میری بۆ خەرجی دیوەخان مانگی پێنج دیناری دەداینێ، ئەمە (مخصصات الضیافە)یان پێ دەوت.

ئەمانەم بۆیە هێنایە ئاراوە بۆئەوەی چمكێك لە بارودۆخی ئابووری ئەو ڕۆژانە ڕوون بكەمەوە.

لەبیرمە:

بەرزنجەیی قسەكەرو گاڵتەچی و وریا بوون، قسەخۆشی وایان تێدابوو هەرگیز لەقسەكانی تێرنەدەبوویت، (عەبە جەردە)یەكی لێبوو باوكی قالەی هاوڕێم كە لە مەوپێش باسم كرد ئەم پیاوە هەرچەندە كەمێك لە تەمەنابوو لەبەر جگەرەكێشانیش تەمی كۆكەی نەدەڕەویەوە، بەڵام (حەكایەتخوان)ێك بوو بێ وێنە، حەكایەتی (مەلیك ئەرسەلان كوڕی مەلیك شاهی ڕۆمی)، بۆ دەگێڕاینەوە، ئەمەندە خۆشی دەكردو لێی دەهات، هەموو گوێ قوڵاغ دەبووین، یەك لەسەریەك چامان بۆ دەهێناو

جگەرەمان بۆ دادەگیرسان، بەلآم کە کۆکە دوابراوەکە دەیگرت، شین و مۆر دەبۆوە، دەمانوت ئێستا دەخنکێ کەچی وازیشی لەجگەرەی ناخێر هەر نەدەهێنا.

تومەز ئەم مەلیك ئەرسەلانە (الب ارسلان)ی سەلجوقییە کە لە(١٠٣٢ ز) حوکمی بەشێك لە ئێران و بەشێکی ولآتانی ترو گوایە گەیشتوتە کوردستانیش حوکمی کردووە.

بەرزنجەیی هەر لە زیرەکیا ناوی سەیریان لەیەك دەنا، (ئەراشی مودیر ناحیە) ناوی (کەریمە کەڵە)بوو، خوا لێیخۆش بێت پیاوێکی کارامەو کەڵەگەت و کەمدوو بوو، لام وایە (کەڵە)کەش لەوانەوە هاتبوو. یەکێك لە مودیر ناحیەکانیان ناونابوو (گازەرد) بەوەدا کە قاپوتێکی زەردی هەبوو، زستانان لەبەری دەکرد. کوڕێکی هاوڕێمان لە قوتابخانەدا، چونکە چاوەکانی تۆزێك زەق بوون، ناویان نابوو (زەقۆڵی)، ئیتر هەیانبوو (شیرە سنگ تووکن)، (برنە... تیسکن). وە دەیەها (لقب) تری لەم بابەتە.

ئەمە بوو نۆخی ژیانی ئەو ڕۆژانەی بەرزنجە کە وەك وتمان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٣٦)، هەر ئەوانە بوون کە لە بیرم مابوون، لام وایە بەو گێڕانەوە ساکارانەیە خوێنەری بەڕێز بتوانێ شتێك لەو نووسینەوە بەرهەم بێنێت و (استنتاج) بکات، منیش ئەوەی دیومە بێ زیادو کەم گێڕاومەتەوە لە بابەت ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕابواردنی خەڵکی بەرزنجەی ئەوساوە.

خوا بیکات لە بەشی دووەمدا ژیانی ئاینی باس دەکەم، بەتایبەتی باسی ئەو دوو شێخە گەورەیەی مەرقەدی پیرۆزیان لە ژوور دێیەکەوە بوو، کە لەمەوپێش پەنجەمان بۆ ڕاکێشان، بەلآم ئەم جارە زیاتر لە خۆیان و لە ئەوەو نەتەوەیان دەدوێین، کە زۆربەیان پیاوی ئاینی و زانستی گەورەو بەڕێز بوون لە هەموو کوردستاندا بگرە لە دەرەوەشیدا.

لێکدانەوەی هەندێك ناو و وشە کە لەم بەشەدا هاتوون:—

- بەرزنجە:

دەكەوتە ڕۆژهەڵاتی خوارووی سلێمانی، سێ سەد ماڵ زیاتر دەبوو، بەرامبەر شاخی كورەكاژاو مەركەزی ناحیەی سرۆچك بوو، سەربە قەزای شارباژێر لە لیوا(محافظە)ی سلێمانی. بەهۆی مەرقەدی جووت برا شێخ عیساو شێخ موسا، دێیەكەش بە شوێنێكی پیرۆز دادەنرێ.

- قۆچەقانی:- بریتیبوو لە دوو دەسكی درێژ بەم سەرەوسەری خلخلۆكەیەكی بچووكەوە كە هەموو لە خوری و بەزۆری لە موو دروست دەكرا. بۆ بەردهاویشتن. ئەم سەرو ئەوسەری دەستكەكانی قوڵفیان تێدابوو لە پەنجەی دەست هەڵدەكێشران. بەردێك دەخرایە ناوەڕاستی و خاوەنەكەی دەسكەكانی تا دەتوانی بەهێزو خێرا بەدەوری خۆیا سووڕدەدا، لەدواییدا بەرەو نیشانگە (هدف) قوڵفێكیانی بەرەڵلا دەكرد، بەردەكەش زۆر بەتیژی و بەهێزەوە دەڕۆیشت، ئەگەر بەر نیشانەكە بكەوتایە دەیشكاند یاخود دەی سمی، خۆ ئەگەر بۆ زەلام بهاوێژرایەو بەری بكەوتایە، ئەگەر نەیكوشتایە ئازاری زۆر دەدا. وەختی خۆی شەڕەگەڕەك بە قۆچەقانی دەكرا.

- گێڵدەرەو مۆرپاس:-

دوو گوند بوون لەخوار بەرزنجەوە، دوو دێی گەورەو جوان و گڵێدەرە لەپێش بەرزنجەدا ئەوێ مەركەزی ناحیە بوو. مۆرپاسیش ناوبانگی بە نیسك و نۆكی باش دەركردبوو.

- ناوچەی شارباژێر:-

هەموو قەزای شارباژێر دەگرێتەوە، بەهەردوو ناحیەكەیەوە، سرۆچك و ماوەت.

شارەزوور:-

یەکێکە لە ناوچە هەرە خۆشە بەپیت و بەرەکەتەکانی پارێزگای سلێمانی. پڕ ئاوو پیت و تابڵێی لەبارە بۆ کشتوکاڵ. ناوی شارەزوور لەپێش ئیسلامەوە بووەو ناسراوە.

- ترێ گۆڕینەوە:—

جاران بارەترێ کە بە دوو تاسەوی کەڵەتووڵی بی یا چنار دروست دەکران، ترێی تێ دەکراو بە ولاخ دەهێنرا بۆ دێیەکی وەکو عەربەت کە خۆی ترێ و میوەی تری نییە، بەڵام گەنم و جۆیەکی باشی هەیە، ترێ دەگۆڕرایەوە بەدوو ئەوەندە یا کەمتر یا زیاتر بە گەنم یاخود جۆ بەهۆی تەرازووەوە.

- کوڕی حکومەت:—

ئەوسا بە (عەسکەری لجباری)یان دەوت.

- قوچی تاش:—

سەرتاشینە بە چەقۆ، بەڵام لەپشتەوە دوو پەنجە زۆور مل پاك دەکراو لاجانگیش ڕێری دەقرتا، واتا بە مەکینە نە دەتاشرا کە وردە وردە تاشینەکە بێتە خوارەوە نەك لەڕاستی گوێدا یاخود نەختێك خوارتر لەپڕ بقرتێنرێ بۆیە شتێکی ناشیرین و نەشاز دەردەچێت، ئەوەش لەبەردەستکورتی بوو.

- سەرە نوێڵك:—

ئەو شوێنەی لەناو گوند یا لە دەرەوەیدا پەین و ڕیخی وڵاخی لێ فڕێ دەدرێ.

- وصل دەرکردن:—

بە شەرعی ئیسلام چ پیاو چ ژن دوای (جماع) پێویستە خۆیان بشۆن.

- فەقیانە:—

جاران کراسی کوردی لە بلووری یاخود کەتان دروست دەکرا بۆ پیاو، لەسەر دەستەکانی پارچەیەکی گەورەی سێ سووچ پێوەی دەدورا بۆئەوەی بیداتەوە، بەسەر قۆڵی مرانخانی یا سەڵتەکەیداو بیپێچێ و تونەوتۆڵ دەرچێت، لەکاتی

دەستنوێژشتندا بەئاسانی دەکرایەوە، ئەمە سوودی زۆربوو بۆ ئارەق سڕین و دەموچاو وشککردنەوەو هەندێکجار شت تێخستن.

ـ ڕەز:—

واتە باخی ترێ لەدەرەوەی دێ، بەڵام بنەمێوەکان لای ئێمە هەر لەزەوی دان و زۆرکەم هەڵدەسێنرێنە سەر دار یاخود کەپر بەپێچەوانەی ڕەزی وڵاتانەوە. لە ئیتاڵیا ڕەزم دیووە یەکێنە مێوی لە زەویدا نەبووە.

ـ بزنە مەرەز:—

جۆرە بزنێکە لای خۆمان زۆربوو. بەدەنی لە گیانی بزنی ئاسایی بچوکترەو ڕەق و تەقترە، بۆیە شاخاویەو لەناودارو بەردا زیاتر هەڵدەکات، مووەکەشی بەنرخترە.

ـ هێستر یاخود ئێستر:—

ئێستا لە وڵاتی خۆمان کەمبۆتەوە. لەئەنجامی جووتبوونی نێرەکەرو ماین پەیدا دەبێ. ئێستر لە هەموو وڵاخێك بەهێزترو شاخاوی و بارهەلگرترە، هێستر نەزۆکە، (ماچە)کانیان واتا (مێیەکانیان) نازێن و منداڵیان نابێ، لەبەرئەوە نێرەکانیشیان هەر بە (جوانی) دەخەسێنرێن واتا (گون)یان دەردەهێنرێ بۆئەوەی هێزی جنسییان نەمێنێ.

پۆپەشمین:

لەکاتی نووستنی هاویندا دەدرا بەدەموچاوا بۆ پاراستنی لەمێش و مەگەز.

کوننە. کونە لە پێستی بزن دوای خۆشکردنی، لەلادێ هەر ئەمە بەکار دەهێنرا بۆ ئاوگواستنەوە لەکانییەوە بۆ ماڵ، چونکە ئاوی بۆری نەبوو. شوێن قاچ و دەستەکانی بەبەن دەبەسترا‌و هەر نەدەکرایەوە تەنها دەمەکەی کە شوێنی ملی ئاژەڵەکە بوو، لەوێوە ئاوی تێ دەکرلو دەڕژێنرایەوە.

- قوتوله. قوتیله، قوتویەکی تەنەکەی خڕ قولفیشی هەبوو، نەوتی تیْ دەکراو لەسەرەوە فتیلەیەك کە نەوتەکەی هەڵدەمژێ، دادەگیرساو شوێنەکەی ڕووناك دەکردەوە، بەڵام دوکەڵێکی زۆری هەبوو.

- دیان، گاور:— واتا مەسیحی.

- غەفورە ڕەشی هندی شوفێریوو لەکاتی خۆیا لەگەڵ ئینگلیزەکان هاتە سلێمانی و مایەوە، لەوێ ژنی هێناو ئیسلام بوو، کوڕێکی بوو کەمال مامۆستا بوو تا پلەی (مرشد تربوی) ڕۆیشت و ئیتر فەرمانی یەزدانی بەجێهێنا.

- زنجیری تایە:—

ئۆتۆمبیل یاخود گەڕێن ئەوسا چونکە ڕێگاویان قیرتاو نەکرابوون زنجیریان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرت، بۆ دوو تایەی پێشەوە، زنجیرەکە وەك ئەڵقە هەڵدەکێشرایە تایەکەو ئیتر قوڕو لووسی زەوی کاری لێ نەدەکردو تایەکە پەرتەرناشی نەدەکردو نەدەچەقی.

- قەتارچی:—

وەختی خۆی چونکە (گەڕێن) نەبوو، هاتوچۆو بارگواستنەوە هەر بە وڵاخ بوو. ئەو کەسەی چەند وڵاخێکی هەبوایە لە جیاتی (لۆری) ئەمڕۆ شتومەکی بازرگانی و شتی تریان پێ دەگواستنەوە، نەك هەر تەنها شارەو شار، بەڵکو وڵات بەوڵات، قەتاری سلێمانی لەگەڵ بازرگانەکاندا وەختی خۆی گەیشتوونەتە هەشتەرخان (استراخان) لە ڕوسیای قەیسەری.

- نەقیزە:—

دارێکی نووك تیژە، یاخود بزمارێکی سەر پەرپیپیوە، کەرسوار کە دەیدا لە ملی گوێدرێژەکە، بەوە ئەو حەیوانە قەرس دەبوو، لەتاوا خێرا دەڕۆیشت و غاری دەکرد، جارجاریش لەملاولای ڕانیشی دەدا، هەر بۆ ڕۆیشتن، ئەم ئیشە تێوەژەندنیان پێ دەوت.

- بارگە:—

ئەو دوو تایەیە کە بەملاولای وڵاخدا بە گوریس قایم دەکرێت، تاکان بریتیبوون لە لێفەو دۆشەک یاخود باوەڵ (سندوقی تەنەکە)...

- زیە بێوە:—

زیە کورتکردنەوەی (زبیدەیە)، بێوە کورتکردنەوەی (بێوەژن).

— قرپـۆک، مێـوەی قرپـۆک، واتـا خـراپ و مەیلـەو هـەڵپرزاوو ڕەشـەوەبووی دەردەدار.

- کەما:—

لەوەڕی ئاژەڵە، گیایەکی بنج بەهێزی پەلوپۆ دارێـژراوی چیایە، دوای بڕینـی لـە کایەن یاخود تەویلەدا هەڵدەگیرا بۆ زستان و زۆر بەسوود بوو.

- دۆشاو مێوژ، باسوق، سجوق، هەموو لـەترێ دروسـت دەکـرێن، باسـوق لەگـەڵ ئاردا، سجوق ئاردو گوێزی لەگەڵە.

- هێلەساو:—

سواخ دانی ناومال یاخود تەڕاوکردنی بەگڵی سپی.

کەنوو:—

لەشێوەی دۆڵابێکی گەورەدا لەقوڕ بەقەد دیوارەوە دروست دەکرێت. لەسـەرەوە دەمێکی کەوانەیی هەیە کە لەوێوە شت بکرێتە ناوی و ئەو سەرەشیان دادەپۆشرا یا سواخ دەدرا. لەپێش و خوارەوەشی کونێکی تیابوو بە تۆپەوانە دەگیراو کاتێک شتی لـێ دەردەهێنـرا ئـەو تۆپەوانەیـە دەردەهێنـرا ئـیتر شـتەکە (گـەنم، سـاوەر، بـرنج، مێوژ...) چی بوولیە خۆی دەهاتە خوارێ.

## عەربەت و ناوچەی تانجەرۆ (شارەزوور)

عەربەتی ئەوسا دێیەکی سەد ماڵ بوو، سێ ماڵ لە سەرەوە لەسەر ڕێگەی ئوتومبیلی سلیمانی – هەڵەبجەو باقیەکەی لە خوارەوە بوو. وەك ئێستا نەبووبوو بەشار باوکم وەك فەرمانبەرێکی میری لە بەرزنجەوە گوێزرایەوە بۆ عەربەت وەك لەمەودوا زیاتر باسی ئەکەم.

هەندێك لە دێهاتی ناوچەی تانجەرۆ دەکەونە ناوچەی شارەزوورەوەو تێکڕا ئاوو هەوای وەك هی شارەزوورەو (هەندێك دێهاتی ئەبێت وەك زرگوێزی گەورەو زرگوێزی بچووك و... چەند دێیەکی تر). ناوەکەشی بەناوی چەمی تانجەرۆوەیە کە بەناوەڕاستیا دەڕوات تا لەو سەرەوە تێکەڵ بە سیروان دەبێت و ڕووباری (نیالی) پێك دەهێنن و ئەم ڕووبارەش دەڕژێتە (دجلە)وە. ناوەکەشی بە بڕوای من لە (تاج–روود)ەوە هاتووە کە دەکاتە (ڕووباری تاج یاخود سوڵتان)، چونکە لەکاتی خۆیدا ئەرزو ئاو هەموو (میریی) واتا هی حکومەت بوون لە کاتێکدا کە دەور دەوری عوسمانی و هەموو شتێك بەناوی سوڵتانەوە بوو.

چەند دێهاتێکی (ناحیەی تانجەرۆ) دەکەونە ناوچەی شارەزوورەوە، وەك دێی (قەرەگۆل)و (خاك و خۆڵ، مەڵبەندی شاعیری مەزنی مەلا خدری نالی). ئەم دوو دێیە ڕاست دەکەونە سەر ڕووباری تانجەرۆ. هەروەها دێهاتی (بێستانسوری گەورەو بچوك و زێرێبخوو دسکەرەو باریکەو چەند دێیەکی تر) تاکو عەرەبەت خۆشی بە شارەزوور دادەنرێت.

(شارەزووریش ناوچەیە کە لە عەربەت و گرێزەو موانەوە دەست پێدەکات تا نزیك هەڵەبجە و هەورمان. ئەم لاولاکەشی زنجیرە شاخی قەرەداغ و دێلێژەو ئەو شاخانەی ترن کە لێیان جیابوونەتەوە. ئاوو هەوای لە هاویندا گەرم و کەمێك ناسازو لە زستاندا بە بارانەو کەمێك ساردە. سازترین ناوچەی کوردستانە بۆ کشتوکاڵ،

جگەلەوەی شوێنێکی مێژوویی گرنگەو بۆ ناسینی تەواوەتی بە خوێنەرانی بەڕێز، نووسینێکی دوورودرێژی پێویستە).

دێهاتەکانی (ناحیەی تانجەرۆ) زۆریان بە کشتوکاڵی زستانەوە خەریکن، بەتایبەتی گەنم و جۆ کە لەم ناوچەیەدا بەرهەمێکی زۆری هەیە، دوای ئەوەش توتن لە دێهاتەکانی ئەو بەریەوە کە بەقەدی دامێنی شاخی قەرەداخەوەن، چونکە نەختێك فێنك و ئاوەکەیان کانیاوەو چەم نییە، توتنەکەی خراپ نییە.

بەبۆنەی گواستنەوەی باوکمەوە کە فەرمانبەری میریی بوو، لە بەرزنجەوە بۆ عەربەت و لەبەرئەوەی من لە پۆلی دووی سەرەتاییەوە دەرچووم بۆ پۆلی سێ و عەربەت تا پۆلی دووی لێبوو ناچار دەبوولیە بچوومایە سلێمانی و لەوێ بخوێنم.

بەلام کەژ هاوین بوو ساڵیش بوو بە (١٩٣٧). پشووی هاوین لە عەربەت مامەوە. لەبەرئەوەی تەنهاو تاقانە کوڕیووم لە ماڵەوە خۆم پێ ڕاگیر نەدەکرا، هەرچەندە پێش ئەوەی بگەینە عەربەت گوێمان بە پیسیی و کوشندەیی دووپشکەکانی ئاخنرابوو، بەلام من گوێم نەدایە، پەتم پچڕی و تێکەلاوی ناو منداڵە وردانەی عەربەت بووم، باوکیشم دڵی نەدەهات ڕێگام لێبگرێ، چونکە پیاوێکی پڕ هەست و (واقعی)بوو، دەیزانی، کە هەرگیز ناشێ لەماڵەوە بەند بکرێم، ئەوەشی لەبەرچاوبوو کە یەك دوو مانگم ماوە لای ئەوان لەدواییدا دەبێ لێیان دووربکەومەوەو بچمە سلێمانی. وە لەبەرئەوەی زوو منداڵ لەگەڵ منداڵی تردا هاوڕێیەتی پەیدا دەکەن و یەك دەگرن بەبێ ئەوەی پێویستیان بە پێشکەشکردن بەیەك و یا پێشەکی هەبێت. منداڵیش لە عەربەت وەك هەموو منداڵێکی ئەوسای دەرەوە ڕەش و ڕووت، سەریان قوتی و پێیان پەتی، چلکن، هەر بەیانی کە لەخەو هەڵدەستان بەبێ ئەوەی دەموچاو بشۆن نانێکیان دەگرت بەدەستەوەو دەیان خوارد (پێخۆری تریان نەبوو). بۆ سەراویش دەچوونە ئەو دەشتە، چونکە بەبیرم نایەت ئەو ڕۆژە (توالێت)، یاخود بازۆر زۆر نەکەین (ئاودەستخانە) لە یەکێك لەو ماڵانەی عەربەتدا هەبوو بێت، خۆ

حەمام و سەر شۆلك ئەوە هەر هیچی نەبوو. پیاویش هەر لەو دەشتە، یاخود دەچوونە مزگەوت، ئافرەتیش بۆ کانی ژنان.

بۆ (وصل) دەرکردنیش ئەگەر چلەی زستانیش بووایە، بۆ پیاو حەوزەکەی مزگەوت و بۆ ژنیش کانی ژنان زیاتر نەبوو، ئەمە لە کاتێکدا کە حەوزی مزگەوت دوای ئەوەی وصلی تێدا دەکرا، ئاوەکەی دەهاتە ئەم دیو بۆ حەوزێکی تر، کە حەوزی دەستنوێژو ئاو لەدەم وەردان بوو، باقی ئەم ئاوەش دەچوو بۆ ئاودەستخانەکان بۆ (تارات)گرتن.

خواردنیشیان جگە لە نان و چایەکە ئەگەر شۆربایەکی برنج یا ساوەر یا نیسکی لەگەڵ بووایە ئەوە زۆر بوو. ماڵی وا هەبوو (ئەمەش ڕاستە کە دەیڵێم) لەم جەژن بۆ ئەو جەژن تامی گۆشتیان نەدەکرد.

میوەش بریتیبوو لەو بارە تری و هەرمێ و شتی ترە کە لە شارباژێڕو سروچکەوە خاوەنەکانیان دەیان هێنان، بەڵام بە پارەیان نەدەدا، بەڵکو سەر بەسەر یاخود یەك بەدوو بە گەنم و جۆ دەیان گۆڕیەوە.

دە لەگەڵ ئەم کەمی خواردەمەنیەو پیسوپۆخڵیە منداڵ و گەورەیان تەندروستییان گەلێك لە منداڵ و گەورەی شار باشتربوو، چونکە منداڵەکانی هاوڕێم یەکێکیان بەڕۆژ بێ ئیش لە ماڵەوە نەدەمانەوە، بەڵکو ئەوسا منداڵیان بەزۆری میریش هەر نەدەنارده قوتابخانە، دەیان وت ڕێی ئیشمان لێ دەگرێت، بەتایبەتی تا ئەوساش یەکێکیان پێنەگەیشتبوو لە قوتابخانەدا کە مانگانە وەربگرێ و جۆری ژیانی بگۆڕێ تا ئەوانی تریش بخوێنن و چاوی لێبکەن. منداڵەکانی هاوڕێم یەکێکیان شوان بوو، یەکێکیان بەرخەوان بوو، یەکێکیان گێرەی دەکرد، یەکێکیان کێشەی دەکرد، یەکێکی تریان لەگەڵ باوکیا یا کاکیا دەچوو بۆ دارکردن لە چیا.

بەو جۆرەو بەداخەوە هەرچی دارێك هەبوو، هیچیان نەهێشت و چیاکانیان ڕووت کرد، کاتێك (دایەرەی غابات) کەوتە خۆی بۆ بەرهەڵستی داربڕین کار لەکار ترازابوو،

ئێستا ناچار (غابات) خۆی داردەچێنێ بۆئەوەی سەوز بێ و گەورە ببێ و هەوا بگۆڕێ.

من لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەم دەچووینە دەشت و چیاو بەرەو چەمی تانجەرۆ کە سەعاتێك بە ڕۆیشتن لە عەربەتەوە دوور بوو، بێئەوەی گوێ بدەینە دووپشك و مارو گورگ و چەقەڵ کە ئەوسا بەڕاستی زۆربوون. تەنانەت چونکە منداڵی عەربەت بەڕۆژ لەبەر ئیشوکار یارییان پێ نەدەکرا، جارجار بەشەو دەچووینە دەرەوە، بەتایبەتی کە مانگەشەو بووایە یاریمان دەکرد، ئەوەی باش بوو ئێستاش مارێك یا دووپشکێك بەکەسمانەوەی نەدا.

٣

وەك لە ئەلقەی یەکدا نووسیبووم کەوا لەساڵی (٩٣٧)باوکم لە بەرزنجەوە گوێزرایەوە بۆ عەربەت، من لە پۆلی دووی سەرەتاییەوە دەرچووم بۆ سێ. لەبەرئەوەی قوتابخانەکەی عەربەت تەنها پۆلی یەك و دووی هەبوو، من لە سلێمانی توندکرام و لە ماڵی خزمێکی دایکم لای (باجی حەلاو)، کە ماڵەکەیان نزیك شەقامی سابونکەران بوو، یاخوا گۆڕەکەی پڕ لە ڕووناکی بێت. باجی حەلاوی خزممان، هەر تەنها ژن نەبوو بەس، بەڵکو شاژن بوو. تەمەنی ئەوسا پەنجا ساڵ دەبوو، ڕەقەڵەیەکی باڵا ناوەندی، سەرو ئەگریجە سپی. مێردەکەی (قوڵچی– ساعی) بوو، مانگانەکەی تەنها(٣) دیناربوو بە (مخصصات)ی ئەسپە بۆرەوە کە وەری دەگرت دەگەیشتە چوار دینارو نیو.

ئەم ژن و مێردە دوو کوڕو کچێکیان هەبوو. کوڕە گەورەکەیان ئیشێکی وەهای نەبوو، جگەلەوەی هەستی بەئەرکی سەرشان نەدەکرد، بەڵام ڕەشە خێزانێکی بەسەر ماڵی باوکیا سەپاندبوو کە ژمارەیان لەم دواییەدا گەیشتە شەش سەرخێزان.

کورەکەی تریان هەر زوو بەجێی هێشتن دوای ئەوەی بوو بە مامۆستا، ژنی هێناو لای لێ نەکردنەوە.

خانووەکەیان هەر سەد مەتر دەبوو، ژوورێك لە سەرەوەو دووان یەك لەناو یەکدا لە خوارەوە، ژووری پشتەوەیان تەویلەی ئەسپە بۆر بوو.

(باجی حەلاوی مەزن) بەو مانگانە کەمەی مێردەکەی و بە (لفکە چنین) ئەو خێزانە گەورەیەی بەڕێوە دەبرد. ئەمە لەکاتێکدا کە ماڵەکەشیان وەك ئێستگە وابوو، چونکە باجی حەلاو تابڵێی ژنێکی ژیرو ڕووخۆش و ڕێزی خەڵکی لابوو، ئیتر هەمیشە ماڵەکەی جمەی دەهات. ئەم خزم دەهات و ئەو ناسیاو دەڕۆیشت، دەهاتن پرسیان پێ دەکردو ئیشیان بە منالەکان دەکرد، هەمووش چایان دەخواردەوەو ئەگەر کاتی نانخواردنیش بووایە نانیان دەخوارد، بەڵام لە ڕاستیشدا خەڵکەکەش دیاری و یارمەتییان پێشکەش دەکرد.

من لەو ماڵەدا چوار ساڵم بردە سەر تا گەیشتمە یەکی ناوەندی. شەو کە خێزانەکە دەنووستن من و باجی حەلاو بەدیار چرایەکی (لەمپای ئاوێنەدار)ەوە کە لەسەر کورسییەکی بنۆڵە دادەنرا دادەنیشتین، من دەرسەکانم دەخوێندەوەو ئەویش لفکەی دەچنی، شەو نەدەنووست جاری وا هەبوو نوێژەکەی بەیانی دەکردو لفکەکەی تەواو دەکرد ئینجا دەنووست. هەر کە لەدوای یەك دوو سەعات نووستنی هەڵدەستا، گورج لفکەکەی دەنارد دەیفرۆشت، ئەوسا پەنجا فلس و لەدواییدا ڕوپیەیەکی دەکرد، بە پارەکەی نان و گۆشتی ئەو ڕۆژە دەکڕا، هەندێکجار گفتەی لێدەناو دەیوت:" ئەمڕۆ (گفتە لفکە)مان هەیە."

باجی حەلاو دەینارد خوری لەلادێ دەکڕی و پاك دەیشتەوە، ئینجا بە خۆی و کچەکەی و بوکەکەی و خزمان و دەرو دراوسێ دەیان ڕست و لفکەی پێ دەچنی، دەستی کورت و داراییان کەم بوو، بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژان ئاخ و ئۆفێکی نەکرد، سەریشی بچوولیە نوێژی نەدەچوو، جگەلەوەی مەلای تایبەتی خۆی هەبوو،

حەفتەی جارێك مەلا عەلی دەهاتە ماڵەوە بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێند، باجی حەلاویش لەبەرخۆیەوە لەگەڵیا دەیخوێند، چونکە هەر لە منداڵییەوە لە حوجرەدا زۆربەی ئایەتەکانی لەبەربوو.

باجی حەلاو لە کۆمەڵ دوانەدەکەوت، نەیدەهێشت دەستکورتی پێوە دیاری بدات، ژنێکی خاوەن دەروونێکی بەرزو (شخصیەت)ێکی بەهێزی هەبوو، لەهەمان کاتیشدا زەوق و حەزی لە گەڕان و سەیران بوو، بەهاران یاپراخ و ماست و خورماو رۆنێکی نێرگزی بۆدەکردین و لەگەڵ منداڵەکانی کوڕەکەیدا دەیبردین بۆ سەیران (سەیرانی ئەوسا) دەمەوبەهار دەوروپشتی سلێمانی، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی ئاوی هەبوو نزیك بوون بە زۆری رۆژانی چوارشەموان پڕدەبوون لە سەیرانکەر بەجلی ئاڵ و واڵاوە کە لەگەڵ بەهار رەنگی گیاو گوڵ و گوڵاڵە تێکەڵاو دەبوون، پیاو هەر حەزی نەکرد سەیری ئەو دیمەنە جوانانە بکات. لە (پیرمیکائیل) کە لای پردەکەی ئەوسای (هۆمەرەکوێر)ەوە بوو نزیك دێی (قرگە) رۆژهەڵاتی سلێمانی و(کانی با) دیسان هەر لە رۆژهەڵاتی سلێمانی و(کارێزی وەستا شەریف)و (گردی مامەیارە)و (تووی مەلیك) لەژوور سلێمانییەوە کە ئێستا هەمووی خانووەو هەر بە گەڕەکی تووی مەلیك بەناوبانگەو بە موڵکایەتی هی شێخانی سلێمانی بوو، ئینجا (قۆڕیە شکاو)و (مشیراوا)و (چەمی قلیاسان)و ئەگەر خەڵك دوورتر بڕۆیشتنایە دەچوون بۆ(سەرچنار)و (بەکرەجۆ)و (چەق چەق) ئەمانە هەموو لە رۆژئاوای سلێمانی. لە خوارووی شاریشەوە (ولّوبە)و (داری شێخەباس)و بەولاتریشەوە (کانی ماسی)و بەولاتریشەوە گوێ چەمی (تانجەرۆ). ئەمانەو گەلێك شوێنی تر سەیرانگا بوون، خەڵك رووپان تێ دەکردن، کوپو کچ، ژن و پیاو، هەندێکجار گۆرانیبێژو جار جاریش دەهۆڵ و زوڕنا کە ئەوسا (عەبەی سەی زادە)و (گەڕگەڕ)و (حەمە چاوەش)و زۆری تر شاییان لە سەیرانگادا گەرم دەکرد. هەندێکجار ژن و هەندێکجار پیاو بە جیاو

جارجاریش تێکەڵاو(ڕەشبەڵەك) هەڵدەپەڕین و دەستیان بەر نەدەدا بۆ پشووی نانخواردن و چاخواردن نەبێت.

سەیرانی قوتابخانەکان جیا بوو،ساڵی جارێك یان دوو جار ڕێگا دەدرا بە قوتابخانەکان کە قوتابییەکانیان بەرن بۆ سەیران، ئەوسا هەر قوتابییەو لە ماڵەوە شتێکی بۆ دروست دەکرا لە مەنجەڵێکی بچووك یاخود(سەفەرتاسی)دا دەیبرد لە سەیرانەکە بەزۆری ئەم خواردنانە تێکەڵاو دەکران هەموو لەسەر (سفرە)یەك دادەنران، مامۆستاو قوتابی هەموو پێکەوە لێیان دەخوارد.

دوای ئەوە هەڵپەرکێ و یاری فۆلکلۆری وەك(ئاگرەو ئاشەبەتەنورێ و دای ماسۆن) پێشبڕکێ لە زۆر شتا دەستی پێ دەکرد، خۆ ئەگەر شوێنێکی ئاوداریش بووایە وەك ئەوسای(سەرچنارو چەق چەق و قلیاسان و چەمی تانجەرۆ) ئەوا مەلەوانگەشی تیا دەبوو. خەڵکەکە هەموو بەیانی بەپێ دەڕۆیشتن (ئۆتۆمۆبیل وەك ئێستا زۆر نەبوو) دەمەو عەسریش هەر بەپێ دەگەڕانەوە بۆ ناو شار، بەڵام جاری وا هەبوو قوتابخانە سەیرانی دوورتریشی دەکرد بۆ هەڵەبجەو زەڵم و قەڵاچواالان و کۆتەڵ و ڕێگای دوکان ئەوسا سەرچناروو دوکان و ئەزمڕو دەربەندیخان و ڕێگای قەرەداخ وەك ئێستا نەبووبوون بە سەیرانگای تەواو و ڕێگای ڕێکوپێکیان نەبوو.

ئەوسا سەرچنار تەنها خانووەکەی (میرزا تۆفیقی قەزاز)ی تێدابوو، دە ئێستا خوا ڕەوای ببینێ و ئەوەندەی تر ئاوابێ مەملەکەتێکە.

جا ئەوەندەی هەڵبەستێکی ئەوسام لەبیرمابێ و نازانم هیکام هۆنەرە لە بابەت بەهاری سلێمانییەوە وەك شریتێکی سینەما بۆت ڕوون دەکاتەوە کە دەڵێت:

چوارشەموان هەرایە،
ڕۆژی بەزم و سەفایە
حوریەت ئاشکرایە
ژیانی ئەورووپایە

کاشکی هەروا بووایە.
یارم هەموو بەهاران
پێکەوە بچینە سەیران
بەخۆشی خزم و یاران
هەر ئاوابێ وەتەنمان.
جێ هەر قۆریەشکاوە
وێنەی خۆی نەبینراوە
بڕوانی لە هەر لاوە
دەستەی کچان و لاوە
وەك چنارو لاولاوە
پیرمیکائیل ببینە
دلگیرو خۆش و شینە
هەر وەك تاوس ڕەنگینە
جێی نازو نازەنینە
سەیران و پێکەنینە.

ئەم هەڵبەستە زۆرە، بەدلخەوە هەر ئەوندەیم لە بیرماوە.

# لە چلەکاندا

## وەرزش و دیدەوانی لە قوتابخانەکاندا

### ١

مەبەستمان لە چالاکییەکانی شاری سلێمانییە لە کۆتایی ساڵەکانی سی و تا نیوەی چلەکان، بەڵام پێش ئەوەی بێمە سەر درێژەپێدان، ئەمەویّ یادی دوو مامۆستای بەڕێزو دڵسۆزو نیشتمانپەروەر بهێنمەوە بیر کە ئێستا لەژێر گڵدان، ئەو دوو مامۆستایەی کە تاکو رادەیەکی زۆر کاریانکردە سەر جوڵانەوەی وەرزش و دیدەوانی لە قوتابخانەکانی سلێمانیداو پێشیان خستن و بەتایبەتی وەرزش بەزووریەی جۆرەکانیەوە.

ئەو دوو مامۆستا خوالێخۆشبووانە یەکەمیان (جەلال محەمەد سیف اللەو تا مەلا جەلال)و دووهەمیان (صالح عەلی) کە بەڕاستی دوو باوکی دڵسۆزو خەمخۆر بوون بۆ قوتابی، چونکە هەر کە پێشکەوتنێکیان لە قوتابییەك بدیایە لەیاریدا، لەهەر جۆرە یاریەکدا بووایە، گەز گەز باڵایان دەکردو رووناکی دەکەوتە دەموچاوو روویان.

جەلال ئەفەنی کوڕی خوالێخۆشبوو (مەلا کاکە حەمە) بوو، کە ئەو لە خۆیا مامۆستایەکی زیرەك و لێهاتووی قوتابخانەکانی لادێ بوو، بگرە یەکەم مامۆستابوو لە جۆری خۆی کە چەندەها قوتابی لەو دەشتی گەرمیانە پێگەیاند لەم بابەتەوە دوو کتێب لەسەر کۆشش و رەنجی دڵسۆزانەی دانراوە لەلایەن مامۆستایان (شاکر فەتاح و مستەفا سەید ئەحمەد – نەریمان)ەوە. مامۆستا جەلالیش کوڕی ئەو باوکە بوو، بۆیە هەر بەو دڵسۆزیی و دڵپاکییەوە تێکۆشا.

دووهەمیشیان صالح ئەفەنی گەیشتە پایەی (مفتش)و بەڕێوەبەری وەرزش و دیدەوانی لە سلێمانی و لەسەر (دیدەوانی – کەشافە) کتێبێکی دانا، ساڵی

(١٩٧٠)لـە چـاپخانەی کامـەران لـە سلێمانی لەچـاپی دا، ئـەوە بـە یەکـەم کتێـب دادەنرێت لە کتێبخانەی کوردیدا من دیبێتم و لەبیرم بێت لە تۆپا بریتـی بـوو لـەیاری (تۆپی پێ – فوتبۆڵ)و (تۆپی شبکە – باڵ بۆڵ)و (تۆپی سـەبەتە – باسکیت بـۆڵ) لە ڕاکردندا سەدمەترو پێنج سەد مەترو هەزارو پێنج سەد مەترو سێ کیلۆمـەتر جگـە لـەیاری یـەك بـازو سـێ بـازو بـازی (موانـع) بـازدان بـەهۆی داری زانـەوەو هەڵـدانی قورسایی (قرص)و ڕم، دوای ئەوانە هەموو، یاری سویدی و هەندێك وردە یـاری تـری دەرەوەو خۆیی.

ئەو یاریانەی لـە حەوشـەی قوتابخانەکانـدا دەکران، ئەوەنـدە نـەبوون، چـونکە حەوشەکان ئەوەندە فراوان نەبوون، تـەنها حەوشـەی قوتابخانـەی ناوەنـدی ئەوسـا نەبێت کە لە تەنیشت نەخۆشـخانەی کۆنـەوە بـوو، قوتابخانـە سـەرەتاییەکانیش تـا بەینێکی زۆر هەر تەنها سیان بوون، فەیصەلیە بەناوی مـەلیك فەیـصەلی یەکەمـەوە، خالدیـە بـەناوی خالیـد کـوڕی وەلیـدەوە، ایوبیـە بـەناوی سـەلاحەدینی ئەیوبییـەوە ناونرابوون، لەدواییدا قوتابخانەی (گۆیژە) شیان هاتەپاڵ.

وەك وتمان لەبەر بێ شوێنی زۆریاری و گۆشـش و تاقیکردنـەوەی یـاری دەبرانـە دەرەوەی شار کە ئەوسا دەشتی (تەیارەخانـە)یـان پـێ دەوت کـە ئێستا گـەڕەکی (عەقاری)یەو لە ناوەڕاستی شاردایە. بەتایبەتی (استعراض)ی ساڵانە کە لـە بـەهاردا دەکرا، کە ئەمەش پێشبڕکێیەك بوو لـە بـەینی قوتابخانەکانـدا دەبرایـە ئـەو دەشـتە سەوزە پان و بەرینە دڵفرێنە.

ئەوساکە هەر قوتابییەك شانازی بـە قوتابخانەکـەی خۆیـەوە دەکـردو خواخـوای بوو قوتابخانەکەی لە استعراضدا سـەرکەوێت و بیبلـەوە، بـەزۆریش قوتابخانەکـەی ئێمـە کـە فەیـصەلیە بـوو دەیـبردەوە، ئـیتر لـە دەشـتەکەوە ئـەو پاڵەوانانـەی بردویانەتـەوە بەشـان هەڵـدەگیران تـا ناوشـار، بـە ئـاوازی گـۆرانی و چـەپڵەلێدان و بابڕییـەوە. وەرزشـەوانەکانی قوتابخانـەی فەیـصەلیە، زیـاتر چـەند قوتابییـەکی

(ئەرمەنی) بوون کە بەراستی لە یاریەکاندا قاڵبوو بوون، لەوانە ئەوی ناویم لەبیربێت: ( انترانیك دیكران الكسندریان – ئێستا لە بەغدا لە شەقامی ڕەشید دەرمانخانەی هەیەو کارنیك زادیك).

من خۆم قوتابییەکی دەرهاتوو نەبووم لەوەرزشدا، بەڵام حەزم بەهەندێك یاری ئاسان و خۆمانە دەکرد. بۆیە کە لە قوتابخانەی ناوەندی بووم، ساڵی (١٩٤٢) (استعراض)ێك کرا، لەوەدا من لە یاری (کەر سواران)دا، بەشداربووم، دراوسێیەکمان هەبوو ئیشی کڕین و فرۆشتنەوەی کەر بوو. چووم سەرم کرد بە کۆشیا کە فریام کەوێ، ئەویش خوا هەڵناگرێ جاشێکی بۆ هەڵبژاردم دەتوت تیسکەی تفەنگە دەردەچێت. منیش حەفتەیەك مەشقم پێکرد تا ڕۆژی خۆنواندن. لەو ڕۆژەدا هەر کە پێشبڕکێی ئێمە دەستی پێکردو دەمانچەی یاری ئاگردرا، منیش لە کەرەکەمەوە ژەندو خۆم بەسەر پشتییەوە توند کردو وەك باوبۆران بۆی دەرچوو، منیش لەخۆشی پێشکەوتن ئاگام لەخۆم بڕا، کاتێك کەری ناجسن گەیشتە بەردەمی ئەو دەوارەی بۆ موتەسەریف و (مدیری معاریف)و خەڵکە سەیرکەرەکان هەڵدرابوو، لەجیاتی ئەوەی ڕاست بڕوات، خۆیکرد بەناو دەوارا. ئیتر هەتا هێنامانەوە سەر ڕێی ڕاست و دەستم کردەوە بەغار، کاك مستەفای هاوڕێم کە سواری کەرێکی سپی بەغدادی بووبوو ئەو بوو بەیەکەم و من بووم بە دووهەم، ئەو خەفەتی دۆڕاندنە هەتا ئێستاش هەر لە یادم دایە.

ڕۆژێك لە قوتابخانەی ناوەند صالح ئەفەندی، یاری و کۆششی (ملاكمه) کە تازە گەیشتبووە سلێمانی بە دوو قوتابی دەکرد، یەکێکیان کارنیك بوو، کە سەری لە یارییەکە دەردەکردو شتێکی لێ تێگەیشتبوو، بەڵام بەرامبەرەکەی هیچ، هەر ئەوەی دەزانی بە دەستکێشەکانیەوە لە هاوڕێکەی بسرەوێنێ، یاری نەختێك درێژەی کێشا، تومەز کارنیك مستەکۆڵەیەکی دابوویە لاشەویلگەی بەرامبەرەکەیدا ئازاری پێگەیشتبوو، ئیتر ئەویش بە(بۆکس)و چەپۆك بەر بووە کارنیك. صالح ئەفەندی هەر

فیکەی لێدەداو دەیوت:"فاوڵ"، سوودی نەبوو، ئەو هەر خەریکی بیرازی کارنیک بوو، کارنیکیش بەگوێرەی پەیڕەوی یارییەکە بەرگری لەخۆی دەکرد، نەخێر کاکم ئینجا بەربووە شەق و شەقازلە لە کارنیک، مامۆستاش هەر فیکەی لێدەداو دەیوت فاوڵ، تاکو من و چەند کەسێک بە مامۆستامان وت:

— ئەوا کوڕەکەی کوشت تۆ فیکەی چی لێدەیت.

بەهەموو چووین گرتمانەوەو هێنامانە ئەم لاوە، بەڵام هەموو گیانی کارنیکی هەژاری کرد بەخوێن.

هەر ساڵحە فەنی خواڵێخۆشبوو مامۆستای وەرزش بوو، جارێک تیپی قوتابخانەکان و تیپی (ئەهلی) یاری تۆپی پێیان کرد، تیپی یەکەم گۆڵێکی لە تیپی دووەم کرد، بەوە کرژی و هەڕەشەو گوڕەشەو سووکە دەستوەشاندن دەستی پێکرد، بەتایبەت هەندێک لە ئەندامەکانی تیپی ئەهلی قەساب بوون کێردیان هەڵگرتبوو.

مامۆستا ساڵح پیاوێکی دووربین بوو، خەریکبوو یاری یەکەم کۆتایی بێت، دەیزانی ئەوسا هەروا بەئاسانی شتەکە تێناپەڕێ. لەدوا خولەکەی یاریدا یەکێک لە تیپی ئەهلی شەقێکی لە تۆپەکە هەڵدا، تۆپ بەسەر تەختەی گۆڵەکەدا فڕکەی کردو نەکەوتە ناوییەوە، ساڵحە فەنی شاوری لێداو وتی:" گۆڵ". خەڵکە هەموو واقیان وڕما ئەو هەموو کەسە چاویان لێبوو کە گۆڵ نەبوو، چۆن مامۆستا کردی بە گۆڵ! ئەو وتی:

— لێرەدا قسەی من دەخوات ومن حسابم. من دەڵێم گۆڵ بوو.

هەندێ کەس چوونە لای مامۆستاو لێیان پرسی..

— ئەمە چی بوو بۆچ وات کرد؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

— كوڕە مردووتان نەمریٚ، من خوێنێکم کوژانۆتـەوە، ئێستا ئێوە اعتراضم لـیٚ دەگرن؟

ئەوسا هەموو تێگەیشتین کە مامۆستا چۆن بەریەستی شەڕو چەقۆوەشاندنی کرد، چونکە ئەوسەردەمە گیانی وەرزشەوانی بەوجۆرە بڵاونەبووبۆوە لەناو گەلداو بەتایبەتی لەناو ئەندامەکانی تیپی ئەهلیدا.

زۆر بە عەزرەتەوە بووم ڕۆژێك لە ڕۆژان، لەو یارییـە سووکەڵانەدا کە بەشدار دەبووم (مەدالیە) یەك وەربگرم، بۆیە لە ڕاکردنی هەزارو پێنج سەد مەتردا بەشدار بووم، سەیرم کرد هەموو جومگەکانم خەریکن لەیەك دەترازێن، مامۆستا ساڵح هەستی پێکردم کە هێشتا لە مەشقکردندام بۆیە زوو هێنامیە دەرەوە، منیش هەروازم نەهێنا، کە نزیك (استعراض) دەبووینەوە، لەم یاریانەدا خۆم تێهەڵدەقورتان (یاری گونیە— واتا گونیە لەپیٚ دەکەیت و ڕادەکەیت)و (یاری کەوچك و هێلکە— کەوچێك بە دەمتەوەیە لە کلکەوەو نارەکەی هێلکەیەکی تێدایەو ڕادەکەیت)و (یاری پارەو ئارد— دەستت لەدواوە دەبەستنەوە، قاپێك پڕ لە ئارد، پەنجا فلسییەکەی تێدایە بەفوو بەدەم ئەگەر پێش ئەوانی تر پەنجا فلسییەکەت هەڵگرت دەیبەیتەوە) منیش لەماڵەوە ئەوەندەم مەشق کرد، چەند گونیەم دڕاندو دەکەوتم، چەند هێلکەم شکاند، چاوم پڕبوو لە ئارد، لەدواییدا سەیرم کرد کەوچك و هێلکەکەی من لەبارترە، چونکە زۆر خۆم پێوە خەریك کرد، بێگومان پیاو هەر شتێکی ویست و هەوڵی بۆ داو خۆی لەگەڵدا ماندوو کرد هەر دەگاتە ئەنجامێك، باشبوو منیش ئەو ساڵە لەو یارییەدا یەکەم دەرچووم ومدالیەم تێدا وەرگرت، مدالیەکەم تا ئەم دواییەش مابوو شانازیم پێوە دەکرد، ئەو مدالیەیە پەنجا هێلکەی زیاتر تێچوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوسا هێلکە بەتایبەتی لەکاتی شەڕی گێتی دووەمدا گرانبوو، بەدەگمەنیش دەست دەکەوت.

هەندێك یاری تر هەبوو جارجار ئەوانیش دەكران، وەك (دایك و بێچوو) قوتابییەكی گەورە یەكێكی بچووكی بەنوشتانەوەوە بەقاچ هەڵدەگرت بەجۆرێك هەردوو دەستی توند بە قوولەپێی گەورەكەوە دەگرت و سەری لە بەینی هەردوو قاچیداو قاچی بەسەر پشتییەوە، گەورەكەش بەو بێچووەوە لەسەر دەست واتا لەپەو ڕوو ڕای دەكرد، كام جووت پێش بكەوتنایە ئەوانە دەیان بردەوە.

یاخود دارێكی درێژی ئەستووری لووسیان دەهێنا، ئەم سەروبنەوسەرەكەیان لەسەر دوو داری دووپەل قایم دەكردو ژێرەكەی حەوزێك ئاو بوو، داریان چەور دەكردو دوو كەس دەچوونە سەری و شەڕیان دەكرد، واتا بە دوو دەستكێشی گەورەی پڕ لە لۆكە یاخود بەدوو تووڕەكەی خامی نەرم لە یەكیان دەدا تا یەكێكیان ئەوی تری بۆڕ دەداو دەیخستە ئاوەكەوە.

ئیتر پێش ئەوەی بێمە سەر باسی (دیدەوانی– كەشافە)، حەزدەكەم دڵسۆزی مامۆستایانی ئەوساتان بۆ دەرخەم كە چەند بە تەنگ قوتابییەوە بوون و دەیان ویست پێشیان بخەن و ببن بە نموونەی شارەكە.

قوتابخانە (مراقبە)ی قوتابیەكانی دەكرد، دوای قوتابخانە بزانن كاتی خۆیان چۆن و لەگەڵ كێ دەبەنە سەر. خۆم قوتابی سەرەتایی بووم، بەچاوی خۆم دەم دی خوالێخۆشبووان (ڕەشید كابان كە (بەڕێوەبەری زانیاری– مدیری معارف)و عەلی شەوقی واتا– علی اگاه)و مامۆستایەكی وەرزشی قوتابخانەی خالدیە بەیەكەوە ڕۆژێك بەپێ بە كۆڵانەكانی شاری سلێمانیدا دەگەڕان، كە ڕۆژێك منیان لە دەرەوە دی گورج بۆ سبحەینێ عەلی شەوقی ناردی بە شوێنمداو پرسیاری لێ كردم ..

— بۆچی لە كۆڵانا دەوەستی؟

منیش وتم:

— دوای سەعی و خوێندنەوە تۆزێك هاتمە دەرێ هەوایەكی باڵی خۆم بدەم. وەڵامەكەی لا پەسەند بوو ئەگینا وازی لێ نەدەهێنام و سزای دەدام.

قوتابی خاوەن رەوشت و پاك و زیرەك بێگومان لە ئەنجامدا بۆ خۆشیان و بۆ وڵاتەكەیان و گەلەكەشیان خێر دەدەنەوەو هەموو دەبنە ئەندامی ئازاو بەهێز بۆ نیشتمان.

(بادن باول) كە لەساڵی (١٩٠٧)دا گەڕایەوە بەریتانیا، ئەو بیرو بڕوایەی خۆی بڵاوكردەوەو خستیە بەرچاوی هەموو ئەندامانی میری و پەرلەمان و گەل. دوورودرێژ باسی دیدەوانی منداڵی بۆكردن و كەڵك سوودەكانی بەتەواوی بۆ ڕوونكردنەوەو وتی:" ئەگەر گەنج و لاوەكانی ئێمەش بێتو بەوجۆرە یاخود لە شێوەیەكی وادا پەروەردە بكرێن لە دواڕۆژدا دەبنە ئەندامی ئازاو بەكەڵك بۆ گەلو نیشتمانەكەیان و ئەنجام دەدەن بەو ئەرك و ئیشانەی پێیان دەسپێررێت." لە ئەنجامی ئەم هەوڵ و كۆششەدا فەرمانی میری بۆ پێكهێنانی لیژنەیەك دەرچوو و لەساڵی (١٩٠٨)دا بڕیاری پێكهێنانی كەشافە دەرچوو، ئیتر لەو ساڵە بەدواوە دیدەوانی لە بەریتانیاوە بەناو هەموو وڵاتانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو ئەمریكادا بڵاویۆوە.

دوای ئەوە مامۆستا (ساڵح عەلی) لە كتێبەكەیدا دێتەسەر باسی مێژووی كەشافە لە عێراقدا پێش (١٩١٧)و دەڵێت:" لە (١٩١٤-١٩١٥)دا عوسمانیەكان تیپێكی كەشافەیان لە بەغدا لە قوتابخانەی سوڵتانیە دامەزران." جگە لەهەندێك لە شارە گەورەكانیش وەك بەسرەو موسڵ و دەڵێت: "لە سلێمانیش لە قوتابخانەی (نموونەی سەعادەت) تیپێك پێكهێنرا، بەڵام بەهۆی شەڕی گەورەی یەكەمەوە وادیارە كەشافە وەستاوە. لەدواییدا خوالێخۆشبوو مامۆستا ساڵح عەلی، كەشافەی بە دیدەوانی وەرگێڕاوەتە سەر كوردی، كە ئەمیش وەرگێڕانێكی دەقاودەقی (كشف و كشافە)ی عەرەبییە، چونكە وەك لە ئەڵقەی جاری پێشوودا وتمان كتێبێكی بەو ناوەوە لەساڵی (١٩٧٠)دا لەسەر (كشافە) داناوە.

ئێستاش دەنگی ساڵح ئەفەندی لەگوێمدا دەزرنگێتەوە كە لە قوتابخانەی فەیصەلیەی سەرەتاییدا هەر كە باسی كشافەی بۆ دەكردین، گورج ناوی

دامێنەرەکەشی دەبرلو دەیوت:" سیر رۆبرت بادن پاول ئنگلیزە"و وادیاریبوو زۆر (معجب)بوو بەو پیاوە گەلێك بە دڵی بوو، چونکە ئەم کردەوە پەسەندەی دامێناوە.

جا ئایا ئەم کابرایە کەشافەی چۆن دامێناو لە چییەوە دۆزییەوە ئەمە، چیرۆکێکی نەختێك دوورودرێژەو پێویستە بۆ خوێنەری روون بکەینەوە، بەوجۆرەی کە مامۆستا ساڵح لەکاتی خۆیدلو وەك لە کتێبەکەشیدا رووونی کردۆتەوە.

مێژووی پێکهێنانی کەشافە لە جیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵ (١٨٩٩ ز)، کە یەکەم پێکهێنەری کەشافە (لۆرد بادن پاول)ی بەریتانی لەگەڵ سوپاکەیدا لە شەڕی (بوێر)دا لە شاری (مانکنغ) لە ئەفریقا لەگەڵ تیرەکانی (زۆلو، سوازی) لەشەردابوو کە ئەم شەڕەش ئاماوەیەك درێژەی کێشا، بەڵام لە ئەنجامدا لەبەر هەندێك هۆی تایبەتی تیرەکان ژێرکەوتن.

لەکاتی ئەم شەڕەدا منداڵ و گەنجەکانی ئەم تیرانە بۆ ماوەی (٢١٧) ڕۆژ شارەکەیان پاراست و نەیاندا بەدەستەوە، ئەمەش بەیارمەتی کەسوکاریان. بادن پاول کە ئەو چالاکی و ئازایییەی لەو منداڵانەی دی، هەروەك دیدەوانێکی ئازاو زرنگ، وەك سەرباز لەدوای کەسوکاریانەوە دەڕۆیشتن شەڕیان دەکردو خەریکی هێنان و بردنی نامەو ڕاسپاردە بوون.

لەلایەن ئەم تیرانەوە گەلێك سەرگورشتەی خۆش خۆش دەگێڕنەوە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ و گەنجەکانیان. گوایە کە منداڵیان دەگەیشتە تەمەنی پانزە ساڵان ڕووت و قووتیان دەکردنەوەو لەشیان بەڕەنی چەوردەکردن، ڕم و قەڵغانیان دەدانێ و بەودیو شاردا دەیان کردنە دەرەوە بۆ ناو دارستان و بێشەڵان و چیاکان یاخود بۆ چۆڵ و بیابانەکان بڵاویان دەکردنەوە، دەبووایە تاکو مانگێك نەگەڕانایەتەوە، لەبەرئەوە ئەوانیش ناچاردەبوون بەڕاوکردنی باڵندەو زیندەوەرو خواردنی بەری دارو درەخت و گژوگیاو گەڵا خۆیان بژێنن و لەسەر برسێتی و تینوێتی ڕابێن، بەرگەی سەرماو گەرماو باران و تیشکی ڕۆژ بگرن و بەرامبەر بە

زیندەوەرو درندە شەڕ بکەن و خۆیان بپارێزن. کە مانگەکەیان تەواوکرد ئەوسا بەخۆشی دەگەڕانەوە، کەسوکاریان ئاهەنگی قەشەنگیان بۆ دەگێڕان، لەو ئاهەنگەدا بڕیاریان دەردەکردو ئەوانەیان دەکرد بەپاڵەوانانی تیرەو پاسەوانیان، بەڵام ئەوەی هەبوو ئەگەر یەکێك پێش ئەو ماوەی (٣٠) ڕۆژە بگەڕایەوە کەسوکاریان لایان ئەنگ بوو بە داوەشینیان دەزانی، بۆیە دەیان کوشتن، واتا دەبووایە ئەو بەینە بەو ڕووتییە ئەو چەوریەیان بە لەشەوە نەمایە، بێگومان بەو ماوەیەو بەو جوولاندنە لەبەر سەرماوگەرماو لەئەنجامی هاتوچۆو تێکۆشاندا گیانیان بەهێز دەبوو، ماسولکەکانیان توند دەبوون، دژی نەخۆشی و ناخۆشی ڕادەهاتن.

بادن باول کە ئەم کردەوە ئازایانەو شێرانەی لەم منداڵانە دی، کاری تەواوی تێکردو کەوتە وردبوونەوەو لێکدانەوەو وتی:" ئەگەر بێتو لاوان و گەنجانی هەر گەلێك بەگوێرەی بەرنامەیەکی ڕێکوپێك مەشقیان پێ بکرێت و ڕابهێنرێن و وەك ئەوان بەهێزو قاڵ ببن لە ژیاندا، دەتوانن ڕێگای خۆیان بگرن".

بەشی دووهەم: کەشافە لەکاتی ئینگلیزەکاندا دەڵێت:" لەساڵی (١٩١٨)دا یەکەمجار لە شاری بەغدا حەوت تیپی کەشافە پێکهات لە قوتابخانەکانی (بارودیە، حەیدریە، فەزڵ، باب ئەلشیخ، کەرخ، ڕەئس ئەلقەریە، کلدان)و لەساڵی (١٩١٩)دا ئاهەنگێکی گەورە بۆ ئەم تیپانە گێڕا، لەبەینی ساڵەکانی (١٩٢٠-١٩٢١) ژمارەی تیپەکان لە هەموو عێراقدا گەیشتە (٤١) تیپ."

بەشی سێهەم: کەشافە لە کاتی حکومەتی نیشتمانیدا:

کە بەشێوەیەکی ڕەسمی پێکهێنانی دیدەوانی لەم سەردەمەدا لەساڵی (١٩٢١)ەوە دەستی پێکردو یەکەم لێپرسراوی دیدەوانی لە عێراقدا مامۆستا (جەمیل ڕاوی) بووە کە لەساڵی (١٩٢٩)دا نێرراوە بۆ (لەندەن) کە لەوێ بەشداریی کۆنگرەی کەشافە بکات و نوێنەری عێراق بێت، دوای ئەویش مامۆستا (عەبدولکەریم عەسیران) دەڵێت:" لە بیستەکاندا لەشوێنێك کە پێی دەوترێ (جادرییە) [illegible] بۆ ماوەی

سێ حەفتە بۆ مامۆستایانی وەرزش کرایەوە کە فێری کاروباری دیدەوانی ببن. ئیتر دوای ئەوە پەیتا پەیتا خێوەتگای کەشافە پێکهاتووە بۆ مامۆستایان و لەساڵی (١٩٣٨)دا (فتوە)ش بۆ لاوو گەنجانی قوتابخانەکانی ناوەندو سانەوی خرایە پاڵ کەشافە، بەڵام ئەمە تا ساڵی (١٩٤٨)ڕۆیشت و دوای ئەوە فتوەیان هەڵگرت.

## سەیرانی قوتابخانەکان لە بەهاردا

زۆربەی قوتابخانەکان هەموو ساڵێک لە بەهاردا سەیرانێک و ئەگەر بەهارەکەی تەڕوبڕبووایە دوو سەیرانیان پێکدەهێنا، ئەمەش لە مانگی نیسان و مایسدا دەبوو، بەجۆرێک بوو بوو بەدابونەرێتێک لە هەموو شوێنێک پەیڕەوی دەکراو شوێن بەگشتی لە وەزارەتی (مەعاریف)ەوە دادەنرا. ئەوەی من لەم وتارەدا باسی دەکەم سەیرانی قوتابخانەکانی سلێمانییە، چونکە خۆم لەو ساڵانەدا لە قوتابخانەدا دوا پلەی سەرەتایی و قوتابی ناوەندی بووم و خەریکبووم ئامادەییم دەبڕی.

مەبەست لەم سەیرانانە ئەوەبوو: کە قوتابی دوای ئەرکی چەند مانگەی خوێندن و خوێندنەوەو کۆشش، بایەکی باڵی خۆی بدا، لەو دەشتە هەوایەکی پاک هەڵمژێت. هاتوچۆکەش لەبەرئەوەی بەپێ بوو وەرزشێکی باشبوو بۆ قوتابی و بۆ ساخی لەش و ئەندامەکانی، جگەلەوەی یەکێتی و یەکسانی و پەیڕەوی (نزام)ی پیشان دەدا، بەوەدا کە لە سەیرانگا هیچ فەرق نەبوو لە بەینی قوتابی هەژارو دەوڵەمەند، خواردن تێکەڵ دەکرا، جاری وا هەبوو مامۆستاکانیش خواردنیان نەدەهێنا لەگەڵ قوتابییدا بەشدار دەبوون و پێکەوە نانمان دەخوارد.

سلێمانی لەساڵەکانی چلدا وەک ئێستا تەشەنەی نەکردبوو، بەمجۆرە گەورە نەبوو، بۆیە ئەو شوێنانەی سەیرانگا بوون ئەمڕۆ هەموو پڕبوونەتەوەو شوێنەواریان نەماوەو ڕەنگ هەیە زۆرکەس هەر نەزانن ئەو شوێنانە هەبوون یان نا.

زیاتر سەیرانکەر دەچوون بۆ کاریزی وەستا شەریف و سەرچنارو گویزی چەمی چەق چەق و تانجەرۆو قلیاسان و بەکرەجۆو چەمی کۆستەو قزریە شکاوو کانیباو کانی ماسی و پیرمیکائیل و هۆمەرەکویر... ئەگەر زیاتر برۆشتنایە بۆ ئەزمرو چایخانەکەی ئەوسای گویژە. خۆ ئەگەر بە ئۆتۆمۆبیلیش بووایە لۆرییەك بەکری دەگیرا، بۆ پردەکەی زەلم، واتا ریگای هەلەبجە. بەریوەبەری قوتابخانەو مامۆستایەکی لە هەموان بەتەمەنتر لەگەلیدا لەپیشەوە سوار دەبوون، باقی مامۆستایان و قوتابیان لەدواوە، بەشەرقی وتن(گۆرانی نیشتمانی و نەتەوایەتی) ئەو ریگایە دەبرِرا تا شوینی سەیرانگا. ئەگەر بلیم سەیرانکەر ئەوسا دەچوونە مشیراواو سەرەویس کە ئیستا شوینیان دیار نییەو نەماون، رەنگ هەیە زۆرکەس بروا نەکەن، چونکە وەیس تۆزیك لە باخچەی گشتی ئیستا بەولاوەتر بوو، لامولیە بەتەواوەتی لای ئوتیل ئاشتییەوە بوو. مشیرئاواش لەپال ئەو گردەدا بوو کە ئیستا مالی پاریزەر (کاك کەمال عارف حیکمەت)ی پیوەیە.

ئەو خواردنانەی بۆ سەیران دەبران:—

هیلکەی کولاو، یاپراخ، خورماورین، جارجاریش برنج و جۆریك شلە، بەلام زۆری هەرشتی سورەوەکراو بوو وەك شفتەو کفتە عورفایی و قاورمەی گۆشت کە هەندیك مال لە زستاندا دەیان کرد، ئەوەندە بەتام بوو دەست و دەمی پیوە دەخورا، ئەمە جگەلە پیخۆر وەك ترشیاتی تەپەچنەو تەرەپیازی چواریاخ، هەر کەسەش بەشی خۆی گەلیك زیاتر شەکرو چای دەهیناو قۆری و سەماوەریش دابەش دەکرا بەسەرچەند کەسیکدا هەریەکە یەکیکیانی دەهینا. دۆلکەی کەشافە هەبوو، لە سەیراندا چا لەوانەدا دەخورایەوە، ئەو دۆلکانەش دەکران بە پشتینی بەرگی خاکی کەشافەدا، هەرچەندە ئەوسا بەزۆری جلوبەرگی کەشافە باوبوو، بەلام ریگا دەدرا بەرگی کوردیش لەبەر بکریت ئەو سەردەمە سەر میزو مشەمای نایلۆن نەبوو بکرین بە (سفرە). زۆر زۆر بیووایە کلیمیك کە قوتابی دەیهینا بۆ راخستن، ئەوە

دەتەکێنراو ڕادەخرا ئینجا خواردنەکانی کە لەو ناو قاپ و (سەفەرتاسی)و مەنجەڵی بچووکدا بوون لەسەری ڕیزدەکران. تاکو مامۆستاکان نەیان وتایە فەرموون کەس دەستی بۆ خواردن نەدەبرد، کە خواردنی ئەو ژەمە تەواو دەبوو پاشماوەکەی هەڵدەگیرا بۆ عەسرو نزیك گەڕانەوە، ئەوسا ئەوەی مابۆوە دەخوراو قاپەکان دەشۆران و دەخرانەوە توریەکانەوە.

جاری واش هەبوو پارە کۆدەکرایەوەو گۆشتی پێ دەکڕا لەگەڵ هەیتوهووتی برژاندن، لەبەرئەوە لەم جۆرە سەیرانانەدا کەس خواردنی تایبەتی لەگەڵ خۆیدا نەدەهێنا.

ئەو یارییە خۆمانیانەی لەو سەیرانانەدا دەکران ئەمانە بوون:—

هەڵپەڕکێ: چونکە وەك دەڵێن و باوە (هەر دوو کورد یەکیان گرت، سێهەمەکەیان هەڵپەرکێ و یاپراخە) کە ئەمەش بەڕاستی زەوقی گەل بەرامبەر بە ڕابواردن و خواردنی خۆش پیشان دەدا.

ئاشەبەتەنوری: لەبەینی دوو تاقمدا ژمارەیان بەقەد یەکتر بێت تاقمێك سوار دەبێت، تاقمێك دادەبێت. ئەوانەی دادەبن بەپێوە خۆیان تۆزێك دەنوشتێننەوەو سەر سەرشانی یەکتری، یەکێکیان سەری پشتێنێکی جلی کوردی یا پەتێك دەگرێت، سەرەکەی تری بە دەستوەستا یاخود سەرۆکی ئەو تاقمەوەیە. کە یاری دەستی پێکرد هەر یەکێك لە تاقمەکەی تر هەوڵدەدا خۆی فڕێ بداتە سەر کۆڵی یەکێك لەوانەی دابوون، بەمەرجێك شەقی وەستای بەرنەکەوێ، چونکە وەستای (دابووەکان) کە سەری پشتێنەکەی بە دەستەوەیە، هەر لەو کەوانەیەدا بەقەدەر درێژی پشتێنەکە دەسوڕێتەوەو دابووەکان دەپارێزێت کە کەس خۆی هەڵنەداتە سەر کۆڵیان، ئەگەر شەقی بەر یەکێك لە تاقمەکەی تر کەوت لەکاتی خۆ هەڵدانیدا یاخود لە دابەزیندا ئەوا ئەو دەستەیە تێدەکەون و دەبێ ئەوان دابن.

دای ماسۆن: نازانم ئەم ناوە لە چ زمانێکەوە هاتووە؟! بەڵام بەوەدا کە (ئیکی ساسۆن)ی لەگەڵدایە، دەبێ یاری سەردەمی عوسمانیەکان بێت. ئەمە یاری مەلاو فەقێکانی مزگەوت بوو، تاکو شاعیری پایەبڵند (سەید ئەحمەدی نەقیب)یش لەشیعرەکانیدا باسی کردووە، ئەم یارییە لای خۆمان (سێ بازو دابوون) دەگرێتەوە.

نەقیب ئەفەرموێ:

لە سێ بازایە دڵ بازی دەکا ناگاتە مەقصودی.

لە بۆ پیرێژنی دنیا ئەگەر دانابێ دانابێ

لەم یارییەدا ئەوەی کە تێدەکەوێ (کە دەدۆڕێ) دادەبێ، دابوون ئەوەیە خۆی دەچەمێنێتەوەو بەهەردوو دەست قولەپێی خۆی دەگرێ، هاوڕێکانی بازی بەسەردا دەدەن ئەوەی کە ئازاو لێهاتوو (دانا) بێت، تێناکەوێ و نای دۆڕێنێ تاکو دابێت (واتا بچەمێتەوەو بازی بەسەردا بدەن)

لاسایی مامۆستاکان: ئەمە گیانێکی دیموکراتیانەی ئەوسای بەینی مامۆستاو قوتابی بوو. قوتابی بەقسەی خۆش و بێ ڕق وکین لاسایی مامۆستای دەکردەوەو ئەگەر کەموکورییەکی ببووایە لە قوتابخانەو لەپۆلدا بەشێوەی گاڵتەوگەپ دەری دەبڕی. بەمە مامۆستاکەش پەندی وەردەگرت و جارێکی تر ئەو خەتایەی دووبارە نەدەکردەوە.

(حەکە)ی خوالێخۆشبوو، واتا (ئەوڕەحمان کەریم) یەکێك بوو لە قوتابییە قسەخۆش و قسەلەجێ و قۆشمەکان. جارێك لە سەیرانی لای کارێزی وەستا شەریفەوە بووین، جۆگەیەك ئاو هاتە ڕێمان کە بەری بەرین بوو، هەندێکمان پێڵاومان داکەن و خۆمان لێهەڵکردو پیا پەڕینەوە، هەندێکی تریش بەباز خۆیان گەیاندە ئەو بەرەوە. مامۆستایەکی بەڕێزو خۆشەویستی هەموولایەك هەبوو، ئەو مامۆستای وەرزش و سەرپەرشتیکەری زۆربەی سەیرانەکانمان بوو، پیاوێکی بالاّ مامناوەندی بوو ئەویش پێی نەنگ بوو قاچ ڕووت بکات و وەك منداڵەکان بەئاوەکەدا

بپەڕێتەوە، چوو لە دوورەوە گوڕ بپەستێتەوەو بازیدا، هەرچەندە زۆرمان لێکردو وتمان ئێمە لە ئاوەکەدا (بۆت دادەبین) بەسەر پشتماندا بپەڕێرەوە، بێ سوودبوو، چونکە نەک هەر مامۆستا بوو، بەڵکو باوکێکی دڵسۆزی قوتابی بوو، بەگوڕهات و بازیدا، بەڵام بەداخەوە نەگەیشتە قەرلخی ئەوبەر جۆگە ئاوەکە، بەڵکو کەوتە ناو ئاوەکەوە حەکە لەوناوەدا بوو، گورج وتی:" گوود بۆی بپێون" مامۆستا بەوە گەلێک ڕقی هەستا، بەجلی تەڕەوە، ڕایکرد بەشوێن حەکەدا بیگرێ و لێیبدا، نەمان هێشت و دامان ئاو وشکمان کردەوەو هێنامانەوە سەرخۆی. ئەو ساخۆی دەستیکرد بە پێکەنین و حەکە هات دەستی ماچ کردو ئەویش وەک باوکێکی دڵسۆز هیچ شتێک لە دڵیدا نەما.

ئینجا بابزانین ئایا ئەوەی حەکە وتی لە کوێوە هاتووە..؟ مامۆستای وەرزش لە سلێمانی، چونکە زیاتر تێکەڵی قوتابی دەبوون، ئیتر بەڕاستی وەک باوک و کوڕیان لێدەهات، بۆیە ئەوەندەی تر دڵسۆزیان دەنواندو ئەگەر قوتابییەک هەنگاوێکی لە دنیای وەرزشدا بۆپێشەوە بنایە ئەوان وەک دەڵێن گەز گەز باڵایان دەکرد. قوتابی کە خۆیان تاقی دەکردەوە لە بازداندا و لەژێرچاودێری مامۆستادا، ئەگەر مامۆستا بازی یەکێکیانی بەدڵ بوولیە واتە شەقاوێکی باشی ببڕیایە مامۆستا لە کانگای دڵەوە پێی خۆش دەبوو، بۆیە گورج بە قوتابییەکانی تری دەوت کە شریتی پێوانیان بە دەستەوە بوو (گوود.. باشەی ئینگلیزی)— (بۆی بپێوون) بۆ نموونە قوتابییەک کە (قادر بەگ) کوڕی (نوری بەگی ساحێبقڕان)بوو، بازی باشی دەدا، خەڵک دەیان وت: قادر بەگ بەپێ دەفڕێت لە باتی باڵ.

هەروەها لە قوتابییە دڵسۆزە ئیش ڕاپەڕێنەرەکان، خوالێخۆشبوو (عوسمان دانش)بوو، بەڵام کاک دانش بەلای یاری و وەرزش و شتی وادا نەدەچوو، ئەو پسپۆڕی خواردەمەنی بوو، بۆیە هەمیشە سەرپەرشتیکردنی کارویاری خواردنی سەیران بەو دەسپێررا، ئەویش بەدڵی فراوانەوە ئەو ئەرکە قورسەی دەگرتە

ئەستۆی خۆی (یاخوا وەچەکانی خۆش و سەرکەوتوو بن) ئەو گۆشتەی ئەو دەیبرژان و ئەو چێشتە تەوپرەی ئەو لێی دەنا بەو رۆنە خۆمانەیەی کە لای (حەمەی شازەمان) دەکڕاو ئەو برنجی بازیانە کە بەتەواوەتی لە مەنجەڵدا خۆی رادەکێشا، وێنەیان نەبوو! بەڵام کاکە عوسمان لەپێشدا خۆی دەبوایە بەرکوڵێکی باشی بکردایە ئینجا خواردنی بە ئێمە دەداو لەگەڵ ئێمەش تێهەڵ دەچۆوە، بەڵام چۆن دەستێکی دەوەشان. خوالێخۆش بێت جارێکیش سەیرانێکمان کرد بۆ قۆریەشکاو (شوێن گەرەکی مامۆستایان تا لای نەخۆشخانەکەی ئێستای (عەلی ناجی) قوتابیەکی کۆییمان لەگەڵ بوو (ئەوسا لە قوتابخانەی ناوەند بووین) بە تەمەن گەورە بوو، دەستی شیعریشی هەبوو ناوی (حیلمی)بوو. کاك حیلمی بەدەم هەڵپەرکێوە کە سەرچۆپیەکەی گرتبوو پارچەیەکی دووروودرێژی خوێندەوە، هەر ئەوەندەم لەبیر ماوە کە زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی تێکەڵ دەکردو دەیوت:

— ستەدی ستەدی یافتی ئیکزمنەیش قد أتی تیچەر مایدری، متی... کەوچکەنا، شئی طویل أبیض... بەمجۆرە دەیهۆنیەوەو (وەصفی) گەلێك شت و رووداوی دەدا بەشێوەیەکی زیرەکانەو (ساخرانە).

پێش ئەوەی کۆتایی بە باسەکە بهێنم ( کەباسێکی گەلێك دووو درێژە)، چەند دێرێکم لە رێکخراوی یەکێك لە شاعیرە بەرێزەکانمان لەبیرە حەزدەکەم لێرەدا بیگێرمەوە، چونکە ئەویش دووروودرێژ (وصف)ی سەیران و سەیرانگاکانی دەکات، خۆزگە ئەگەر یەکێك هەمووی لەبیر بێت بڵاوی دەکردەوە. رێکخراوەکە ئەمەیە... چوارشەموان هەرایە، رۆژی بەزم و صەفایە، حوریەت ئاشکرایە، ژیانی ئەورووپایە، کاشکی هەروابوایە.

پیرمیکائیل ببینە، دڵگیروخۆش و شینە، جێی نازو نازەنینە، سەیران و پێکەنینە.

جێ هـەر قۆریەشکاوە وێنـەی خۆینـە بینـراوە، بڕوانـی لەهـەر لاوە، جێـی چـنارو لاولاوە(مەبەستی کوڕوکچە).

یارم هەموو بەهاران، پێکەوە بچینە سەیران
بە خۆشی خزم و یاران، هەر ئاوابێت نیشتمان

## گۆرانیەکانی وەرزش و دیدەوانی

لەهـەموو قوتابخانەکانـدا پێویـستبوو ڕۆژانـی پێنجشەممە پـێش ئـەوە قوتـابی دەستبکەن بەدەرس خوێندن، هەموو ڕیز بن قوتابییەك بەبـەرگی کەشافەوە ئـاڵای نیشتمانی عێـراق هـەڵبکات و ئاڵاکـە بشەکێتەوە. ئـەو قوتابیـەی ئـەو ئیشەی پـێ دەسپێرا دەبووایە قوتابییەکی زیرەك و ڕوقایم و بەتوانا بووایە، شیعرێك لـەو شـیعرە ڕێکخراوانەی بخوێندایەوە کە بۆ ئاڵا وتـراوەو دەبووایـە خوێندنەوەکـەش بـەجوانی و دەنگی بەرزو دەست و خۆ جوڵانەوە بووایـە، دوای ئـەوە قوتابیـانیش گۆرانیـەك بـە عەرەبی و یـەکێك بـە کـوردی یـاخود هـەردووکیان بـەکوردی بەمـەرجێك لـە هـەردوو حاڵەتەکەدا دەبووایە گۆرانییەکیان بـۆ ئاڵاکـە بووایـە. گۆرانییـە عەرەبییـەکان وەك (هذا العلم)و (یاعلم الامه أنا معك)...

جا بۆئەوەی ئەو گۆرانییە کوردییانەی ئەو سەردەمە بـاوبوون نەفـەوتێن و لـەبیر نەچنەوە کە سەردەمی کۆنتریش (شەرقی)یان پـێ دەوتن کە ئەمـە نـاوی سـەردەمی عوسمانیەکانە، هەندێکیان بەیاد دەکەمەوە کـە هـەموو پـڕن لـە نیشتمانپەروەری و دڵسوزی لەگەڵ ناوی ئەو کەسانەی کە ئـەو (نـشید)انـەیان بـە شـیعر دانـاوە. ئەمـە جگەلـەوەی کـە شـیعری زۆریـش بـۆ کـشافە– دیـدەوانی دانـراوەو زۆریـەی ئـەو شـیعرانەش لەلایـەن مامۆسـتای گـەورەو نیشتمانپەروەر مـەلا عەبـدوڵا (زێـوەر)ەوە دانراون وەك:

ئێمە کەشاف و براین، جان نسارانی وەتەن
ڕێگەمان ڕێی حەق و سیدقە، یەك بەیەك پۆلا بەدەن
کردەوەی کەشافە، ڕاستی و عەهدو وەفا
سایەبانمان لوتفی خوایە بێغەم و جەورو جەفا
کردەوەی کەشاف، پیشەیی کەشاف سەعی و غیرەتە
ئێمە کەشاف و براین، جان نسارانی وەتەن
ڕێگەمان ڕێی حەق و سیدقە، یەك بەیەك پۆلابەدەن
حورە کەشاف، ڕۆحی پاکە، قەلبی صافە وەك بلور
جان فیدایە، بۆ وەتەن، پڕ عەزم و چالاك و جەسور
کردەوەی کەشاف، پیشەیی کەشاف، سەعی و غیرەتە

مامۆستا زێوەر ئەم شیعرەی ڕێك دەخست، خۆشی ئاگاداریوو لە قوتابخانەو کشافەو وەرزش، چونکە خۆی مامۆستای قوتابخانە بوو، بەڕێوەبەرو مامۆستای قوتابخانەی بەرزنجە بوو لەساڵی (١٩٣٦)دا کە خۆم لەو قوتابخانەیەدا قوتابی بووم لەکاتێکدا کە باوکیشم لەبەرزنجە فەرمانبەر بوو.

ئەمەش شیعرێکی مامۆستای نیشتمانپەروەر فائق بێکەسە هەر لە بابەت کەشافەوە:

ئێمە کە شافەی کوردین  هەموو بەدەس و بردین
بۆ بەجێ هێنانی خزمەت  چست و چالاك و گورجین
ئەمڕۆ ڕۆژی غیرەتە  وەختی هەوڵ و هیمەتە
با هەموومان تێبکۆشین  دەربچین لەم وەحشەتە
ئێمە کەنەوجەوانین  هەر بۆ خزمەت خولقاوین
بۆ هەموومان لازمە  قەدری وەتەن بزانین

بێگومان بێکەسیش وەك مامۆستا زێوەر هەر مامۆستای قوتابخانە بوو تاکو ساڵی (١٩٤٨) کە فەرمانی یەزدانی لە هەڵەبجە بەجێ هێناو لەسەر ئەو شیعرە نیشتمانیانەی چەند پەتپەتی پێکراو گیراو دوورخرایەوە بۆ خوارووی عێراق و هێنرایەوە.

ئینجا دێینە سەر ئەو گۆرانیانە (شرقی– نشید)ی لەساڵەکانی بیست بەدواوە تاکو پەنجاکانیش لە قوتابخانەکاندا بڵاوبوون.

١ـ (پیرەمەگروون. شیعری– مامۆستا زێوەر. وەزنی: بزیرنجی الابدنزونی تورکی).

پیرەمەگروون مقدسی          دۆستی دایمی کوردی
بەم مەنزەرەی شیرینەوە          دافعی سەد نەوع دەردی
قامەتی بەرزی تۆ          دلمەنی سەوزی تۆ
نیشانەو ڕەمزی تۆ          باعیسە لەبۆ نەهێشتنی میحەن
فەسلی زستان بەرگی سپی          ئەپۆشی و چویتە عاسمان
سەیری هەموو دنیا دەکەی          تۆی شاهەنشای شاخەکان
کۆمەڵی گەوهەری          هەیکەلی زەفەری
لابەری کەدەری          باعیسە لە بۆ پێشکەوتنی وەتەن
چونکە دۆستی ئاجدادمانی          نووری چاوی کوردانی
بەردت هەموو، دانەی گەوهەر          لائقی فەخرو شانی
قامەتی بەرزی تۆ          دلمەنی سەوزی تۆ
نیشانەو ڕەمزی تۆ          باعیسە لە بۆ نەهێشتنی میحەن

٢- (تانجەرۆ. شیعری- مامۆستا بێکەس. وەزنی: مارشی تایبەتی)

ئەی تانجەرۆ، کەوسەری هەموو خاکی کوردستانی خۆمانی
بەر ئاوی تۆ، سەریەرزی و خێر، پڕ دەغڵودانی زۆر جوانی
توصیفی تۆ قەت نایەت تەحریرو نووسین
هێندە پڕ فائدەی جوانی باعیسی فەخری کوردانی
خوڕەی ئاوەکەی تۆ، هەموو غەمێك لەدڵ ئەبا
سەوزایی دەردی تۆ عالەمێك پڕ سرور ئەکا
مەنزەرەی تەبیعی، هامتای بەهەشتی فیردەوس ئەکا

٣ـ (عیلم. شیعری- م. نوری واتا ( شێخ نوری شێخ صاڵح)و عەلی کەمال واتا (عەلی باپیر ئاغا). هەردووکیان پێکەوە دایان ناوە، لەسەر وەزنی گۆرانی: ئەی وەتەن
عیلمە میللەت نائلی جاهو شکۆوشان ئەکا
دایەی پاکیی وەتەن، پڕ نەشئەو و خەندان ئەکا
واستەی عیلمە بەشەر ئەمڕۆ، کەمانەند؟ تیور
ولەسەر ئەوجی سەماوە، سەیر ئەکاو تەیران ئەکا
واسیتەی عیلمە، کەئەمڕۆ، هەر وەکو ماسی بەشەر
کەشفی قەعری بێکرانی، بەحری بێ پایان ئەکا
واسیتەی عیلمە، کەکولومب ناوی دائم زیندوە
واسیتەی عیلمە، کەواستو کەشفی هندستان ئەکا
واسیتەی عیلمە، کە پێنجوینی و زەهاوی و مەولەوی
ناوی پاك و عالیان ئەحیای کوردوستان ئەکا
ئەم حەدیسە بۆ عیلم، تەرغیبی ئینس و جانئەکا

٤ـ (ئەی وەتەن. شیعری– مامۆستا زێوەر، وەزنی لەسەر نەشیدی (نحن لم نخلق)..

ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی، ڕۆحی شیرینی منی

مەزرەعەی توخمی نشاتی و باعیسی ژینی منی

بێتوگەر من کۆمەکەنیم وەسلی شیرینم بێ

تیشەئێ نادەم لەبەردی، تۆی کە شیرینی منی

گەرچی ئەرزی، هێند بڵندی، وەختە لای‌من بچیە عەرش

واسیتەی سەربەستی، و جێگای ئایینی منی

ئیفتیخاری میللەتی، تۆی مادەرێکی میهرەبان

خوا هیلالیشی بەتۆدا ماهو پەروینی منی

ئەو بەهاران بەو هەوای زۆر سافەوە وەك جەننەتی

فەسڵی زستانیش سەراسەر باخی نەسرینی منی

بۆچی من جسم و گیانی خۆم بە شاباشت نەکەم

خاکراهو حوکمڕانی عیزو تەمکینی منی

ئارەزوو و فیکری سیاحەت ناکەم ئیتر ئەی وەتەن

تۆ لە جێگای قاهیرەو تاران و بەرلینی منی

٥ـ (بولبول. شیعری– مامۆستا زێوەر. لەسەر وەزنی بەهاران چ مەحزوون)

مەناڵێنە بولبول کەوەختی فوغانە

لەسەرچڵ، نەماگوڵ، نیشانەی خەزانە

دەربەدەربە، خاك بەسەربە، تاکوماوی بێزەرەربە

وەتەن بانگی کردم، بە ئاوازی مەحزوون

کەوا ئەوەڵی سوبحە، هەستە بەیانە

خوێندنت بێ، غیرەتت بێ– تالە دنیا حورمەتتبێ

٦ـ (ئێمە وا دانما. شیعری– مامۆستا زێوەر. وەزنی: (هکذا دائما نمشی..).

ئێمە وا دائیما، بەدڵ و بەگیان

سەعی ئەکەین، هەوڵ ئەدەین بۆ تەرەقیمان

تاکو خزمەت بکەین، بۆ وڵاتمان

بۆ تەعالی بۆ تەرەقی، فەرزە ئیجتیهاد

بێ ئەزیەت، بێحەمیەت، ناگەینە مراد

شەرتە بۆ میللەتی، بێ عیلم و بێکەس

شەوو ڕۆژ تێکۆشێت نەفەس بە نەفەس

لەگەڵ هاو قەومدا دەست بخاتە دەس...

٧ـ (بولبول. شیعری– مامۆستا زێوەر. وەزنی (سمعت شعرا للعندلیب).

بولبول بەنەغمەی دلکێش و خۆشی

گوڵزاری پرکرد دەنگ و خرۆشی

بانگیکرد خەڵقە، سەربەست خوڵقاوم

لەم باغ و دەشتە ڕووناکە چاوم

بەشەوق و خۆشی لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ

بەهەوەس ئەچم لەم چڵ بۆ ئەوچڵ

لەناو درەختا، ئەکەم هێلانە،

سەرم سێبەرە، فەرشم گوڵانە

کە، بای سەحەر، ئەشنێتەوە

لقی گوڵەکان ئەلەرێتەوە

چەندم پێخۆشە، نەغمەی ئازادی
بۆخۆم ئەخوێنم بەشەوق و شادی

٨ـ (نەورۆز. شیعری– پیرەمێرد. وەزنی(هیا نهوضا للعلی)
مژدەبێ ساڵ گەڕایەوە– ئاگری نەورۆزکرایەوە
بەفری زستان توایەوە– گژوگیاو گوڵ ژیایەوە
نوخشەبێ لە کوردی هەژار
گوڵ لەباخدا، خۆی ئەنوێنی– بولبول بەڕوویدا ئەخوێنێ
هەور مرواری، ئەپرژێنێ– شەماڵ، زیندەگانی دێنێ
نێرگس مەستەو چاو بەخومار
وانەرشی چیمەن، راخرا– گوڵاڵە، بوو بەشەوچرا
گوڵ دەستیان بەست وەکبرا– نەسرین و لاولاو تێکچڕا
هاتنە لەنجە، سەروو، چنار
بولبول شەو بەئاواتەوە–بادەی شەونم ئەخواتەوە
دەڵێ، وا نەورۆزهاتەوە– یەزدان دەرووی لێ بکاتەوە
ئێمەش پێبکەوینە بەهار
وا جەژنی ڕاستەقینە کە نەورۆزە هاتەوە
یەزدان گەشایش بە بەهارمان بداتەوە
سەر هەرچڵێ، بە نەوایەکی بلبلی
بەزمێکی جەم بێ پێکەوە، شاد بێ هەموو دڵی
وەتەن پێی ببێ بەگوڵزار

٩ـ (هەڵسانی دەمی بەیانیان. شیعری– پیرەمێرد. وەزنی (اقوم فی الصباح قبل الشمس)

چەند خۆشە هەڵسانی دەمی بەیانیان
بۆ رۆحی صاف، نور دەبارێ لە ئاسمان
لەجێ هەستام، جریوەی چۆلەکەهات
چاوم شت و جلمگۆڕی ڕۆژ هەلآت
چام خواردەوەو، جانتام گرت بەدەستەوە
گەیشتمە مەکتەب، چوومە صنفی دەرسەوە
شکور چابوو، بەدەرسما گەیشتم
دیتەزوو هەڵسابووم، چاك تێگەیشتم
بۆیە حەز لە خوێندن و مەکتەب ئەکەم
بە خوێندن ئاوا دەبێ وڵاتەکەم

١٠ـ(مکتب):

مەکتەبە چاوی وەتەن و بیبیلەی روونی میللەتە
گەرنەبێ مەکتەب، وەتەن کوێرێکی ساحێب زیلەتە
خەڵقی تازەپێگەیشتووی، میللەتن ئەم مەکتەبە
هەروەکو باخە، موعەلیم باخەوانی جەننەتە
بورجی ڕۆژی ئاسمان و دەوڵەتە مەکتەب ئەگەر
ئارەزووتانە وەکو ڕۆژ شوعلەدەرین فرسەتە
تربیە و تعلیم ئەباتە ریزی انسان وەحشیان
بێ علم انسان لە ژێر باردا خەریکی وەحشەتە
میللەتی کورد، وابەشیدەت، چاوەڕوانیمان ئەکەن

تێبگەین و پێبگەین، زەحمەت نەتیجەی ڕەحمەتە
هەردەمە تامێ ئەدا، هەرچی بچێ ڕقیمەتە
هەرکەسێ مەکتەب بەجێیەکی مقدس دانەنێ
بزانە کە ئەو کەسە محکومی موت و نەگبەتە

١١ـ (تازە گوڵی چیمەنین. شیعری– پیرەمێردی نەمر. وەزنی (یا بنی العراق استفیقوا).

تازە گوڵی چیمەنین بەرخە کۆرپەی وەتەنین
ئێمە کەدەستەی کچین هەمو بۆ مەکتەب ئەچین
پێغەمبەر خۆی فەرمویە بەهەشت لە ژێر پێی دایکانە
بەڵام دایك ئەوانەن عیلم و فەنیان ڕەوانە
تا سەویەی کچانمان بەرز نەبێ لە ئیدراکا
ئەولادی چاك پێناگا وەتەن تەرەقی ناکا
ئێمە حەز لەشەرناکەین بەهیوای خوێندن وچاکەین
نەتەوەی باش پەیداکەین وێرانەمان ئاواکەین

## قوتابخانەی (ڕوشدیەی عەسکەری) لە سلێمانی

ئەم قوتابخانەیە بەهیمەت و هەوڵدانی هەرە گەورە پیاوی کورد (سەعید پاشای خەندان) هاتەدی، (حسین پاشا)ی باوکی یەکە پیاوی سەردەمی بابانەکان دوای (ئەحمەد پاشای بابان)بوو. کە میرنشینی بابان لەلایەن عوسمانیەکانەوە تێکدراو ئەحمەد پاشاو دەستەو دایەرەیان بەرەو (ئەستانە– ئەستەمبوڵ)برد، حسین بەگ لەگەڵ پاشادا ڕۆیشت ڕۆژێك کە سەعیدی کوڕی حسین بەگ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو

هەواڵی باوکی دەپرسێ، دایکی بەگریانەوە وەڵامی دەداتەوە کەوا لەگەڵ پاشادا بردیانن بۆ ئەستانە، دەمودەست سەعید وڵاخێك لە حەوشەکەیانا بەسراوەتەوە دەچێت زینی دەکات و سوار دەبێ، هەرچەند دایکی تکای لێدەکات نەڕواو بەجێیان نەهێڵێ بێ سوود دەبێ بەغار دەڕوات لەولای کانی شەیتانەوە بە باوکی و ئەوان دەگات هەرچەند ئەویش پێی دەڵێ بگەڕێرەوە ئەمە ڕێگای هاتونەهاتە بێ سوود دەبێ لەگەڵیان دەڕوات، بەڵام کە دەگەنە ئەستانە لەڕاستیدا سوڵتان ڕێزێکی زۆریان دەگرێت و سەعید دەخەنە قوتابخانەی (حەربیەی سوڵتانیە) کە تایبەت بووە بە دەستەو دایەرەی سوڵتانەوە.

سەعید وردە وردە کە لە قوتابخانە دەردەچێت پێشدەکەوێت و دەگاتە پلەی وەزیری دەرەوەو سەرۆکی ئەنجومەنی (ئەعیان)و سەدەها پیاوی لە کوردەکانی خۆمانی پێگەیاندو یارمەتی ئەو کوردانەی لە ئەستانە بوون دەدا ئەم پیاوە باوکی (شەریف پاشا)ی نوێنەری کورد بوو: لە کۆنگرەی ئاشتیدا لە پاریس.

قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەریەش چەپکە گوڵی سەعید پاشای ناوبراو بوو کە پێشکەشی شارەکەی خۆی کرد، چونکە ئەم مەکتەبە تەنها لە ئەستەمبوڵ و بەغداو سلێمانی هەبوو، نە لە کەرکوك و هەولێرو نە لە موسڵ نەبوو. تاکو دوای ئەویش (ئەعدادیەی مولکی– مقابل بە ناوەندی ئێستاو هەروەها ئیبتدائی مولکی) هەر لەشاری سلێمانی و بەهیمەتی ئەو پیاوە گەورەیە کرانەوە.

ئیبتدائی مولکی سێ ساڵ بوو، بەڵام ئەعدادیە پێنج ساڵ بوو کە تەواوکرایە ئەو کەسە دەچووە (حقوق) یا مەکتەبی سوڵتانی یاخود بە مووچەخۆر دادەمەزرا.

ڕوشدیەی عەسکەری کە لە سلێمانی کرایەوە، سەعید پاشا وای لە قەڵەمدا کە قوتابییەکانی سلێمانی هەموو بەتواناو زیرەکن و شایەتی قسەکەشی پیاوە پێگەیشتوانەی سلێمانی بوون هی ئەو سەردەمە کە لە ئەستانە بوون.

ڕوشدیەی عەسکەری سێ پۆل بوو. دەرسەکانی بەتورکی دەوترانەوە کە زمانی ڕەسمی ئەو کاتە بوو کە هەموو وڵات لەژێرچنگی عوسمانیەکاندا بوو. شوێنەکەی قوتابخانەی (فەیصەلیە)ی جاران بوو کە بازاڕی ئێستای عەسرییە لەخوار سەراوەیە.

ئەم قوتابخانەیە نزیکەی (٣٠-٤٠)ساڵ دەوامی کرد. بێجگە لە مامۆستا تورکەکان (خولجە فەنی- عەزیزی وەسماناغا) مامۆستای (خەت)بوو (مەلا سەعیدە فەنی کابان) مامۆستای دین بوو، زێوەرە فەنی شاعیر مامۆستای عەرەبی و قەواعیدی عەرەبی بوو (عیرفانە فەنی (برنجی معلم- واتا مامۆستای یەکەم) بوو. بەڕێوەبەر سەردەمێك (حاجی فەتاح ئەفەندی)بوو. ئەو پیاوە گەورانەی لەم قوتابخانەیە خوێندویانە:

(تۆفیق وەهبی، ئەمین یومنی (مامی حسێن نازم) نورئەلدین مەحمود، ئەمین زەکی بەگ، حاجی مستەفا پاشای یاموڵکی...)

هەرچی بچووایە ئەم قوتابخانەیەوە بە ئەفسەر دەردەچوو، وەك وتمان سێ ساڵ لە سلێمانی دەیان خوێند، دوای ئەوە لەسەر حسابی میری دەنێرانە بەغدا لەوێش سێ ساڵ دەیان خوێند، ئینجا دەیان ناردن بۆ ئەستەمبوڵ لەوێش هەر سێ ساڵ دەیان خوێند کە تەواویان دەکرد ئەو کەسەی زیرەك بووایە (درجە)ی بەرزی بهێنایە دەیانخستە ئەرکانەوە، دوو ساڵیش لە ئەرکان دەیان خوێند. ئەوانەی چوونە ئەرکانەوە:-

ئەمین زەکی بەگ، تۆفیق وەهبی بەگ، نورئەلدین مەحمود، حاجی مستەفا پاشای یاموڵکی، فەرج فەهمی کوڕی سەی مەحمود کە ئەویش لە دوایدا لە ئەستەمبوڵ بوویە (خزینە نازری- وەزیری مالیە)و لەم دواییەشدا (عەبدوڵڵای عەزیزی لاوە)بوو بە پاشاو سەرۆکی ئەرکانی سوپا لە ئەستەمبوڵ.

حوجرەکەی خولجە فەنی

بەبۆنەی ناوهێنانی خواجە فەنییەوە دەڵێم: خواجە لەقەبی پیاوی خوێندەواری ئەو سەردەمە بوو، خۆی ناوی (عەزیزە فەنییەو کوڕی وەسماناغای کوڕی حاجی کەریماغای ڕۆقییە)، (حاجی مەحمود سامی) خوالێخۆشبوو کە هەر لەو بنەماڵەیەیە وەختی خۆی پێی ڕاگەیاندم کە حاجی کەریماغا لە سەرەتاوە خۆی یاخود پێش ئەو لە گوندی (هۆمەرە سێنان)ی ناوچەی پێنجوینەوە هاتوونەتە سلێمانی.

خواجە فەنی خۆشی پەروەردەی حوجرەیەو لە حوجرەدا پێگەیشتووە، بەڵام چونکە زیرەك و بەتوانا بووە، ئەو حوجرەیەی کردۆتەوە کە گەلێك قوتابی پێگەیاندو زۆری پیاوە گەورەکانی سلێمانی وەك ئەمین زەکی بەگ، تۆفیق وەهبی بەگ، تۆفیق بەگی تابور ئاغاسی باوکی ئەحمەد بەگی متصرف، بابەکر ئاغای پشدەری حاجی ڕەشیدی سەعیدی قادر ئاغا، شەفیق بەگ و حەمدی بەگ کوڕانی ڕەشید پاشا، حاجی حەمە ساڵح بەگ، حەمە بەگ قادر پاشاو ساڵح پاشای مەحمود پاشا غواس، هەموو لەو حوجرە پیرۆزەدا خوێندویانە. حوجرەکە لەخوار مزگەوتی گەورەوە بوو لە کۆنە ماڵەکەی شێخ ڕەئوفی شێخ مەحمودا کە ئێستا ڕیزە دوکانە یاخود بازاڕە.

دەرسەکانی حوجرە کە زۆری بەزمانی فارسی بوون و هەندێکیشی بەزمانی تورکی (چونکە ژێردەستەی عوسمانی بوون) کوردی هەر ناوی نەبوو، تەنها (ئەحمەدی)ی حاجی شێخ مارفی نودێ نەبێ، کە فەرهەنگێکی عەرەبی– کوردی بوو، گوایە وەختی خۆی شێخ مارف بۆ حاجی کاك ئەحمەدی کوڕی دانا تاکو فێری عەرەبی و کوردی بێ و هەر بەناوی ئەویشەوە ناوی ناوە (ئەحمەدی) دەرسە فارسییەکان: گوڵستانی شێخی سەعدی و بوستان، خواجە حافزی شیرازی تاریخی نادری (نادر شاه) لەم دواییەدا هەڵگیرا، لە زۆر شوێنا باسی شکستی تورکەکانی تیادا بوو، هەروەها مێژووی فارسی لە (کەیومەرزەوە... هەتا دوایی) کتێبە

تورکییەکان: زیاتر قەواعدی زمانی تورکی بوو و هەرکەسەش بیویستایە خۆی دەرسی بۆ خۆی هەڵدەبژارد.

لە سەرەتاوە لەم حوجرەیەدا دەبووایە قورئان بخوێنرایە ئینجا (سمایل نامە) حوجرەکەش دوو لق بوو یەکێکیان بۆ گەورەو ئەوی تر بۆ بچووک، دەرسی خەت و خەتخۆشی لەم حوجرەیەدا زۆر گرنگی پێ دەدرا.

## حوجرەکانی تری ئەو سەردەمەی سلێمانی:

- حوجرەی مەلا سەعیدی زۆڵەیی (کە ئەویش هەر خولجە فەنییان پێ وتوە، چونکە خوێندەوارێکی دیارو شارەزابووە). ئەم پیاوەش بەناوبانگ بووە، بۆیە لە حوجرەکەیا: (ئەمین زەکی بەگ میرزا فەرەجی حاجی شەریف حاجی سەعید ئاغاو حاجی حەماغاو محیبینە فەنی و ئەحمەدی حەساناغاو زۆری تر) لەوێ دەیان خوێند. ئەو دەرسانەی لێرە دەوترانەوە، هەروەك دەرسەکانی حوجرەی خواجە فەنی بوون.

- حوجرەی مەلا عەبدوڵڵای گەلالە کە پیاوێکی زیرەك و بەتوانا بوو لە مزگەوتی( شێخ ئەورەحمانی عازەبانی) بوو...

- حوجرەی مەلا فەتاحە سورە (مەلا خڕە) لە گەڕەکی سەرشەقام بوو.

- حوجرەی مەلا عەبدوڵڵای هەمزە لەناو بازاڕا لای قەیسەری نەقیبەوە بوو.

سەرچاوە: لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا ئەم زانیاریانەم لە خزمی خوالێخۆشبوو (تاهر بەگی جەمیل بەگی بابان) وەرگرتووە.

# مێژووی (پیر)ەکانی سلێمانی و دەوروپشتی

چەند شەخسێك هەن کە(قسن) یان بۆ کراوەو تائێستاش هەندێك لەو قسنانە ماون. کە هەریەکە گۆڕ یا جێنزرگەی پیرێکن کە لای خەڵکەکە گەلێك پیرۆزن و لە کۆنەوەو بگرە تا ئەمڕۆش (بەڵام کەمتر) مرۆ دەچن بۆ زیارەتیان و نەخۆش دەبەنە بەریان بەهیوای چاکبوونەوەیان، جا ئایا ئەو پیرانە یاخود وەك لای خۆمان کە پێیان دەڵێن ئەو شەخسانە کێن؟

پیرەمەگرون:—

کە بەرزترین چیای نزیك سلێمانیەو بەرزاییەکەی (٩٧٠٠) پێیە لە ڕووی دەریاوە، چیایەکی بە شان وشکۆو بەسامە کە لەدوورەوە خۆی دەنوێنێ و بەفری سەر هەندێ لوتکەی ساڵ دوانزەی مانگ ناتوێتەوە.

خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی بەگ دەڵێت:" پیرەمەگرون و شاخەکانی تری وەك لوتکەکانی (چاوێ)و (باخیان)و (تەلان) هەموو لەو پاڵەپەستۆیە هاتوونەکایەوە کە لەخوارووی و ڕۆژئاوایەوە بۆی هاتووە لە ئەنجامی ڕێچوونی ئەو زنجیرە چیایەی ناوەڕاست کە سێ دۆڵی لێ پەیدابووە دۆڵی قزلەرو دۆڵی مێرگەپان و دۆڵی سورداش."

دوای ئەوە مامۆستا وەهبی دەڵێت:" ئەو شاخە لووتبەرزە سەرکێشە بەرامبەر بە هەموو ڕووداوێك وەستا، لەکاتێکدا کە خوا دەشتی سلێمانی و چیاکانی و دۆڵەکانی و چەمەکانی بە ئاژەڵ و کشتوکاڵیانەوە پیرەمەگرونی بۆ کردبوون بە سەنگەر تاکو بیانپارێزێت. پیرەمەگرونی پیرۆز کە چەندەها شیعرو گۆرانی پیا هەڵدراوەو بەرزاییەکەی بەمەتر (٢٦٨٤)مەترە."

مامۆستایان (د. تەها باقرو فوئاد سفر)یش لەم بابەتەوە دەڵێن:" پیرەمەگرون بەرزترین چیای نزیك سلێمانییەو لە کتێبی گەشتیارەکانو خەریتە کۆنەکانا ناوی بە

(پیر عومەر گدرون. واتا باپیرە عومەری وەلی) هاتووە، هەندێك لە نووسەران وادەزانن کە ئەمە چیای (نصیر)ە کە گەمێی نوحی بابلیەکانی (ئۆتۆنبشتم)ی لەسەر گیرساوەتەوەو ئەم چیایە بەناوی (نصیر شاخی گۆتی) بەناوی گۆتیەکان کە لەگەڵ (لۆلۆ)کانا لەزوودا لەناوچەی سلێمانیدا ژیاون." مامۆستا تۆفیق وەهبی لە بابەت پیرەمەگرون خۆیەوە دەفەرموێ:" پیرەمەگرون یەکێکە لە (پیرەکانی باتینی- ئیسماعیلی کۆن، یاخود پیرەکانی کاکەیی و مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەهەمی کۆچی. ڕەنگ هەیە ناوەکەی خۆی (پیر عەنبەری گودروون) بێت کە لەبنەچەدا (گوردوون)ە کەوا لە دامێنی لوتکەیەك لە لوتکەکانی شاخەکەدا نێژراوە کە ئەم لوتکە سەرکێشە لەدەوری بەردا دەیان پەرست دوای ئەوە بوویە پەرستگایەك کە قوربانیان بۆ خوای نەتەوە کۆنەکان تێدا پێشکەش دەکرد.

هەروەها مامۆستا وەهبی دەڵێت:" ڕەنگ هەیە شای بابل (نەبوخوز نەصر)کە ئێمە (بەختنەسر)ی پێدەڵێین کە بورجی عەجایەبی بابلی دروستکرد لاسایی ئەم لوتکە بەرزەی کردەوە بۆئەوەی ژنە خۆشەویستەکەی (امیتیس) کچی ئیمپراتوری شای مادەکان (ئیشتو فیگو) پێ ڕازی بکات کە سەردەکەوتە سەری بۆئەوەی خوا پەرستی خواکەیان (دیاوس پیتەر بێنێتەجێ- خوای ئاسمان)و خوای ڕووناکی و پەیمان و ڕاستی پشتگیری هەموو دۆڵ و دەروگوندو دەشت(میژە)ی بوزورگ".

ئەوەبوو ڕۆژگار وای هێنایەوە کە تۆفیق وەهبی خۆی و لەسەر ڕاسپاردەی خۆی دوای وەفاتی لە لەندەنەوە بەو هەموو ڕێگا دووروودرێژەی فرۆکەو ئۆتۆبۆمبیل و هەڵگرتنی بەسەر شانەوە هێنرایەوە سلێمانی بۆ ناشتنی لەپاڵ پیرەمەگرونا کە ئەویش لە ڕۆژی (١٩٨٤/١/١٥)دابوو. لەم بابەتەوە (کەمال ڕەئووف محەمەد) نووسیویە دەڵێت:" هەرچەندە ئەو ڕۆژە سەرەتای چلەی زستان بوو ڕۆژێکی مێژوویی بوو، چونکە پیرەمەگرونی دێرین و پیرۆز وەك سالآن بەرگی بەفری ماتەمینی نەپۆشیبوو.. نەوجەوان و پیرەکانی کوردستان و سلێمانی.. وەك پڵنگ

بەچیادا هەڵدەگەڕان.. دڵگەرم و یەك بوون بەلێدانی دڵ بەهەناسە بە تەماشا بەبڕوا... دیارە پەنهانییەك هەبوو تۆ بڵێی خەمۆ بوویێت؟ باوەڕناکەم، بەڵکو دەڵێم هەموو لە ئاهەنگێکدا بوون کە بۆنی هەزاران ساڵی پێشووی لێ دەهات بۆ ناشتن نا بۆ پێشوازیی پرشنگێکی ڕۆژی پێشکەوتن کە هاتەوە لای باپیرە گەورەی کە چەند ساڵ بوو بە جەستە نەك بەگیان لانەواز بوو. تۆفیق وەهبی لە لەندەندا دڵی جەستەی لە گیانەڵادا بوو، بەدوا هەناسەیشی دوا وشەی نووسی کە وەسیەتی: بچێتەوە ئامێزی پیرەمەگرون. مەلا عەبدوڵڵای (زێوەر) کە ڕۆڵەیەکی دڵسۆزی شارەکەیە پیرەمەگرونی لەبیرنەکردووە، ئەوەتا ئاوا پیای هەڵدەدا کە کردویەتی بەڕەمزو دەڵێت:

پیرەمەگرون مقەدسی... دۆستی دلیمی کوردی
بەم مەنزەری شیرینەوە، دافعی سەد نەوع دەردی
قامەتی بەرزی تۆ دامەنی سەوزی تۆ
نیشانەو ڕەمزی تۆ باعیسە لە بۆ نەهێشتنی میحەن
فەسڵی زستان بەرگی سپی ئەپۆشی و چوویتە ئاسمان
سەیری هەموو دنیادەکەی تۆی شاهەنشای شاخەکان
کۆمەڵی گەوهەری هەیکەلی زەفەری
لابەری کەدەری باعیسە لە بۆ پێشکەوتنی وەتەن
چونکە دۆستی ئەجدادمانی نووری چاوی کوردانی
بەردت هەموو دانەی گەوهەر لائقی فەخروشانی

ئەم شیعرە کرابوو بە گۆرانی (نەشید)ی قوتابخانە لەسەر وەزنی گۆرانییەکی تورکی (بزیرنجی الا بدنز) دەوترا.

ئەوەی شایانی باسە (مستر ریچ) شاخی پیرەمەگرون بە(غودرون) ناو دەبات دەڵێ لە دوورەوە چیایەکی تاریك دیارەو لە تەوقە سەرەکەی چاڵاییەك یا حەوزێك هەیە کە بەفری تیا گرد دەبێتەوەو دەیبەستێ و لە هاوینا بەکار دەهێنرێت.

پیرمیکائیل:

شەخسێکە (یاخود جێ نزرگەو مەقامی) شەخسێکە لە رۆژهەڵاتی سلێمانی بەسەر بەرزاییەکەوە بە نزیك رێگای (قرگەو هۆمەرەکوێر) مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس) لەیادی مەردانا دەفەرموێت:" پیرمیکائیل یەکێکبووە لە ئەولیاو صالحانی رۆژگار. ئەم زاتە لە نەوەی خەلیفەی سێهەم حەزرەتی (عوسمانی کوڕی عەففان)ەو لەساڵی (٧٣٨ ھ)دا کۆچی کردووە بۆ ناوچەی (جوانرۆ)ی سەربە شارستانی (سنە) لە کوردستانی ئێران و بەرێ نوێیکردنی موسوڵمانان لە دێی (دەوران)کە دێیەکە لە نزیك چەمی سیروان لە ناوچەی جوانرۆ دانیشتووەو لەوێ کۆچی دوایی کردووەو قەبرەکەشی هەر لەوێیە. پاش خۆی بە ماوەیەك نەوەکەی هاتوون بۆ ناوچەی قەرەداخ و سەنگاو لەوێ نیشتەجێ بوون.

ئەم نووسینە لە باسی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی)دا دەهێنێتەوە کە دەڵێت: (مەولانا) ناوی (خالیدە)و کوڕی (ئەحمەدی کوڕی حوسەین)ەو لە تیرەی جافی میکایلییەو دایکی مەولانا ناوی (فاتمە)یەو لە ساداتی (پیرخدری)یە. مکایەلی تیرەیەکن لە جافی کۆچەری لە نەتەوەی پیرمکائیلی کە مشهورە بە پیرمیکائیلی شەش ئەنگووس (شەش پەنجە) کۆزی زستانەیان لە ناحیەی قەرەداخی سەربە شارستانی سولەیمانی ئێستا بووە. بە هاوینانیش چوون بۆ کوێستانە تایبەتییەکانی خۆیان لە کوردستانی ئێران، بەڵام ئێستا خانەنشین بوون و گەرمیان و کوێستان ناکەن و دەڵێت مەولانا لەساڵی(١١٩٢ ھ) لە شاری قەرەداخ لە دایکبووەو لەساڵی (١٢٤٢)دا وەفاتی کردووە.

پیرمیکائیل بەهۆی بەرزی شوێنەکەیەوە کە بەسەر هەموو لایەکدا دەڕوانێت خەڵکی بۆ زیارەت بێ یاخوو بۆ سەیران ڕوویان تێدەکرد هێجگار لە بەهاردا دەبوو بە شایی و هەڵپەڕکێ، بۆیە فائق بێکەس بەم پارچە شیعرە ڕازاوەیە یادی کردۆتەوە..

پیرمیکائیل ببینە
دڵگیرو خۆش و شینە
هەروەك تاوس ڕەنگینە
جێی بەزم و هەڵپەڕینە
سەیران و پێکەنینە
پڕ نازو نازەنینە.

شێخ عەباس (شێخەباس)

ئەم شێخە باسە (قوتب) یان پێوتووە. شەخسێك بوو لە خوار سولەیمانییەوە نزیك بە ڕێگای (قەرەتۆغان)و بەرامبەر ماڵەکانی (وڵوبە). لەکاتی خۆیدا ڕێگەی شێخەباس لەسەر گردێکی پان و فراوان بووە، دارەکە ئەوەندە گەورەبوو کە بەئاسانی لە چەند لاوە گوریسیان پیا هەڵواسی بوو بۆ جۆلانەو دیلانێ، بەڵام دوای هاتنی عوسمانیەکان دارەکەی شێخەباسیان بڕییەوە، ئەوە ئیتر شوێنەکەشی لەبیرچۆتەوە. (حەزرەتی نالی) لە دێڕە شیعرێکیدا دەپرسێ..

ئێستەش بە بەرگەو بارە عەلەم داری شێخەباس؟
یابێ نەواو بەرگە گەڕاوە بە شەخسی عوور؟

ئەمە ئەو شوێنە بوو کە لەدوایدا بوویە گەڕەکی جوولەکان لە خوار شاری سلێمانییەوە.

پیرمەسور:

لە ژووروی شاری سلێمانی و لە گەرەکی مەلکەندی شەخسێك هەیە پێی دەڵێن (پیرمەسور) کە کورتکراوەی (پیر مەنسور)ە شوێنەکە گۆرێکی تیایە لەژێر پیرەدارێکداو بە بەرد وشکە کەڵەکی لە دەوروبەر کراوە لق و پۆپی دارەکە زیاتر قوماشی سەوزو سپی پێوەیە. ئەم شەخسە (زەیوان)ی هەیە زەیوان ئەو کەسەیە کە خزمەتی قسنەکە دەکات و کە خەڵکیش دەچن بۆ زەیارەت دەست دەبەن شتێکی دەدەنێ. لە چلەکانا زەیوانەکەی (باجی ئامینە) ناوێك بوو کە خانووەکەی نزیك بە قسنەکە بوو.

حەزرەتی نالی لە چامە دووروودرێژەکەیا کە ئەحواڵی سلێمانی دەپرسێت دارەکەی پیرمەسوری لە بیرنەچووە هەر کە دەڵێت:

داخۆ دەروونی شەقنەبووە پردی سەر شەقام؟

پیرو فتادەتەن نەبوە داری پیرمەسوور؟

لە بابەت شەخسی پیر مەنسورەوە پرسیارم لەرێی (کاکە حەمە)وە لە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی باوکی کرد، هەروەها پرسیارم لە مامۆستا (جەمیل رۆژبەیانی) کردو گەلێك سەرچاوەشم پشکنی، هیچم دەست نەکەوت، تەنها وەختی خۆی یەکێك لە تەمەن درێژەکانی سلێمانی پێی راگەیاندم کەوا: پیرەمەگرون و پیرمەنسورو پیرمیکائیل و شێخەباس (شێخ عەباس) ئەمانە چوار ئەبدال (چوار قوتب)بوون و برابوون. هەرچەندە ئەم رایەم لا پەسەند نییە، چونکە لە بابەت پیرمیکائیلەوە ساخبۆتەوە کە لە عەشرەتی مکایەڵی جافە، یاخود تیرەی میکایلی لەوەوە دەست پێدەکات، ئەگەر وابێ کەوابوو ئەوانی تریش هەر جافن کە ئەمەش بەرامبەر بە سیانەکەی تر نەبیستراوە، جگەلەوەی مێژووی ژیانیان یەك ناگرنەوە.

بابێینە سەر واتای (پیر) کە ئاوتای ناوی ئەم زاتە پیرۆزانەیە:

پیر: بەگوێرەی فەرهەنگی خاڵ بەرگی یەکەم (ل٢٦٤) دەڵێت:" (گیاندارو درەختی بەساڵاچوو، پیاوی باشی خواپەرست کە بە ئامۆژگاری مەردوم بهێنێتە سەر ڕێی چاکە).

پیر بەگوێرەی فەرهەنگی (مهاباد– ل ١٥٧)واتا (الهرم، شایب، مسن، شیخ، مرشد). لەوە دەکات پیر بەرامبەر بە (باوە)ی کاکەییەکان بێت لە بابەت (باوە یادگار)و (باوە خۆشین) ...

هەروەها ڕەنگ هەیە بەرامبەر بە(موغ)ی زەردەشتییەکان بێت کە ئەمانە هەموو پلەوپایەی پیاوی ئاینیین لە مێژوودا.

لەم بۆچوونانەمدا ڕەنگ هەیە هەندێ ڕاستیم دەرخستبێ و دووریش نییە کەوتبمە هەڵەوە کە بۆیە داوای لێبوردن دەکەم و تکا لەو کەسانە دەکەم کە لەم بابەتەوە هەر زانیاریەکیان هەیە بڵاوی بکەنەوە با ئەم کەلێنە بە تاریکی نەمێنێتەوەو سوپاس.

## مێژووی سێ خانەقاکەی سلێمانی

### خانەقای مەولانا

بەناوی مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوەیە (مەحمود پاشای بابان) ساڵی (١٨١٧) ئەو خانەقایەی بۆ دروستکرد. (مستر ریچ) لە یادداشتەکەی ڕۆژی ( ١٨٢٠/١٠/٢٥)، (ل ٢٢٧– ٢٢٨)دا: دەڵێت:"ئەم بەیانییە شێخ خالیدی بەناوبانگ بەدزییەوە سلێمانی بەجێهێشت و ڕایکردو هەرچوار ژنەکەشی لەگەڵ خۆی دەرکرد. کەس نازانێ ڕوویکردۆتە کوێ؟"

کوردەکان پێش چەند ڕۆژێك لە شێخ عەبدولقادری گەیلانیيان بەرزتر دادەنا. پاشا دەست لەسەرسنگ لە حزوریا دەوەستاو سەبیلی بۆ دادەگیرسان، بەڵام وا ئەمرۆ بە کافری دادەنێن و زۆرشتی لێ دەگێڕنەوە.. ئەم پیاوە دوای ئەوەی

کەوتبووی کوڕە نەخۆشەکەی پاشا ئەتوانێ چاك بکاتەوە، بەڵام هیچی بۆ نەکرا، گوایە لەلایەکی ترەوە ویستویەتی دوویەرەکی بخاتە بەینی پاشاو براکانیەوە کە بڕیار وابووە بە ئامادەبوونی شێخ خالد هەموو بەرەو ڕووبنەوە، هەندێکی تر وتویانە گوایە ویستویەتی بناغەی مەزهەبێکی نوێ دابنێ، ویستویەتی خۆی ببێ بە دەستبەسەری وڵات.. بەمجۆرە زۆر شتی دراوەتە پاڵ کە لایەقی شانی ئەو نەبووە. جگەلەوەی زاناو شێخەکان و لەژوور هەموویانەوە شێخ مارف هەموو ڕقیان لێی بووە، چونکە کە ئەو لەپێش بوو ئەوانی تر کەسیان دەفیان دەنگی نەدەدا، هەروەها (یوسف بەگ) کە برای شێخ خالدو حاکمی پشدەر بوو ئەویش ڕایکرد بەودیوا."

(شێخ محەمەد خاڵ) لە کتێبەکەیدا (الشیخ معروف النودهی البرزنجی ل ٣٨-٥٢)دا دەڵێت:" مەولانا خالید دوای ئەوەی ڕوویکردە هندستان و چووە خزمەت شێخ عەبدوڵای دەهلەوی و ساڵێك لە خزمەتیا مایەوەو ئیجازەی دایە.. گەڕایەوە سلێمانی لەساڵی (١٨١١)دا دوای ئەوە چووە بەغداو لەوێ لە (تەکیەی قادری) نزیکەی پێنج مانگ مایەوە ئنجا جارێکی تر گەڕایەوە سلێمانی و ئاڵای گەورەی سوفیەتی هەڵکردو خەڵك دەستە دەستە دەچوونە ژێر ئاڵاکەیەوە کە ئەمە ڕقی هەندێ کەسی هەڵسان لە ڕێگرانی (تەریقەتی قادری) ولای حاکمی کوردستان بۆی تێچێنرا، بەڵام ئەو ئەم کردەوانەی هەر بەدوعا ڕەت دەکردەوە، لە دواییدا ناچار سلێمانی بەجێهێشت و لەساڵی (١٨١٣)دا ڕوویکردەوە بەغداو لە قوتابخانەی (الاحسائیە کە ئەمڕۆ تەکیەی خالیدی پێدەڵێن) دابەزی دوای ئەوەی (داود پاشا)ی والی بەغدا دەستی بۆ پیاهێنایەوە، ئیتر لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێکردو ڕێبازی نەقشبەندی لە زۆربەی شارەکانی عێراقدا بڵاویۆوە لەم کاتەدا خواوراستان مەحمود پاشای بابان هاتە بەغدا، کە بەو جۆرەی دیی کە چەندەها کەس دەوریان داوە بەتکاو پاڕانەوە گەڕانییەوە بۆ سلێمانی و خانەقاکەی بۆ دروستکردو چەند دێ و

ڕووباری لەسەر خانەقاکە وەقف کردو دەستیکرد بە ئیرشادو دەستگرتنی خەڵك بۆ سەر ڕێگای ڕاستی ئایین، بەمجۆرە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە ڕوویان تێکرد عەرەب و عەجەم. ئەمەش دیسانەوە بووەوە بەهۆی ڕقهەڵسانی هەندێك کەس لێی لەو کاتەشدا پەیوەندی بەینی بەغداو وڵاتی بابان پچڕابوو مەحمود پاشاش لەوە دەترسا کە بەهۆی ئەم پیاوەوە کاری لە دەست دەرچێ شێخ خالد خۆشی هەستی بەمە کردو بۆئەوەی نەبێ بەهۆی خوێنڕشتن لە وڵاتەکەیا لە (١٨٢٠/١٠/٢٥)دا سلێمانی بەجێهێشت و ڕوویکردەوە بەغدا لە (تەکیەی خالیدی) دابەزی و خەلیفەکەی خۆی کە (شێخ عەبدوڵڵای هروی)بوو لە خانەقای مەولانا لە سلێمانی لە شوێنی خۆی داناو ئیتر لەوێشەوە چووە شام و لەوێ جێگیربوو... بەجۆرێك دەنگیدایەوەو ناوی بڵاوبۆوە کەس بەو جۆرەو ئەو پایەبەرزەی وەرنەگرتووە. (خوالێخۆشبوو شێخی خاڵ ناخۆشی بەینی مەولانا خالیدو شێخ مارفی نۆدێ بەمجۆرە دەداتە قەڵەم). شێخ مارفی نۆدێ لەو ڕۆژانەدا زانایەك بوو لە خەڵك دابڕابوو، لە گۆشەیەکی قوتابخانەکەیا خەریکی دەرس و دەوری خۆی بوو لە جیهان و یاریەکانی بەدوور بوو، هەندێ کەس لە شەیتانەکان چوونە بنکڵێشەی ئەویش بێنەوەی بەتەواوەتی بچێتە بنج و بناوانی تێچاندنەکەیان بڕوای پێکردن، بەڵام لەدوای ئەوەی کە زۆرکەس بۆ بەرگریکردن لە مەولانا خالید ڕاپەڕین.. لەدواییشدا شێخ مارف ڕاستی بۆ دەرکەوت و هەستیکرد کە بەهەڵەدا چووە، بۆیە پەشیمان بۆوەو داوای لێبووردنی لێکردو لەم ڕێگایەوە (مەلا حسێنی قازی- مەلای جامی و مەلا ئیسماعیل بەرزنجەیی)کرد بە واسیتەو ئیتر ئەویش دڵی چاکبوو. ئەوی دەیەوێ زیاتر لەم باسە بگات کتێبی ناوبراى شێخی خاڵ بخوێنێتەوە هەمووشتێکی دوورودرێژتیایە.

خانەقای مەولانا وەك ئەو نووسینەی بەسەر دەرگای خانەقاکەوە بوو خوالێخۆشبوو شێخ محەمەد خاڵ نووسیبووی گوایە لەساڵی(١٨١٧)دا دروستکراوە...

ئەوەی گومانی تیا نییە دوای دروستکردنی خانەقاکە چەند جارێك دەستێکی پیا هێنراوەتەوە، بەڵام لەم دواییەدا و کاتی ژیانی شێخ محەمەدی خاڵدا کە هیمەتی نواند بۆ پارەکۆکردنەوە... دەستێکی تری بەباشی پیا هێنایەوەو وایلێهاتەوە کە نوێژی هەینی تیا بکرێ. خوا جەزای باتەوەو گۆڕی پیرۆزی پڕ لە نوور بێ.

**خانەقای مەحوی**

مەحوی نازناوی (مەلا محەمەد کوڕی مەلا عوسمانی باڵخی کوڕی مەلا عوسمانی گەورە کوڕی مەلا عەلی گردە کوڕی پیر مەحمود کوڕی پیر خدر کوڕی شێخ ڕەشی (شێخ ڕەش و شێخ مەند) دوو برا بوون لە ناوچەی (ماوەت) گۆڕەکانیان لەبەینی (بایزاواو کارێزە)دایە لە سنووری دێی (باڵخ) کە سەر بە ناوچەی ماوەتە. ئەم دوو برایە زاناو مورشیدی ڕێبازی قادریی بوون، بەڵام لە شێخ عوسمانی باوکی مەحوییەوە ڕێبازی (نەقشبەندی)یان گرتووە ئەویش لەئەنجامی پەیوەندیدا لەگەڵ مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوە.

ئەوەی زانراوە خانەقای مەحوی لە سەردەمی سوڵتانی عوسمانی (عەبدول ئەلحەمید)دا ساڵی(١٣١١ ك)بەرامبەر (١٨٩٣ ز)و بە فەرمانی سوڵتان ئەو خانەقایە لە سلێمانیا دروستکراوە. سەیری (دیوانی مەحوی) بکە.

مەحوی لەساڵی (١٨٨٣)دا چووە بۆ حەج و لەوێوە چووە بۆ ئەستەمبوڵ و لەڕێگای پیاوماقوڵانی کوردەوە لە ئەستەمبوڵ چاوی بە سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی کەوتووە. سوڵتان ڕێزێکی زۆری لێگرتوەو فەرمانیداوە خانەقایەکی لە سلێمانی بۆ دروست بکەن کە ئێستا بە خانەقای مەحوی بەناوبانگەو مەعاشێکیشی بەناوی خزمەتکردنی هەژارانەوە بۆ بڕیوەتەوە، کە گەڕاوەتەوە سلێمانی تا مردنی لە سەرەتای شەشەڵانی (١٣٢٤)،(تشرینی یەکەمی ١٩٠٦)دا هەر خەریکی دەرسوتنەوە بە فەقێ و بڵاوکردنەوەی ئاین و خزمەتکردنی موسوڵمانان و بڵاوکردنەوەی گیانی سۆفیەتی بووە. لەیەکێك لەژوورەکانی خانەقاکەی خۆیدا بەخاك سپێرراوە.

ئەوەی شایانی باسە خانەقای مەحوی دەکەوێتە گەڕەکی سەرشەقام و لە گوزەری ئاسنگەرەکان و سەر ئەو شەقامەی لە مزگەوتی گەورەوە بەرەوخوار دەبیتەوە بەژێر پردەکەدا تا دەداتەوە لە شەقامی سەرشەقام بەدەستە ڕاستدا.

لەوەپێش بەڕێوەبردنی خانەقاکە هەر بەدەست بنەماڵەو نەوەی مەحوی خۆیەوە بوون تا ئەم ساڵانەی دوایی کە نەوەیان بەسەریەوە نەماوەو دائیرەی ئەوقاف و کاروباری دینی سەرپەرشتی و بەڕێوەی دەبات.

خانەقای مەحوی لەوەپێش بە مزگەوتی مەلا عوسمانی باڵخی و پێش ئەویش بە مزگەوتی مەلا عوسمانی گەورە ناسراوە کە دەبێتە باپیری مەحوی و مێژووی تەواوەتی ئەو خانەقایە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بنیاتنانی شاری سلێمانی.

ئەوەی شایەنی باسە مەحوی نەك هەر شاعیرێکی کلاسیکی، بەڵکو دەتوانین بڵێین فەیلەسوفێکی سۆفیگەری کورد بووە.

خانەقای حاجی مەلا عەلی

د. کەمال مەزهەر لە (ل ١٠ ی کاروانی ژمارە ١٤ ی ساڵی ١٩٨٣)دا دەڵێت:" کە برایم پاشا شاری سلێمانی بنیات ناو بارەگای میرنشینی بابانی لە قەڵاچوالانەوە گواستەوە ئەوێ. محەمەد ئاغای نەوەی زوڵاڵ ئاغا یەکێك بوو لەو پیاوماقوڵانەی بەخۆی و ماڵ و منداڵییەوە لەتەکیا هاتە شاری نوێی کوردستان. پاش دوازدە ساڵ واتە دەوروبەری ساڵی (١٧٩٦)خوا ڕەسوڵی بەخشی بە (محەمەد ئاغا).

ڕەسوڵ زوو وەك لاوێکی بەخشندەو زیرەك و وریاو داوپەروەرو هێجگار لەخواترس ناوی دەرکردو ڕوویکردە مەککەو مەدینەو پاش گەڕانەوەی بووە حاجی ڕەسوڵ. هەر لەوساشەوە ڕێبازی نەقشی دای لە کەللەی و بووە موریدێکی دڵسۆزی. زۆری نەبرد حاجی ڕەسوڵ خانەقایەکی لەتەنیشت ماڵی خۆیەوە دروستکردو هەموو ئەرکی بەڕێوەبردنی گرتە ئەستۆی خۆی، ئیتر دەنگوباسی حاجی ڕەسوڵ کەوتە سەر زاری پیاوچاکانی شارو دەوروبەری. سەودای نەقشی بوو، بەپەرۆشەوە ڕوویکردە بیارەو چووە خزمەت (شێخی سیراجەدین) شێخی گەورەی نەقشیش حاجی ڕەسوڵی دەچێ

بەدڵاو زۆر بەرێزەوە ئیجازەی ئیرشادی پێدەبەخشێ، دوای وەرگرتنی ئەو بەڵگەنامەیە حاجی رەسوڵ زیاتر کەوتە کۆشش بۆ پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی رێبازی نەقشبەندی، ئەوکارە رقی ژمارەیەك لە دەسەڵاتدارانی ناوچەکەی لێهەڵساندو لەتاوا ناچاربوو شاری سلێمانی بەجێبهێڵێ و روویکاتە(گورگەدەر)ی ناوچەی سورداش کە گوندی خۆی بووەو تا کۆچی دوایی لەوێ نیشتەجێ دەبێ. پاش مردنی لەساڵی (١٢٨٦ك)بەرامبەر (١٨٦٩-١٨٧٠ز) تەرمی حاجی رەسوڵ دەهێننەوە سلێمانی و لە گردی مەعفوانی گۆرستانی سەیوان دەینێژن.

بەرلەوەی سلێمانی بەجێبهێڵێ، حاجی رەسوڵ خانەقاکەی بە مەلا عوسمانی باڵخی دەسپێرێ کە زانایەکی ناسراوو سەربە رێبازی نەقشەبەندی بووەو دوای کۆچی دوایی حاجی مەلا عەلی کوری دێتە سەری کە ئەویش زانایەکی پایە بڵند بووەو لەوساوە ئیتر خانەقاکە دەبێتە (خانەقای مەلا عەلی) کە تائێستاش هەرماوە.

لێرەدا مامۆستا (سۆران مەحوی) هەر لە گۆڤاری (کاروان- ی ژمارە ٢١ ساڵی ١٩٨٤ ل ٢١-٢٣)دا دوای ئەوەی ئاماژەی بۆ ئەو نووسینەی (د. کەمال مەزهەر)کردووە دەڵێت:" مەلا عوسمانی باڵخی سەربە گوندی باڵخە، ناحیەی ماوەتی شارباژێرەو باوکی شاعیری مەزن مەحوییەو لەرەچەڵەکدا دەچێتەوە سەر زاناو پیری ناودار (شێخی رەش) کە بەپیرێکی گەورەو زانایەکی مەزن لە ناوچەی شارباژێردا شۆرەتی سەندووە، بەڵام مەلا عوسمانی باوکی حاجی مەلا عەلی دەبێتە کوری حاجی ئیسماعیلی کانی کەوەیی و لەبنچینەدا لە تیرەی میکایلی(جاف)ە. خانەقای حاجی مەلا عەلی کە پێشتر مزگەوتی مەلا عوسمانی کانی کەوەییان پێ وتووە، دوورترین مێژووی بنیاتنانی دەچێتەوە بۆ سەردەمی حاجی رەسوڵی نەقشەبەندی کە دیارە ئەویش هێندە دوورنییە."

بەهەرحاڵ وادیارە لێرەدا تێکەڵاوییەك لە ناوەکانا بووە، چونکە هەردوولا مەلا عوسمان و هەردووکیان نەقشەبەندی و سەر بە شێخانی بیارە بوون، بەڵام من (نووسەری ئەم کتێبە) بەگوێرەی ئەو زانیاریەی کاتی خۆی لە مەلا جەلال کوری

مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ساڵح کە یەکێکە لە ئەندامانی بنەماڵەی (حاجی مەلا عەلی)م وەرگرتووەو ئێستاش لەلام ماوە. ئەو مەلا عوسمانی کانی کەوەییە کە کاك سۆران مەحوی باسی دەکات (مەلا عوسمان کوڕی حاجی ئیسماعیل کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا فازیل کوڕی مەلا حسێن کوڕی مەلا میرە یەو بنەماڵەکەیان لە دێی (دەرگەزێن)ەوە هاتوون و لە نەوەی (بابا تاهری عوریانی)ن، مەلا وەسمان خۆی پیاوێکی ئەدیب و شاعیرو نووسەرو نازناوی شیعری لە پێشا(حەزین)و دوای ئەوە بوویە (فائق)و دیوانی شیعری گوایە چاپکراوەو شیعری بەعەرەبی و فارسی و کوردی هەیەو لەقەبی شێخایەتیشی (عمادئەلدین)بووە حاجی مەلا عەلی لەقەبی شێخایەتی (جەلال الدین)بووە.

مەلا ساڵحی مەلا وەسمان شاعیر بووەو نازناوی شیعری (شەیدا)بووە، مەلا ئەحمەدی مەلا ساڵح شاعیر بووەو نازناوی شیعری (حیلمی)بووە، مەلا ئەبوبەکر شاعیر بووەو نازناوی شیعری (فیکری)بووە، هەر بەقسەی مەلا جەلال گوایە (مەلا فازڵ) لە دەوروبەری ساڵی (١٧٢١ ز) هاتۆتە جیهانەوە، پیاوێکی ئاینی بووەو ڕێبازی (نەقشەبەندی گرتوەو هاتۆتە قەڵاچوالان و دوای دروستکردنی سلێمانی ئەویش لەگەڵ میری باباندا هاتووەو لەگەڵ بنەماڵەکانی ترا پێکەوە گەڕەکی (دەرگەزێن)یان لە شاری سلێمانی ئاوالکردۆتەوەو تیا دانیشتون، مزگەوتێکیان بۆ دروستکردووە ئەمڕۆ بە مزگەوتی (مەلا مەحمود) بەناوبانگە کە کوڕی حاجی عەلی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا فازڵە، دوای مەلا فازڵ مەلا ئەحمەدی کوڕی (١٧٥٦–١٨٠٢ ز) شوێنی گرتۆتەوە.

ئەو مزگەوتەی باسمان کرد جیایەو لە گەڕەکی دەرگەزێنەو خانەقای حاجی مەلا عەلی لە گەڕەکی سەرشەقامە.

# ئاوڕێك لە مێژووی دزەیی

ساڵی (١٩٥٦) مدیری ناحیەی کندیناوە بووم. خوالێخۆشبوو (حەسەن ئاغای مامی سلێمان ڕەسوڵ ئاغالە دیبەگە) دادەنیشت زوو زوو سەری لێدەدام، ئەمەی لێرەدا دەینووسم لەوم وەرگرتووەو لە زمانی ئەوەوەیە بەبێ هیچ دەستکارییەك. تکا لە برا دزەییەکان دەکەم ئەگەر شتی تریان لا هەیە بیخەنە سەری، چونکە تائێستا دەتوانم بڵێم ئەم چمکە لە مێژووی عەشرەتێکی گەورەی کورد تاریکە).
دزەیی نسبەت بە (دزە)(١)یی گەورەی سەر سنوری بەینی عێراق و ئێران و تورکیا (قەرەنی ئاغای گەورە) لە گوندی دزەوە هاتۆتە ئەم ناوچەیەو مێژووی هاتنی دەگەڕێتەوە بۆ پێش زەمانی (کوڕە پاشای ڕەواندز)(٢).

لەوەێوە هاتۆتە (ڕەشوان) بە ڕەحالەیەتی دوای ئەوە چۆتە (قوشتەپە) لەوێ ساکن بووە(٣). دوای قەرەنیاغا مەحمود ئاغای کوڕی بۆ شەڕ ڕیئاسەتی وەرگرتووە. هەتا ئەم دواییەش مەرکەزیان هەر قوشتەپە بوو. لەوەپێش هەر (رحالە) بوون، بەڵام نزیکەی (١٠٠–١٥٠ )ساڵێك دەبێ لە (رحالە)یەتی کەوتوون.

دوای مەحمود ئاغا (فارساغا)ی کوڕی ڕیئاسەتی وەرگرت. لە زەمانی فارساغادا دوان لە خزمەکانی (حوێن)و (وەسمان) دەچن بۆ ناوچەی ڕەواندز لەڕێی پیاوی پاشا کوڕە دەیان کوژن، پاشا کوڕە ڕەواندز بۆ دڵنەوایی دەنێرێ بۆ لای فارساغا (لەکاتێکدا کە پاشا دوای شەڕەکەی لەگەڵ بابانەکاندا کە دەیانشکێنێ و ناو دەردەکات ئەمەش ساڵی (١٢٤٢ ك) دەبێت (٤) دەڵێت: "ئەگەر ئەمر دەکات خۆم قاتیلەکانی بۆ دەنێرم لەوێ بیانکوژێ، یاخود لێرە خۆمان دەیانکوژین." فارساغا وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت:" عەرزی پاشا بکەن گوێ نەداتێ دوو سەگ کوژراون."
کە ئەم جوابە دەبەنەوە بۆ پاشا کوڕە دەڵێت:" دەنگ مەکەن دزەییم تێکدا."
لەسەر ئەم قسەیە ئیسماعیل ئاغا لە فارساغای مامی عاجز دەبێت و دێتە گوندی

(گردمەلا)، لەوێوە بەدزی فارساغاوە دەنێرێت عەشیرەتی(طـی) دەهێنێت و لەگـەڵ پیاوی خۆیدا دەیان نێرێتە سەر (دەربەندی گۆمەسپان)و (بانەمان)، بەشـەو هـەردوو نوقتەکە دەگرن و چل کەسێکی تێدا دەبێت دەیان کوژن. کە خەبەر دەگاتەوە پاشـا کۆرەی ڕەواندز گلەیی لە فارساغا دەکات ئـەویش:" دەڵێـت من ئاگـام لێ نـەبووە." دەڵێت:" دەباشە بۆ متمانە دوو کوڕی خۆتم بنێرە لا." ئەویش جوتێ کوڕی (حسین و مارف) بە (ڕەهینە) دەنێرێتە لای پاشـا، خۆشـی باردەکـات دەچـێتە لای (چـەمی دوین) کە جیابێتەوە لە دزەیی و طـی. دوای ئـەوە لەشکری پاشا کـۆرە دێتـە سـەر دزەیی. سمایل ئاغاو کەسوکاری و ئامۆزاکانی بـە پیاوەکانیانـەوە دێنـە سـەنگەران (نزیك دێی گـەڕە سـور) لـە شـاخی قەرەچۆخی بـەینی کەنـدیناوەو مـەخمور لـەوێ خۆیـان قـایم دەکـەن. لەشـکری پاشـا دێتـە سـەریان. (کـایوس مـەلا)و (عـەلی ئەلحەسەن- شێخی طی) دەچن تـالآن بێـنن لەویـەری زێ ولآتـی موسـڵ تەسـادوفی لەشکری پاشای کۆرە دەکەن، لەبن موسڵ نزیك نەینەوا، لە (یارمجە) شەڕێکی بـاش دەکـەن، گـەلێك کـەس دەکـوژن لـەپیاوەکانی پاشـا، لەپاشـاندا لـەناو (حـاوی)دا لەگەڕانەوەدا هەردووکیان دەکوژرێن.

لە قەرەچۆخیش شەڕ هەر هەبوو پیاوی پاشا زەفەریان پێ نابەن تاکو لەدواییـدا لەبەر بێ زەخیرەیی تەنگەتاو بوون، لەبرسا بوونە دوو بەش، بەشێکیان چـوونە نـاو (شەمەر- شمر) کە ئەمانە ئـەولادی حەسـەن ئاغـا (حـسین و سـلێمان و ڕۆسـتەم)و ماڵی فارساغاش لەدەم زێی کۆیە مانـەوە. تائفـەی سمایـل ئاغـاش هەسـتان چـوونە کـەرکوك لـەوێوە بـۆ چەمـچەماڵ لای (هەمـە شـەریف هەمەوەنـد)(٥). لـەوێش نەحەوانەوە چوونە تاسلوجە لەوێ هەڵیاندا، ئەمـەش لـە زەمـانی ئەحمـەد پاشـا(٦) یاخود مەحمود پاشای باباندا بوو. لـەوێ مانـەوە لەگـەڵ پاشـای بابانـدا ڕێککـەوتن، پاشـا خـەلآتی کـردن و لوتـف و مەرحەمـەتی دەرحـەقیان نوانـد. ئەسـپێکی باشـی خەلآتی ڕەحمان برا بچکۆلەی ئیسماعیل ئاغا کرد، ئەویش بەسواریەوە دەبێت گوایە

دەڵێت دانابەزم تا لەشکرم دەدەیتێ بچمە سەر کۆیە کە کۆرە پاشای ڕەواندز گرتبووی. پاشای بابان لەشکری دەداتێ و لەگەڵ (عەبدوڵڵا بەگی ساحێبقران) دەچن کۆیە داگیر دەکەن. لەدواییدا ڕەحمان دەگەڕێتەوە دەستی پاشا ماچ دەکات و داوای ئیزنی لێ دەکات و دەچێتەوە وڵاتی دزەیی و دۆستایەتییان لەگەڵ بابانەکاندا دەوام دەکات.

کە پاشا کۆرە لەناو دەچێت فارساغا لە گوێ زێوە دەگەڕێتەوەو دەیەوێت بچێت بۆ بەغدا بۆئەوەی لەوێ بەهۆی والیەوە برا گەورەیەتی عەشیرەتی دزەیی وەربگرێتەوە. دەگاتە ئاشی بەردینە، یاخود (دریکە) نزیک گوندی (رهیمات) شەو لەگەڵ پیاوێکیدا دەچن لەوێ ستار بگرن تا بەیانی، لەپڕ فارساغا دەزیڕێنێ و پیاوەکەی لەگەڵیا دەبێت ڕادەکات، لەدواییدا کە دەچنە سەری هەندێك جلوبەرگ نەبێت هەتاکو لاشەکەشی نابیننەوە، کەس نەیزانی چی لێهات. دوو کوڕەکەشی کە وەختی خۆی لای پاشا کۆرە دەستبەسەر بوون ئەوانیش کە دەزانن پاشا لەشکری ناردۆتە سەر وەچاخی (قەرنیاغا)، لە حەپسخانەوە خۆیان دەرباز دەکەن، بەڵام لەبەرزییەوە دەکەونە خوارەوە هەپرون بە هەپرون دەبن. هەروەها دوای پاشا کۆرە تائفەی بایزیش لەناو عەرەبەکانی (شمر- لای سفوك) دێنەوە بۆ قوشتەپە بۆلای سمایل ئاغا. سمایل ئاغا هەر ڕەئیسیان بوو، دوای ئەو کاکە خانی کوڕی بوویە ڕەئیس، دوای کاکە خان ڕەحمان بوو بە ڕەئیس، دوای (ڕەحمان حاجی باین)(گەورەی تایەفەی باین) دوای ئەویش حاجی فارساغای کوڕی، دوای ئەو حەمەدی حەسەن ئاغا برای ئەحمەد پاشا، دوای ئەوێی تر ڕئاسەتی عمومی کوژایەوە. ڕەئیسەکانی ئێستا(۷) هی تایفەی (مام خولە): (عەلی مەحمود کاکە خان و سەلمان ئاغاو حەسەن ئاغان)

تایفەی بایز: حسێن مەلاو عەلۆ خورشید

ماڵی پاشا: خدر بەگ ئەحمەد پاشا

**ماڵی فارس ئاغا**

شەڕی عەشایەری: دزەیی لەگەڵ بڵباسەکاندا شەڕیان بووە، بڵباسەکان هاتوونە سەر دزەیی و لەپێشدا ئەوان سەرکەوتوون، بەڵام لەدواییدا دزەیی هەڵساونەتەوە، زاڵ بوون بەسەریاناو یەکێك لە سەرۆکەکانیان لێ کوشتوون (حەمەد ئەمینی مامەند ئاغا)بووە. هەروەها دزەیی و گەردی بەشەڕ هاتوون لە دەوروبەری ساڵی (١٨٩٥)دا، (وسو) ناو مەحمودی کاکە خانی تێدا کوژراوە، لەوانیش (حەسەن ئاغا)و (سلێمان کوێخا قادر) کوژراوە، هەروەها لەگەڵ شێخ بزەینی و (العبید)دا هەرایان بوە، بەڵام ئێستا هیچ ناکۆکییەك نەماوەو هەموو وەك برا بەڕێکوپێکی و خۆشی پێکەوە دەژین خوا پێیان ڕەوا ببینێ) لێرەدا قسەکەی حەساناغا تەواو دەبێت.(٨)

لە کتێبی(العشائر الکردیە)دا، وەرگێڕانی (فوئاد حەمە خورشید): دەڵێت پیاوە ناودارەکانی ئەم عەشیرەتە (عەشیرەتی دزەیی) ئەمانەن(٩):

یەکەم: برایمی بایز ئاغا، پیاوێکی بەتەمەن گەورەو ڕەوشتی بەرزە، ڕۆشنبیرێکی وەهایە کە باشترین و پێشکەوتوترین عەشایەری لێ دەرچێت. هەموو کەس خۆشیان دەوێت و ڕێزی لێ دەگرن. لەکاروباری کشتسازیدا شارەزایی تەواوی هەیە. دەیتوانی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، بەڵام ئاغاکانی تر ڕێی نادەن، لەگەڵ ئەوەشا پیاوێکە لە کاروباری شەڕا دەستی دەڕوات و ژمارەیەك پیاو لەو دەورە دەتوانێ لەڕۆژی خۆیدا بەکاریان بهێنێت.

دووەم: ئەحمەد پاشا، ئەم پیاوە هەر خەریکی کاروباری بازرگانی و پارەکۆکردنەوەیە بەجۆرێك دەڵێن (ملیۆنێك پارەو نفوسی لەناو عەشرەتەکەیدا پێ پەیدا کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی زیرەك و گورجوگۆڵەو وێنەی کەمە. لە کاروباری ماڵداری و پارەکۆکردنەوەدا وێنەی نییە. ئەوەندەش گوێ ناداتە کاروباری کشتسازی بەپێچەوانەی برایم ئاغاوە حەزی لەشەڕو شۆڕی عەشایر نییە، چونکە کار دەکاتە سەر دەستکەوت و خەرج و باجی، بەڵام کوڕەکانی ناخاتە شەڕەوە، ئیتر

هەرچۆنێك بێت شان لە شانی برایم بایز دەدات، ئەگەر کەموکوڕییەك هـەبێت ڕاسـتی دەکاتەوە.

سێهەم: حاجی پیرداود، ئەم پیاوە دەسەلاَت و توانـای برایماغـاو ئەحمـەد پاشـا نییە، بەلاَم لەگـەلّ ئەوەشـدا نـابیّ پـشتگویّ بخرێـت. لەڕاسـتیدا پیـاوێکی ڕاستگۆو قورس و گرانەو ئەوانـەی دەورو پـشتی هـەموو خۆشـیان دەوێـت و دەسـتی بەسـەر دێهاتێکی زۆردا دەڕوات.

ئەو کتێبە هەندێ شتی تری تێدایە لە بابەت عەشرەتی دزەیـی و عەشـرەتەکانی ترەوە، ئەوەی دەیەوێت بیخوێنێتەوە سودی هەیە.

**پەراوێزەکان:—**

١ـ لێرەدا مەبەست ئاغاکانی دزەییە کە لە قەرەنیاغاوە دەستی پێ دەکاتەوە.

٢ـ کوڕە پاشا، یاخود حەمە پاشا، یاخود میری گەورە ساڵی (١١٩٨ ك)بەرامبەر (١٧٨٣ ز) لە شاری ڕەواندوز لە دایك بووە. بەناوبانگترین میری کورد بووە لە قەڵەمڕەوی خۆیدا، ساڵی (١٢٥٣ ك)بەرامبەر (١٨٣٨ ز) عوسمانیەکان لەشاری (تەرابزون) کوشتیان. سەیری (مشاهیر الکرد و کردستان). جزمی دووهەم لاپەڕە (١٤٧—١٤٨)بکە.

٣ـ بەم حیسابە قەرەنیاغا دەبێ لە دەوروبەری ساڵی (١٧٥٠ ز)بوو بێت.

٤ـ ئەوەی حەسەناغا دەڵێت هەندێکی تەواوەو ئەوی تری ناتەواوە.

میری گەورە کە هێزی پەیدا کرد، هات بەرەو هەولێر داگیری کرد، شۆڕشی دزەییەکانی دامرکانەوە، ئینجا بەرەو (ئاڵتون کۆپری و کۆیەو ڕانیە) کشا تا گەیشتە سەری زێی کۆیە کە کردی بە سنوری بەینی خۆی و بابانەکان، والی بەغدا (عەلی ڕەزا پاشا کە دوای داود پاشا هات) ناچار دانی پیاناو پلەی پاشایەتی پێبەخشی.

میر نەوەستا ساڵی (١٢٤٩ ی کۆچی) بەرەو (عەقرەو عەمادیە) کشاو (سەعید پاشای میری بادینان)ی بەدیل گرت. دوای ئەوە ملی نا بەرەو (بەشیقە)و (جزیرەی ئیبن عومەر)و (نسیبین)و (ماردین) هەمووی داگیرکردن.

عوسمانیەکان لەمە ترسان. سوڵتان بەسەرکردایەتی (سەدری ئەعزەم محەمەد ڕەشید پاشا) لەوێوە هێزێکی ڕێکخست، لەم لاشەوە عەلی ڕەزا پاشای والی بەغدا بە هێزێکەوە هەردوو بۆی هاتن، بەڵام پاشای گەورە کشایەوە بۆ گەلی عەلی بەگ لەوێ خۆی قایم کرد. لەشکری عوسمانی هیچی بۆ نەکرا. ئینجا وەك هەموو دەستبڕینێکی تر کە عوسمانیەکان دەیان کرد هانایان بردە بەر مەلا، مەلای خەتێ کە (فتوای)بدا هەر کەسێك دەست لە لەشکری خەلیفەی ئیسلام بکاتەوە تەڵاقی دەکەوێ. بەمجۆرە لەشکری پاشا هەریەکە بەلایەکدا بڵاوەی لێکرد، پاشای نەگبەتیش ناچار

خۆیدا بەدەست (سەدر ئەعزەم)ەوە بردی بۆ ئەستەمبولّ لەوێ لێی خۆش بوون، ئەویش ویستی بگەڕێتەوە بۆ ڕەواندز، بەڵام (عەلی ڕەزا پاشای والی) بەگەڕانەوەی قایل نەبوو، بۆیە یەکێکیان نارد، دوای میر محەمەد کەوت تالە (تەرابزون) لەساڵی (١٢٥٣ ك)دا کوشتیان (سەرچاوەی پێشوو).

لە (تەئریخی سلێمانیە وانحائها– ص ١٥٢)دا ئەمین زەکی بەگ دەفەرموێ:" داود پاشای والی بەغدا بەراتی خەرج و باجی عەشرەتی دزەیی بەرەو ڕووی مەحمود پاشای بابان کردبۆوە، هەر لەسەر ئەمە مەحمود پاشای بابان لەساڵی (١٢٤٢ ك)دا لەگەلّ فارساغای دزەییدا تێکچوو، بەڵام لەئەنجامدا مەحمود پاشا شکاو گەڕایەوە..."

٥ـ لای خۆمان ناوبانگی بە شەریف هەمەوەند دەرکردووە. لە دەورووبەری ساڵی (١٢٥٢ ك)دا سەرۆکی عەشیرەتی هەمەوەند بووە. وای لە قەڵەم دەدا کە کوڕی ئەورەحمان پاشای بابانەو جێنشینیەتی پیاوێکی ڕەق و ئازاو ترس لە جەرگیا نەبوو. بە هەزار سوارێکەوە شەڕی لەگەلّ سلێمان پاشای بابان کوڕی ئەورەحمان پاشا کرد. پێش شەڕەکە بانگی سەرتاشی کردو وتی:" ئەم سەرە پاک بتاشە، سبەینێ یا دەبێ بەژێر تاجی پاشایەتییەوە، یا دەیهێنن بەسەر ڕمەوە."

چۆن نوقڵانەی بۆ خۆی لێدا وەها دەرچوو. ڕۆژی دوای لەشەڕا سەریان پەڕاندو کردیان بەسەر گاسنی ڕمەوە (تاريخ السليمانيه وانحائها. ص–١٥٧).

ئەوەندەی من بیزانم ئەورەحمان پاشای بابان پیاوێکی گەلێك بەدین و لەخواترس بووە، جگەلەوەی بە(تعبیر)ی ئەو ڕۆژانە دوانزە عیلم بووەو دەرسی بە مەلاو فەقێکان وتووە، جگەلەوەی کە فەرمانڕەوا بووە لەهیچ سەرچاوەیەکی تر نەبیستراوە کە ئەورەحمان پاشا ژنی هەبووبێت ناوی (ڕەندانە) بووبێت کە دایکی شەریف هەمەوەندە، گوایە سکی پڕکردووە ئینجا مارەی کردووە کە من ئەم کردەوەیە بە دوور دەزانم لە ئەورەحمان پاشا.

٦ـ بەگوێرەی (تسلسل احداث) بەڕای من ئەحمەد پاشا دوا میری بابانە کە لەساڵی (١٢٥٤ ك)دا بوویە میری سلێمانی.

٧ـ مەبەستی ساڵی (١٩٥٦)کە ئەم مێژووەی تێدا نووسراوەتەوە، لە کاتێکدا حەسەن ئاغا ئەوسا کە خۆی تەمەنی لە (٦٥)ساڵ زیاتربوو.

٨ـ حەسەن ئاغا شەجەرەیەکی دوورودرێژی ئاغاکانی دزەیی پێ وتم کە نووسیومەتەوە، بەڵام وادەزانم هەندێك ڕاستکردنەوەی دەوێت، ئەویش خوا بیکات لەکاتی خۆیدا دەیگەیەنم بەشوێنی خۆی.

٩ـ ئەم کتێبە لەڕاستیدا (تقریری استخباراتی– بەریتانیا)یە لە دەستپێکردنی ساڵەکانی بیستدا نووسراوەتەوە، هێجگار بۆنەوەی پەیوەندی ئەو عەشایەرانە بە شێخ مەحمودی حەفیدەوە ڕوون بکەنەوە، بۆکاتی دەستوەشاندنی خۆیان.

# ئاوڕێك لە (تەئریخی جاف)

١

پێشەکی: لە مێژەو بەدڵ چاوەڕوانی دەرچوونی (کتێب)ێك بووم لەسەر (هۆزی جاف) بەگەرمی هانی برادەرانم دەدا لە بەگزادەی جاف وەك (مستەفا بەگی کەریم بەگ و حەمە سەعید بەگی حەمە بەگ و دکتۆر حەسەن بەگ) کە ئەمانە خەریکی شت کۆکردنەوە بوون لە بابەت عەشرەتەوە.

پێش ئەوانیش هەرچەند لەگەڵ خوالێخۆشبووان (حەسەن فەهمی بەگی عەلی بەگ و حامید بەگ)دا یەکترمان بدیایە. ئەم باسەم لە گەڵیاندا تازە دەکردەوە، چونکە هەردووکیان دەتوانم بڵێم بەبار زانیاریان لابوو لەبابەت جافەوە. هەمیشە تکای ئەوەم لێدەکردن کە ئەو شتانەی لایانە تۆماری بکەن تاکو لەگەڵ خۆیان نەیبەنە ژێر گڵەوە. بەجۆرێك ئامادەیی خۆمم پیشان دەدا کە یاخۆم بۆیان بنووسمەوە، یاخود یەکێکیان بۆ پەیدا بکەم... خۆ ئەگەر مستەفا بەگیش لەبیری بێت ئەم سۆزەم بەرامبەر بەویش پیشانداو لەم دواییەشدا لەگەڵ حەسەن بەگیشدا چونکە من خۆم زۆرشتم لە دەستچوو بەوەفاتی هەندێك لە خزمەکانم کە لە بابەت بابانەوە گەنجینەی زانیاری بوون، کتێبەکەم (بابان في التاریخ و مشاهیر البابانیین) هەر هێشتا بەو هیوایەی تەواوو تێروتەسەل بێت دەسا ئەوە خەوو خەیاڵ بوو، کە سەیرم کرد وا (ناوچەوان مەیلی سەر ئەژنۆ دەکات– کرونووشی تعظیم بۆ پیری دەبات) کەوتمە خۆم و کتێبەکەم لەچاپ دا، بەڵام تەنها بە (٥٠٠ دانە)، چونکە دەمزانی کەموکوڕی و هەڵەو بگرە شتی زیادەشی تێدا سەر هەڵدەدات، بەڵام کەی؟ بێگومان دوای دەرچوونی کتێبەکە ئەمانەم بۆ ڕوونبۆوە.

دەسا ئێستا ئەوەتا هەر خەریکم زانستی تر کۆدەکەمەوە لەو بابەتەوە. هەڵەکان ڕاستدەکەمەوە. زیادەی لێ دەردەهاوێژم، تۆزێك باری کاغەزو چاپەمەنی باش ببێ

لەسەر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانەی لە هەموو لایەکەوە بۆم هاتوون سەرلەنوێ لە چاپی دەدەمەوە کە ڕەنگ هەیە ئەم جارە دوو ئەوەندەی چاپی یەکەم دەرچێت و لەو پەرلاقترو سوودمەندتر بێ.

ئنجا دەڵێم: باشە، بەڵکو مامۆستا ( محەمەد عەلی قەرەداخی) ئەم دەستخەتەی خوالێخۆشبوو جەنابی کەریم بەگی نەدیبایەوەو نەیهێنابایە ناوناوان، ئایا دەبووایە (تائریخی جاف) هەروا پەردەی بەسەرا بدرایەو بشاررایەوە؟

هەزار هەزار ڕەحمەت بۆ گۆڕی کەریم بەگی فەتاح بەگ کە ئەم جێماوە بەنرخەی دوای خۆی بەجێهێشت، بێگومان ئەوەی ئەو کردوویەتی بەگوێرەی ئەو پایەو شوێنەی ئەو هەیبوو لەناو عەشرەتەکەیا شتێکە ئەوەندەی بۆ چووەو ئەوەندەی بۆکراوە، خۆزگە سەرۆکی عەشرەتەکانی تریش ئەمەیان بکردایە با بە کەموکوڕی و بەتەواوەتیش نەبووایە. هەر باشبوو، چونکە بەڕاستی مێژووی هەر عەشرەت و هەر بنەماڵەیەك و هەر خانەوادەیەك کۆبکرێتەوە مێژووی نەتەوەکەمان دەردەچێت و بناغەیەکیشە بۆ مێژووی سەرانسەر نیشتمانی عێراقمان.

ئەمە سۆزێکی دۆستانەو خزمایەتی بوو، دەرم بڕی بۆ ئەو برادەرانەی کە شتیان کۆکردۆتەوە، تاکو کارەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن، بەتایبەتی ئێمەومانان کە کەوتوینە تەمەنەوە پیاو نازانێ لە کوێ و کەی لەپڕ دڵ لەوەستان دەکەوێ، دەسا ئەوەی بە دەستمانەوەیە خۆمان بەئەنجامی نەگەیەنین و جێبەجێی نەکەین، بە دەگمەن دوای خۆمان تەواو دەکرێن بگرە بەزەحمەت لە فەوتان دەپارێزرێن.

بۆیە لە کانگای دڵەوە پیرۆزبایی لە د. حەسەن بەگی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف دەکەم، ئینجا پیرۆزبایی پڕ بەدڵ لە هەموو بەگزادەو هەروەها لە عەشرەتی جاف دەکەم بەبۆنەی دەرچوونی (تەئریخی جاف) دانراوی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف و (لێکۆڵینەوەی دوکتۆر حەسەن جاف)و (پێشەکی محەمەد عەلی قەرەداخی)، (چاپی یەکەم– ١٤١٦ ك– ١٩٩٥ ز) کە بریتیە لە (٢٠٨ لاپەڕە)و بە چوار وێنە

کتێبەکە ڕازاوەتەوە. وێنەی (حەمە پاشای جاف وداود بەگی جاف و محەمەد بەگی فەتاح بەگی جاف)و لە بەرگی ئەو سەریشەوە وێنەی نووسەری کتێبەکە کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف و لە لاپەڕە (١٢٢)شدا وێنەیەکی گشتی کەریم بەگ و براکانی.

سەرەتا مامۆستای قەرەداخی پێشەکییەکی جوان و تێرو تەسەلی بۆ نووسیوەو وادیارە لەڕێی (دار صدام للمخطوطات)ەوە. کە مامۆستا قەرداخی وەك هەنگی ئەو دەستخەتانەی ئەو دەزگایە وایە کە سالّ دوانزە مانگە بەسەر ئەو گوڵانەوە نیشتۆتەوەو هەنگوینیان لێ دەردەهێنێ و لە قاپ و قاچاخی هاوکاریدا کۆیان دەکاتەوە. کە بەوە خزمەتێکی زۆری لەو دەزگایەدا سەری هەڵداوەو لە ڕێگایەوە گەیشتۆتە برادەرانی جاف.

دوای ئەو (د. حەسەن جاف) لێکۆڵینەوەیەکی (١١٦) پەڕەیی بۆ کتێبەکە نووسیوە کە بەمجۆرەیە:

- باسی ئەو دەستخەتەی کەریم بەگی باوکی دەکات کە چۆن بە هیمەتی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداخی دۆزراوەتەوە.

- لێکدانەوەو واتای وشەی(جاف)و لە چییەوە هاتووە.

- ئەو ناوچانەی کە هۆزی جافیان تێدا نیشتەجێیە.

- هۆزی جاف لە مێژوودا.

- نەخشی هۆزی جاف لە سایەی چەند سەرۆکێکەوە لە مێژووی کورددا

(ئەمە جەوهەری باسەکەیەتی و لەلاپەڕە (٢٩)وە دەستپێدەکات تاکو لاپەڕە (٩٣) کە لەوێدا کۆتایی دێت. دوای ئەم درێژەپێدانە باسەکە دێتە سەر:

- کەریم بەگی جاف (نووسەری کتێبەکەیە) کە باوکی د. حەسەنە.

- باسی (حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف) کە برای کەریم بەگ و باوکی حەمە سەعید بەگ و باپیری ڕۆماننووسی هێژا کاك (خەسرەو جاف)ە.

ـ باسی (داود بەگی جاف) کە برای کەریم بەگ و کوڕی فەتاح بەگی جاف و باوکی (سەردار بەگ کە کوڕی گەورەیەتی)و باوکی خوالێخۆشبوو سالار باوکی برادەران کاك (داراو سەربەست و سەروەت و سەرپاس و شەهریارو سەرچڵ و نەوزاد)ە.

ـ باسێکی کورتی (ڕەزا بەگی فەتاح بەگ) باوکی (خالد بەگ و مەحموود بەگ و عەلی بەگ و قادر بەگ و بارام بەگ) لەگەڵ چوار پەڕە لە وێنەی دەستخەتەکە کە ڕەزا بەگ بەخەتێکی جوان نووسیویەتەوە.

ـ لەلاپەڕە (١٢١)وە تا دوایی (تەئریخی جاف)ە کە نووسەرەکەی کەریم بەگەو بریتیە لە بنج و بناغەی کتێبەکە.

لێکۆڵینەوە لە (تەئریخی جاف): لێرەدا مەبەستمان لە لێکۆڵینەوەی سەراسەری کتێبەکەیە. واتا لە پێشەکییەکەی د. حەسەن زیاتر، چونکە ئەوە نیوەی کتێبەکەیە، بەڵام لەپێش هەموو شتێکدا تکا لە کاك حەسەن بەگ دەکەم ئەگەر وەك (ڕایەکی ئیجابی) ڕەخنەیەکم پێیاندا دلگیر نەبێت و بە سنگێکی فراوانەوە سەیری بکات، چونکە مەبەست تەنها گەیشتنە حەقیقەتەو بەس.

جاوا لەپێش هەمووان‌دا دێمە سەر لێکۆڵینەوە لە وشەی جاف. جاف لە چییەوە هاتووە؟ د. حەسەن دەڵێت:" باوکی لەو بڕوایەدا بووە کە ناوی جاف لە (جەفاکێش)ەوە هاتووە. بەوەدا کە جاف جەفاکێش بوون و دەردو سەختڵەتیان زۆر دیوە. جا ئەگەر وشەی (جەفا) سەیر کەین، خۆی بێگومان کوردی نیەو عەرەبییە عەرەبییەکەشی لەبنچینەدا (الجفا – بەواتا) (مایلقیە السیل من الجانبین. الباطل لانفع فیە، یقال ذهب جفاء ای باطلا) ئنجا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر(جاف) بەواتای وشك، ئەوە لە(المنجد)دا دەڵێت: (جَف جفافاو جفوفا– یبس ونشف فهو جاف و جفیف یقال جَّف لبدة ای اقام و ترك الارتحال. جف جفا المال جمعتو سرّ بە).

من هەرگیز ئەم وشەی جافە بە عەرەبی نازانم، چونکە لەکاتی سەرهەڵدانی یار ئەحمەد بەگیشەوە بیگرین کە ئەو شوێنەی ئەوی تیابووە (عەربستان) نەبووەو زمانی

ئاخاوتنیش لەو ناوەدا عەرەبی نەبووە. جا ئەگەر هاتوو وتمان با وایدابنێن کە عەرەبییەو بەواتای وازهێنان لە هاتوچۆ (ارتحال) لێکماندایەوە، هەر بەپێچەوانەوە دەردەچێت کە ئەو دەمەی ئەم ناوە پەیدابووە عەشرەت تازە دەستیان بە گەرمیان و کوێستان کردبوو نەك لێ بووبنەوە.

مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانی لەو باوەڕەدایە کە وشەی جاف لە ناوی هۆزی (جاوان)ەوە هاتووە کە ناوەکەیان لەپێشدا (جاڤان) بووەو وردەوردە بووبە (جافان)و لە کۆتاییدا بووە بە (جاف).

من لەو بڕوایەدام جاوان لەبنچینەدا (گاوان) بووەو لەبەرئەوەی لە زمانی عەرەبیدا (کاف – گ) نییە هەر عەرەب کردویە بە (جاوان) بەتایبەتی لەبەرئەوەش کە لە ناوچەی حلەدا زیاتر سەریان هەڵداو ئەوانیش لە بنیاتنانی شاری (حلە)دا لەگەڵ (بنی اسد)دا بەشداربوون. کەوابوو لێکدانەوەکە بەمجۆرە دەگۆڕێت و لەوە دەچێت کە (جاوان) بووبێت و هاتبێتە سەر(جاف).

جاف دەبێ لە (جەعفەر)ەوە هاتبێ کە ئەویش بەعەرەبی بەواتای رووبار دێت)، بەڵام ناوێکی ئیسلامییە وەك دەیەهاو بگرە سەدەها ناوی تری ئیسلامی کە لەناو کوردا بڵاوبۆتەوە. وەك (زاهر بەگ)و (تاهر بەگ)و (محەمەد)و (مەحمود)و (کەریم)و (داود)... (جەعفەر)بووە بە(جافر) ئەوەتا (جەعفەر سوڵتان) سەرۆکی هەورامی بە (جافرسان) ناو دەبرێ و کەس ناڵێ (جەعفەر سوڵتان)، بەڵکو هەر دەڵێن (جافرسان) یاخود هەر (سان)ی رووت، هەروەها دێیەك هەیە لەناوچەی قەرەداخ (جافەران)ی ناوە، من لەکاتی خۆیا (مدیری ناحیە)بووم لە قەرەداخ و زۆر لەو ناوەم دەکۆڵییەوە کە ئایا پەیوەندی چەند هەیە بە جافەوە، بەڵام بۆمدەرکەوت ئەویش هەر(جەعفەر) ناوێك ئاوای کردۆتەوەو بووە بە(جافەران).

بۆیە دەڵێم دەبێ ناوەکە هەر لە جەعفەر ناوێکەوە هاتبێ کە یەکێك بووبێت لە پیرە گەورەی بەگزادەی جاف و رەنگ هەیە پێش ظاهر بەگ و یار ئەحمەد بەگیش

بوویێت بە چەند پشتێك، چونكە جاف هۆزێكی بەتەمەنە لە مێژووی كوردەواریدا، ئەوەتا هەر بەلای كەمەوەو بەگوێرەی ئەم كتێبە لە سەدەی چواری كۆچیداو بگرە پێش ئەو سەدەیەش ناوی چەند لقێكیان هەبووە.

٢

پێش ئەوەی بێمە سەر دەربڕین ڕام لە بابەت كتێبی (تەئریخی جاف)ەوە بەدووروودرێژی حەز دەكەم كورتەیەكی دەستخەتەكەی كەریم بەگی جاف بۆ خوێندەواری ئازیز بخەمە پێش چاو، ئەو دەستخەتەی كە ئەم كتێبەی لەسەر دانراوە، كەریم بەگ دەفەرموێ:" ئەم كتێبە بە سێزدە فەسڵ بەیانی ئەوزاع و ڕەوش و حەرەكاتی گەورەكانی جاف و عەدەدی نفوسی جاف و تایفەكانی جاف لە خاكی ئێران و عێراقداو هاتنی جاف لە ئێران بۆ كوردستانی بابان و گەڕانەوەیان بۆ ئێران و دووبارە هاتنەوەیان بۆ وڵاتی بابان و شەڕێ كە لە بەینی خۆیانا واقیع بووە لەگەڵ ئەو تائفەو عەشایرانەی كە دراوسێیان بوون... بوویانەو جێگەی كوێستانیان لە ئێران و جێگەی زستانیان لە لیوای سلێمانی و لیوای كەركوك و جێگەی ئەو تایفەكانی ئێرانیانەی كە لەویلایەتی كرماشان و سنەن، كە مەشهوورە بە وڵاتی ئەردەڵان، تێدا بەیان ئەكەم."

فەسڵی ئەوەڵ: عەدەدی تایفەكانی جاف لە ئێران و كوردستانی باباندا كە داخلی عێراقە.

تایفەكانی جافی بابان: ئیسمی فیرقە (میكایلی، شاتریی، ڕۆغزایی، تەرخانی، باشكی، هاروونی، صەدانی، كەماڵەیی، بەداخی، عەمەلە، عیسایی، گەلاڵی، نەورۆڵی، یەزدان بەخشی، وەلی، نەزۆێنی، مەسۆدیی، شێخ ئیسماعیلی، صۆفی وەند، تاووگۆزیی میراولی، پشتماڵە، سمایل عوزەیری، بێسەری، چوچانی، تیلەكۆ)

تایفەکانی جاف کە لە ئێران ماونەتەوە ئەمانەن: (قوبادی، باوەجانی، ئیمامی، بەناخی، قادرمیروەیسی، تایشەی، کۆیك، نێرژی، دەرۆیشی، وەڵەدبەگی، دەڵەژێری کۆکۆی، زەردوی، عەلی ئاخەی، پەپلی، تاووگۆزی، دووروی، کوێرەکی).

فەسڵی دووەم: لەم فەسڵەدا کەریم بەگ (فیرقەی هەر تایفەیەك) باسدەکات لەگەڵ شوێنی نیشتنیان لە زستان لە عێراقداو شوێنی هاوینیان (هاوین هەواریان لە خاکی ئێراندا)و هەر فیرقەیەش چەند چەکداری هەیە لە سوارەو پیادەو ئینجا رێگای هاتوچۆیان بۆ ئێران روون دەکاتەوە، بۆ نموونە لە بابەت میکایلییەوە دەڵێت:" مکایلی چوار فیرقەیە: محەمەد ئەلی وەیسی، رەشوبۆری، شوانکارە، ئالی بەگی).

فیرقەی محەمەد ئەلی وەیسی تەخمینەن دانیشتووی گەریاویان هەزارماڵ دەبن، حەوت سەدیان گەریاون و سێ سەد ماڵیان دانیشتوون، گەورەیان ( رۆستەمی حەسەنی حاجی قادرەو میرزای حاجی حسەینەو عەلی حاجی قادره).

دانیشتووەکانیان لە ئاژدلغی دەلۆ: (کچان و تەرەفی ژاڵەو رەباتەو کارێزەو کۆیك و ناحیەی تانجەرۆ، چ لە تەرەفی عەربەت و قەرالی و چ لەتەرەفی ئەمەڵ و بێپوورەو قسرت دادەنیشن، تەخمینەن ئەم فیرقە سێ سەد سوارو سێ سەد پیادەی موسەللەحیان دەبێ، لەرێگەی زوستانەیانەوە کە سەگرمەو دەربەند ئاوداری باسەرەیە دەچنە قەرەداغ و لەوێوە دەچنە ناحیەی تانجەرۆ، لەرێگەی پووشێنەوە داخلی ناحیەی سرۆچك دەبن و لەرێگەی کەژی تاری دەرەوە دەچنە قزڵجە کە ناحیەی پێنجوینە، لە تەرەفی سەری باپیر، کە شیمالی پێنجوینە رەش دەوار هەڵدەدەن، لەوێوە دەچنە (چەمی بێسان و رەشید)و لە چەمی بێسانەوە داخلی خاکی ئێران، کە مەحەلی هاوین و ئاوی نەکەرۆزو کەلیخانە لە بەینی بانەو سەقزدا دەمێنن.)

دوای ئەوە باسی هەندێ فیرقەی تری میکایلی دەکات دەڵێ:" بەعزێ فیرقەی تر وەکو میرەیی، کاکلی، رۆدەیی، ئاخەسوریی. ئەمانە لەبەر کەمی لەناو باقی فیرقەکانا شاردراونەتەوە. عومومیان تەخمینەن دووصەدو پەنجا ماڵ دەبن و نیوەیان

دانیشتوو، نیوەیان گەڕیاون، بەئیعتباری عوموم پێیـان دەڵێن میکـایلی." ئـەم تایفـە سی ساڵ لەمەوبەر زۆر تەرەقییان بوو. لەحەدبـەدەر دەوڵەمەنـد بـوون خـۆم بـە فکـرم دێ باوکم کە فەتاح بەگە لەتەك (عەبدوڵڵا پاشا)دا کە بەشـی گـەورەنی میکـائیلی لـە حیسابی تەقسیماتی ئێلی کە لە بەینی بەگزادەدا کرابوو عایدی عەبدوڵڵا پاشا بـوو، بۆ ژمارەی بزن و مەڕ چوونە ناو میکایلی عەدەدی حەیوانیان گەیشتە سەدوبیـست هـەزار سەرو خۆم لە باوکم دەبیست دەیفەرموو سی هـەزار سـەر شـاراوەیان هـەبووە، ئێـستا ئەو دەوڵەتەیان نەماوەو لەو سـەردەمەدا تـەخمینی میکایلیـان بـە پێـنج یـەکی جـافی مرادیان دەکردو تەخمینەن سەد ماڵی وای تێدابوو کە هەزار لیرە پارەی نەقـدی ببـێ و زۆری سەر خێڵەکانیان حاجی بوون، سی ماڵ لەناو میکایلیا بوو کە ساحێبی ڕەووگبـوو یەعنی کە سەد (ماینی یەڵخی) بوو لە سـەحرادا، ئێـستا لـەو ماڵانـە چواریان نـەماوە، حاجی قادر کە باوکی حەسەنی قادرە بە تەنها سی سەد ماینی یـەڵخی بـووە لەمەوبـەر کە وەها دەوڵەمەند بوون پیاوی چاکیان زۆربوو ئەمما ئێستا کە فـەقیر بـوون خراپیـان زۆرە ئەوسا دزیان نەبوو، ئێستا پەیـدایان کـردووە، وەختـە بنووسـم بەقـەدەر گـەلآلی دزیان هەیە.

تێبینـی: زۆر خـاڵ و وشـە کوێلـە لـەم نووسـینەی کـەریم بەگـدا هـاتووە، کـە خوێندەواری ئەمڕۆ بەتایبەتی گەنجەکان بەلایانـەوە سـەیرەو یـاخود نـەیان بیـستووە، بەڵام بۆئەوەی زنجیرەی نووسینەکەی جەنابی کەریم بەگ تێك نەدەم، دوای نووسـینی کورتەی فەسڵەکانی تر: دەست دەکەم بەڕوونکردنەوەی ئەو شتانە (ج. ب).

فەسڵی سێیەم: بەیانی تایفەکانی جـاف لـە جـوانڕۆ کـە داخلـی ئەیالـەتی سـنەیەو ئەوانەیان کە هان لە ئەیالەتی کرماشانا:

بـۆ نموونـە باسـی یـەکێك لەوانـە وەك لـە دەسـتخەتەکەدا نووسـراوە دەکـەین (قوریادیی) هەشت سەد ماڵ دەبن. وان لە جوانڕۆدا گەڕیاون و دانیشتووشیان هەیە لـە جوانڕۆو مەحاڵی خۆیانا، بەهاوین دەچنە کەژی (شاهۆو بەنی گەن).

ئەمانە ئێلی حەبیبوڵڵاخانن، سێ سەد سوارو سێ سەد پیادەی تفەنگداریان دەبێ.

فەسڵی چوارەم: نووسەر دەڵێت:" ئەم عەشیرەتی جافە کە هان لە عێراقدا بۆچی پێیان دەڵێن جافی مورادی؟ ئەمانە لە پێش (زاهیر بەگ)دا لە زەمانی سەڵتەنەتی سەفەوییەکاندا لە خەلافەی (سولتان موراد خانی ڕابیع)دا هاتوونە کوردستانی بابان.

موددەتێ لە خاکی بابان و شارەزوورا دەمێننەوە، تێکڕا دەچنەوە بۆ جوانڕۆ، گەلاڵی دەمێننەوە لە شارەزوور ناگەڕێنەوە. جافەکانی جوانڕۆو ئەیالەتی کرماشان بەمان دەڵێن جافی مورادی، تێکرا لەپاش مودەتێکی زۆر کە تەسادوفی زەمانی زاهیر بەگ و تاهیر بەگ دەکا، کە ئەولادی یار ئەحمەد بەگی کوڕی (سەیفوڵڵا بەگی کوڕی سەید ئەحمەد بەگ)ی ڕەئیسی ئێلی جافن، کە جاف زۆردەبن و زیادی نفوسیان دەبێ، زاهیر بەگ بەخۆی و چوار سەد ماڵ لەتەك (خانە بەگ)دا، کە باوکی گەورەی بەگزادەی (وەلەد بەگی)ە، دێنە بانی خێڵان لە تەئریخی هەزارو سەدو پەنجای هیجریداو هاتنی ئەوەی جاف لە زەمانی سوڵتان مورادی ڕابیعدا لە تەئریخی هەزارو چل و پێنجی هیجریدا بووە، ئەمانە لەبانی خێڵان دەمێننەوە."

فەسڵی پێنجەم: (بەحسی کوڕەکانی زاهیر بەگ کە لەپاش خۆیماونەوە).

سلێمان بەگ برا گەورە بووەو پیاوێکی ژیرو بەتەکبیرو لەسەرخۆ، قادر بەگیش برای بچووك پیاوێکی ئازاو چاونەترس بووە.

لە سەردەمی ئەم دووبرایەدا هەرایەك دەقەومێ لەبەینی گەلاڵی کە جافن و گەڵباخی لەلایەك و لەبەینی خالید بەگی وەڵەد بەگیداو باقی بەگزادەکانی و تایفەکانی تری جافدا لەلایەکی ترەوە، لەو شەڕەدا زۆر لە گەلاڵی و گەڵباخی و کەڵهوڕ دەکوژرێن. ئەم عەشرەتەی کەڵهوڕو گەڵباخی ڕووده‌کەنەوە خاکی ئێران و گەلاڵی دەمێننەوە، لەوەوە ئەم دوو برایە هێزی زیاتر بەسەر عەشرەتەکەیانا پەیدا دەکەن و هەموو جاف لەدەوریان کۆدەبنەوە، نزیکەی شانزە هەزار ماڵێك پێك دەهێنن، بۆ

ئیدارەی عەشرەتەکە ڕەسمیان لەسەر داناون کە بە قسەی کەریم بەگ ئەم ڕەسمە لە حەوسەد ساڵەوە هەیە، واتا حکومەت نەلە ئێران و نەحکومەتی بابان لە عێراقدا سەرانەی مەڕو بزنیان نەسەندووە، بەڵکو ئەمە تەرککراوە بۆ بەگزادە، قادر بەگ ئەساسێکی عەسکەری عەشایریی بۆ خۆیان داناوە، سێ سەد ماڵی لە عمومی تایفەکانی جاف هەڵبژاردووە، کە ناویان نراوە (پشتماڵە) کە ماین و تفەنگ، ڕم و دەمانچە کە ئەسبابی شەڕی ئەو سەردەمە بوون پێیان بەخشیون و تائیفەی (عەمەڵە) کە سێ سەدو پەنجا ماڵ دەبن، ئەوانیش هەر بۆ ئەم مەبەسە سەدو پەنجا ماڵیان لەگەڵ پەنجا سوار لە تائیفەی (بەراخی) ئەمانیش هەموو لە (تکلیف) بەدەر بوون وەك پشتماڵەو عەمەلە سوارەی بەردەست بوون. جگەلەوەی بەرات و مەعاشیان هەبووەو لە (وێرگوی شەخسی– خەرج) خاریج کراون. گشت ئەم سوارانە نزیکەی پێنج سەدو پەنجا کەس بوون، وەلەد بەگ کوڕی خانە بەگیش نزیکەی سەدو پەنجا سوارەی هەبووە کە ئەمانیش تابیعی فیکری سلێمان بەگ و قادر بەگ بوون. قادر بەگ نەوەی نەبووە، بەڵام سلێمان بەگ دووکوڕی هەبووە، قادر بەگ و کەیخوسرەو بەگ.

فەسڵی شەشەم: لەم فەسڵەدا کەریم بەگ باسی سەرهەڵدانی (بارام بەگ کوڕی میرە بەگ) دەکات کە بە فیتنەیی لای بابانەکان سەرۆکایەتی عەشرەت دەگرێتە دەس، کە ئامۆزای قادر بەگ و کەیخسرەو بەگ بووە، ناچار قادر بەگ و کەیخسرەو بەگ دەچنە (یەگنجەو بابۆلان)و سێ ساڵ لەوێ دەمێننەوە، تا عەشیرەت بە جارێك هەڵدەستن نزیکەی شەش هەزار تفەنگچی قادر بەگ و کەیخسرەو بەگ دەهێننەوە ناو خاکی بابان و ئەمان دەکەنەوە بە سەرۆکی خۆیان و هەڕەشە لە بابانەکانیش دەکەن ئەگەر بێتو دەست لەکاریان وەربدەن ئیدارەی ئەوانیش تێك دەدەن، حاکمی بەبە لەم کاتەدا سلێمان پاشا باوکی ئەحمەد پاشا دەبێ (١٨٣٥– ١٨٣٩) ساڵەکانی حوکمی سلێمان پاشا بووە (ج. ب). سلێمان پاشا گەلێك دڵنەواییان دەکات و جۆگەی (دەلێن و مالوان و موان)یان پێ دەبەخشێ لەگەڵ ناوچەی هەڵەبجەو پێنجوین و سرۆچك، هەر

بەوەوە ناوەستێ، دواوی ژنیشیان لێ دەکات بۆئەوەی پەیوەندیان بەهێزتر بێت، بەم بۆنەیەوە (پەریزاد خانم کچی وەلەد بەگ) دەدرێ بە سلێمان پاشا، لەو کچە ئەحمەد پاشاو عەبدوڵلا پاشاو محەمەد پاشای باوکی حەمدی بەگی لێ دەبێ.

قادر بەگ لەساڵی (١٢٠٠ك) بەرامبەر (١٧٨٥–١٧٨٦ ز) بەڕەحمەت دەچێ، محەمەد بەگی کوڕی منداڵ دەبێت لە دەوری دوانزە ساڵیدا، کەیخسرەو بەگی مامەی کاروباری دەگرێتە دەست و غەدر لەم منداڵە دەکات و هەموو خەرج و پیتاك و تەکالیف بۆخۆی وەردەگرێ، لەسەرئەوە حاکمی بەبە دەکەوێتە بەینەوە، دێهات و عەشرەت لە بەینیاندا بەش دەکات شارەزوورو ناوچەی پێنجوین بۆ کەیخسرەو بوو باقی بۆ محەمەد بەگ ئەویش سەدوپەنجا ماڵ پشتماڵە بۆ خۆی دادەنێ، پیاوێکی ئازاو ئیشکەر بووە، بەگزادەی (بارام بەگ)ی هەموو ئەولادی ئەون و شەش کوڕی بووە، (بارام بەگ، میران بەگ، ئەمین بەگ عەزیز بەگ، ئەحمەد بەگ، فەتاح بەگ)، بەڵام هەر لە زەمانی کەیخوسرەو بەگەوە ڕیاسەتی عمومی جاف و بەگزادە بەدەست کەیخوسەرەو بەگ کوڕو کوڕەزایەوە بووە تاکو دوای ئینقرازی حکومەتی بابان لە تەئریخی (١٢٦٦ ھ) بەرامبەر (١٨٤٩–١٨٥٠ ز ج ب) بەڕەحمەت. چووە پیاوێکی موسوڵمان و خاوەن ئیحسان بووە. ماڵی وەك تەکیە بووە. هەموو ساڵێ سەد کەسی فەقیری لەسەر حسابی خۆی ناردووە بۆ حەج، پاش خۆی پێنج کوڕی بەجێهێشتووە: سلێمان بەگ، قادر بەگ، عەبدوڵلا بەگ، محەمەد بەگ و عەبدولڕەحمان بەگ.

فەسڵی حەوتەم: لە تەئریخی (١٢٤٤ ك)بەرامبەر(١٨٢٨ ز) (سلێمان بەگ ئەرشەدی) ئەولادی کەیخسرەو بەگ لەشوێنی باوکی دادەنیشێ، لەساڵی (١٢٤٥ ك)، لەشکری والی سنە دێتە سەر سلێمانی: حاکمی بەبە تەڵەبی یاریدە لە سلێمان بەگ دەکات ئەویش دوو هەزار سوار لەگەڵ عەبدوڵلا بەگی برایدا دەنێرێ بۆ سلێمانی، لە گردەگرۆی (باکوری سلێمانی. بەقەد شاخی گۆیژەوە– ج. ب) لەشکری بابان بە جافەوە دوای هەشت نۆ سەعات شەڕ لەشکری ئێران دەشکێنن و ڕاویان دەنێن، لە

ئاخری شەڕدا گوللەیەك تەسادوفی قاچی عەبدوڵڵا بەگ دەكات، زۆركەم زامار دەبێت، لە تەك ئەوەشدا كە زامەكەی زۆر بێ ئەهمیەت دەبێ كەچی پێی دەمرێ و ئێستا قەبری عەبدوڵڵا بەگ لە مەقبەرەی حاكماتی بەبە لە گردی سەیوان لە سلێمانیدایە، (لەدواییدا دەگەڕێینەوە سەر ئەم باسە، چونكە تاویلاتی جۆراو جۆری لەسەرە، یەكێك لەو تاویلاتە هەڵانە لە رۆمانەكەی خوسرەو بەگی جافدایە (پاشایان كوشت و لە عەرەبیەكەشیا (قتلوا الباشا) دوپات بۆتەوە– ج. ب).

لێرەدا جەنابی كەریم بەگ زۆر جوانی فەرمووە كە دەڵێت:"بۆ محافزەی تێكنەچوونی ئیستیقلالی بابان زۆر لە بەگزادەكانی جاف و پیاوی خاكی جاف كوژراون و بەم رەنگە رۆیون و خۆیان فیدای وەتەنی كورد كردوەو ناویشیان نییە، ئەمەش بە واسیتەی ئەمەوەیە كە ئومەراو پاشاكانی كورد موبالاتیان بە تەئریخی كورد نەكردوەو تیكرار دەینووسم و بەیانی دلگیری دەكەم كە رابردووی هەموو میلەتێ ئەچێتە غەوری تەئریخەوە، ئەمما رابردووی كوردی بێ چارە چۆتە ژێر خاك و خۆڵی بێ تەئریخییەوە، ئەگەرنا دەتوانم بنوسم بۆ محافەزەت كردنی ئەم خاكە كەمەی بابانە، نیوەی میللەتەكەی خوێنی خۆی رژاندوەو ناویشیان نییە).

دوای ئەوە كەریم بەگ باسی عەبدوڵڵا بەگ دەكات و بەكوژراو ناوی دەباو دەڵێ:" عومری بیست و دووساڵ بووە كوڕێكی زۆر لاوچاك و جوان بووەو جوانی و شەوكەتی لە كوردستانی بابان و ئەردەڵانا مەشهور بووە."

پیاوێكی زۆر موتەدەین و تەحصیلی جاری ئەو وەختەی زۆر تەواو بووە.

لە تەئریخی (١٢٤٨ ك) عەسكەرێكی زۆری ئێرانی لە ئەیالەتی كرماشانەوە دەچنە سەر (قادر میروەیسی و تایشەیی) سەدانی و بەدلخی كە لەو ناوەدا نیشتەجێ دەبن و بەحەسەب جافیەتی دەكەونە فریایان و قادر بەگ كەیخسرەو بەگیش دەگات بەفریایانا، سەدانی و بەدلخی بار پێ دەكات بۆ ئەم بەری سیروان واتا لە خاكی ئێران دووریان دەخاتەوە، لەو شەڕی ئێرانەدا قادر بەگ گوللەیەك لێیدەدا دەبێ بەهۆی

وەفاتی، سلێمان بەگی براشی لە ئەسەفی ئەودا کوتوپڕ نەخۆش دەکەوێ لەدوای دوو ڕۆژ ئەویش بەڕەحمەت دەچێ. هیچیان کوڕیان نەبووە.

دوای مردنی ئەم سێ برایە محەمەد پاشا کە برایان بووە بە عومری شانزە ساڵییەوە لەدوایان بەجێ دەمێنێ،( محەمەد بەگ قادر بەگی سلێمان بەگ) کە ئامۆزایان دەبێ و لەو وەختەدا دەسەڵاتدار دەبێت، تەماع دەکاتە ئێل و پشتماڵەی محەمەد پاشاو لەکاتی تەعزێدا حوکم لە پشتماڵەی محەمەد پاشا دەکات، باریان پێ بکات و بیان باتە لای خۆی، پیاوە گەورەکانی پشتماڵە لەتەک گەورەی عەمەلەو شاتریدا تەدبیر دەکەن بۆ مەنعی ئەمە، دەچنە لای محەمەد بەگ و تێی دەگەیەنن، ئەوان ئەمە قبوڵ ناکەن و محەمەد پاشا با منداڵیش بێت نایدەن بەدەستەوەو هەرچی تەکلیفی ئێلو عەشیرەتی هەیە ئەوان گردی دەکەنەوەو بۆ ئیدارەی حەمە پاشاو پشتماڵە عەمەلەو لەشکر خەرجی دەکەن، لە عەینی وەختا کچی محەمەدی برایم ڕەئیسی فیرقەی برایمی دەبێ لە شاتری لە حەمە پاشای مارە دەکەن، ئەو ژنە دایکی مەحمود پاشاو عوسمان پاشایە.

٣

لەم بەشەدا باسی کورتەیەکی تەئریخی جافم کردووە لەبەر ڕۆشنایی کتێبەکەی کەریم بەگ، بۆیە ئەمەشم کردووە، چونکە ژمارەی ئەو کتێبە چاپکراوە کەمە دەست هەموو کەس ناکەوێ بیخوێنێتەوە، هەروەها بۆئەوەی کە لەمەودوا دەستمکرد بە لێکۆڵینەوەو نرخاندن و ڕەخنەگرتن، خوێندەواری بەڕێز ئەگەر بە تەواوەتی لە شتەکە ئاگادار نەبن، بەلای کەمەوە تۆزێك لە ناوەڕۆکی کتێبەکە خەبەردار بن.

لە بەشی دووەمدا کورتەی حەوت فەسڵمان لە کتێبەکە پێشکەش کرد. ئینجا دێینە سەر فەسڵەکانی تر.

فەسڵی هەشتەم: ئەم فەسڵە (باسی زەمانی ڕیئاسەتی محەمەد پاشایە)و لەدواییدا کوشتنی.

کەریم بەگ دەفەرمووێ:" ساڵی (١٢٤٨ ك) بەرامبەر (١٨٣٢–١٨٣٣ ز) محەمەد پاشا بە عومری شانزە ساڵییەوە دەبێ بە ڕەئیسی عومومی جاف و بەگزادەو ئەم ڕیئاسەتە تا ساڵی (١٢٩٩ ك) بەرامبەر (١٨٨١–١٨٨٢ ز) دەوام دەکات."جا لەبەرئەوەی ئەم فەسڵە گرنگەو خاڵی بە بەهای زۆری تێدایەو بۆئەوەی خوێنەری بەڕێز سەری لێ تێك نەچێت من بە ژمارە ئاماژە بۆ ئەو خاڵانە یەکە یەکە دەکەم بەمجۆرە:

١ـ محەمەد پاشا لەپێش هەموو شتێکدا دەستدەکات بە زیادکردنی سوارەی پشتماڵەو عەمەلە، لە تەرخانی و وردە بەگزادە. (سوارەی مەخسوسی) خۆی دەگەیەنێتە شەش سەد سوار وڵاخیان دەداتی (بەشەرتێ لە بەهارو هاویندا سواری ئەسپ نەبن؟).

٢ـ ئەحمەد بەگی وەلەد بەگ ڕەئیسی فیرقەی وەلەد بەگی و خاڵۆی ئەحمەد پاشای حاکمی بەبە، پیاوێکی ئازاو بە دەسەڵات بووە لەناو جافداو ئەحمەد پاشای بابان گەرەکی دەبێ بیکا بە ڕەئیسی عومومی جاف کە لە شارەزوور دەبن. ئەحمەد پاشای بابان کاغەز دەنووسێ بۆ (حەمە پاشاو بۆ محەمەد بەگ قادر بەگ) کوڕەکانی حەمە پاشا ناچن، بەڵام (حەمە بەگی قادر بەگ)و هەر پێنج کوڕەکەی دەچن بۆ سلێمانی، ئەحمەد پاشا دەیانگرێ و دەیانێرێ بۆ کۆیە، لەوێ حەپسیان دەکات دوای ئەوە ئەحمەد بەگی وەلەد بەگ بەخۆی و گشت بەگزادەی وەلەد بەگی و دوو سەد سوارەوە دەچنە میوانی لای حەمە پاشا، ئەویش دوای نانخوارد دەنگی پیاوەکانی دەدا ئەحمەد بەگ خۆی و پشتماڵەکانیان لەلای (هۆمەرەسینان)ی پێنجوێنا تاڵان دەکاو خۆی و گشت عەشرەت دەچنەوە دیوی ئێران و گیراوەکانیش لەگەڵ خۆیانا دەبەن و لەپاشا دەچێتە سنە، والی سنە کە حاکمی ئەردەڵان دەبێت ئەویش هەر خوشکەزای ئەحمەد بەگ دەبێت ئەمەی پێناخۆش دەبێت و گلەیی دەکا لەلای میرزا

محەمەد ڕەزای وەزیری ئەردەلآن، ئەویش بەگوێرەی ئەو حقوقی سەداقەتەی لەبەینی خۆی و باوکی و جافەکاندا هەیبووە والی هێمن دەکاتەوە کە بە دەستکەوتنەوەی خالۆی و پیاوەکانی قەناعەت بکات، حەمە پاشاش کە لەوەپێش لە ئەردەلآن مەئیووس دەبێ خۆی و عومومی عەشرەت دێن بۆ جەبەلی (قزرابات)و شارەبان.

٣ـ محەمەد پاشا لەوێوە دەچێتە بەغدا لای وەزیر، ئەویش بۆ زوستان هەر لەو ناوەدا شوێنی بۆ دادەنێ و لەتەک حاکمی کرماشانا ڕێکدەکەوێ بۆ جێی هاوینەیان لە تەرەفی دالآهۆو سەرمیلوکرن. تا سێ سالّ خۆی و عەشرەت لەژێر ئیدارەی وەزیری بەغدادا دەبن.

٤ـ لەم بەینەدا ئەتراقی سلێمانی و شارەزوور بە دەست تەعەروزی جافەوە لە زەحمەتدا دەژین، ئەحمەد پاشای بابان خۆی و هەیئەتی حکومەتەکەی لەتەك دوو هەزار سواردا دێتە گردی شیروانە لەوێوە (عەزیزائاغای مەسرەف) دەنێرێتە لای محەمەد پاشا لە جەبەلی شارەبان، حەمە بەگی قادر بەگ و کوڕەکانیشی لەگەلّ خۆی هێناوە، حەمە پاشا ئەوەلّ جار ئیقناع نابێ، جاری دووەم عەزیزئاغای مەسرەف و عەزیز بەگی مامی و حەمە بەگی قادر بەگ و کوڕەکانی دەنێرێتە لای و حەمە پاشا ئیقناع دەبێ و عوزرخوایی بۆ دەهێنێتەوەو ئاشت دەبنەوە. حەمە پاشاو عەشرەت هەموو دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان. عەزیزئاغای مەسرەفیش هەر لەم سەفەرەدا لەگەلّ وەلەد بەگیشدا ڕێدەکەونەوەو حەمە پاشا تاکو ئینقرازی پاشاکانی بەبە کە سالّی (١٢٧٤ ك)بەرامبەر (١٨٥٧–١٨٥٨ ز) ئیدارەی عەشیرەتی جاف و شارەزووری کردووە.

٥ـ دوای بابانەکان و ئیستیلای تورك، ئەوانیش ئیدارەی حەمە پاشایان تێکنەداو هیچ تەکلیفێکیان لە جاف نەکرد تا زەمانی (عومەر پاشای سەردار) کە بە لەشکرێکی زۆرەوە دێتە شارەزوورو محەمەد پاشا بانگ دەکاتە. موان و لەوێ ڕەسم لەسەر جاف دادەنێ حەمە پاشا قبوولّ ناکات. لەمەدا دەبێ بە توڕەبوون و عومەر پاشا قسەی ڕەق

لەگەڵ حەمە پاشا دەکات و ئەویش بە ڕەقی جوابی دەداتەوەو بەجێی دەهێڵێ و دەنگ لە عومومی عەشرەتی جاف دەکات کە لە گوێ چەمی سیروان حازرین بۆ پەڕینەوە بۆ خاکی ئێران.

پیاوماقوڵانی کە دوای بابانەکان مابوونەوە وەك عەزیزئاغای مەسرەف و حاجی بەگ بە عومەر پاشا دەڵێن تۆ معامەلەی خراپت لەگەڵ محەمەد پاشادا کرد، چونکە ئەو نفوزی زۆری لە ئێراندا هەیە حکومەتی ئەردەڵان و شای ئێران خواخوایانە ئەم جافانە بچنەوە ئێران و ببن بە تەبەعەی ئەوان. عومەر پاشا زۆر پەشیمان دەبێتەوە، دەنێرێتەوە بە شوێن حەمە پاشاداو ئەم جارە زۆر حورمەتی دەگرێ و ڕوتبەی میری میرانی بۆ جەلب دەکاو تەشکیلاتی قەزای هەڵەبجەی بە قایمقامی بۆ دەکا، بەسورەتی موحبەت ڕازی دەکات کە ڕەسمی چل یەك لەمەڕو بزن بدەن بە حکومەت وەك (شامار لە قەتعەی عەرەبستاندا؟) ئەم ڕەسمە دەوامی کرد تا ئینقلابی عوسمانی و هاتنی نازم پاشا، محەمەد پاشا بە ڕیاسەتی جاف و قایمقامی هەڵەبجە مایەوە تا هەزارو دووسەدو نەوەی هجری.

٦ـ لەو تاریخەدا والی بە تەلگراف دەنووسێتە شوێن مەحمود پاشای کوڕە گەورەی حەمە پاشای جافەوە کە گەرمیان و کوێستانی دەکردو ماڵی لە قەڵای شیرانەدا بوو. دوای نیشتەجێبوون. گەڕیاوی عەشرەتی لێ دەکات وەعدی ئەرازیشیان پێدەدا بە تاپۆوە، مەحمود پاشا دەڵێت عەشرەت دانانیشن، لەو کاتەدا هەندێك لە شاتریەکان دەچنە لای قایمقامی خانەقین کە (ئەحمەد بەگی قادر پاشای بەبە) دەبێت، ئەوان دانیشتن قبووڵ دەکەن ئەرز وەردەگرن. مەحمود پاشا ئەوەی پێ ناخۆش دەبێت دەچێتە دەرەوە، وا تێدەگەن کە حکومەتی تورك فکری تێکچوونی لەگەڵیان هەیەو بڕیاری چوونەوە ئەودیو دەدەن، حەمە پاشاو ڕۆستەم بەگ سەرۆکی ئەوساکەی وەلەد بەگی بەسەد سوارێکەوە دەچنە کرماشان لای شاهزادە (عماد الدولە) حاکمی کرماشان و لەوێوە تەلەگراف دەنووسن بۆ (ناسرەدین شا)ی ئێران و ئەویش جواب

دەداتەوە کەچی لازمە بۆ محەمەد پاشاو عەشرەتی و تەبەعەی لە ویلایەتی سنەو کرماشان بۆیان بکەن و دلوای حەمە پاشاش دەکات بچێت بۆ تاران، ئەوسا حەمە پاشا بەخۆی و پەنجا سوارەوە دەچێتە تاران و لە تەرەف شاوە ئیستقبال دەکرێت و زۆر ئیحترامی دەگرێت و فرمانی ریاسەتی عوموومی عەشیرەتی جافی ئێران لەتەك (جوانرۆو قەسری شیرین و زەهاب و هورین شێخان) تاکو حدودی عوسمانی کە سیروان بووە، لەگەڵ مانگی حەوت هەزار تمەندا بۆیان دەردەکات و خەنجەرێکی مورەسەع و زۆرشتی تری دەداتێ لەدواییدا محەمەد پاشا بە مەسروری دەگەرێتەوە ماڵی خۆی لە جوانرۆ. عەشرەتیش کۆمەڵ کۆمەڵ دەبەنەوە بۆ لای، هەرچەندە رێگایان پێدەگرن، بەڵام دوای شەڕ جاف دەگەنە شاهۆ لای حەمە پاشا، ساڵی (١٢٩٥ ك)بەرامبەر(١٨٧٨ ز) مەحمود پاشا کە بە ماڵەوە لە بەغدا دەبێ و باوکی پارەی بۆ دەنێرێ لە (قزلبات و دەککەو زهاوو شوێنی ترو لەسەر قەڵاو کوکس لە قەزای کفری و ئاویارە لە لیوای سلێمانی) موڵك دەکرێت.

٧- والی بەغدا (تەحسین پاشا) دەبێت کە سەیردەکات لیوای سلێمانی و کەرکوك لە جاف خاڵی بووە، خەبەر بە ئەستەمبوڵ دەدا، ئەوانیش لەوێوە جوابی دەدەنەوە کە هەرچۆنێك بێت حەمە پاشا رازی بکات و بیهێنێتەوە، چونکە دەیانەوێ تەبەعیەتی عەشرەتی جاف لە دەست ئێران دەربکەن و بینەوە بۆ تەبەعەی عوسمانی، بۆ ئەم مەبەستە والی بەغدا تەکلیفی مەحمود پاشا دەکات کە بچێت باوکی بهێنێتەوە، دووجار دەچێت حەمە پاشا هەر نایەتەوەو جاری سێهەم مەحمود پاشاو عەبدوڵڵا پاشاو بەعزێکی تر لە بەگزادە محەمەد پاشا ئیقناع دەکەن بێتەوە کە ئەمری (مەدارەت)و (ئیرادەی سەنیە)ی بۆ قایمقامی هەڵەبجەو ریاسەتی جاف بۆ دەردەکەن و ئەو ئەرازیانەی درابوون بە بەعزێ لە جاف بۆ دانیشتن هەموویان بدرێتێ. لەسەر ئەمە محەمەد پاشا دێتەوەو هەتا ساڵی (١٢٩٩) ئیدارەی جافی هەڵەبجەی کرد کە دەکاتە (١٨٨١-١٨٨٢ ز).

٨ـ قیسمێ لەو جافانەی لەم بەینـەدا خیانـەتیان کردبـوو، حەمـە پاشـا گرتنـی دوو سێیەکیان لە حەپسدا مردن. کەسوکاریان بەمە موتەئەسیر بـوون. هەنـدێ ئەشخاسـی کەش تەحریکات و فیتنەیی لەناوا کردن لەکاتێکدا کە حەمە پاشا لە (چیمەنی برایم کـە چوار سەد ماڵ دەبن و سەیردەکەن پاشا ئەوەندەی سوار لەلا نییە، بەفرسەتی دەزانن دەچنە سەر محەمەد پاشا هەر بەشەو دەیکوژن، کوڕەکانی مـەحمود پاشـاو عوسمـان پاشا لە سلێمانی دەبن، حەسەن بەگی کوڕی لە هەڵەبجەو سلێمان بەگ و حەمـە عـەلی بەگ و قادر بەگ و فەتاح بەگ لە پشتماڵە دەبن.

ئـیتر فیرقـەی (کـەرەم وەیـسی) باردەکـەن و ڕوو دەکەنـە هـەر تاقمێـك لـەجاف قبووڵیـان ناکـەن، ناچـار بـەدوای ئـەوەی تـاڵان دەکـرێن ڕوو دەکەنـە لای جـوامێری هەمەوەنـد، ئـەویش لەبەرئـەوەی کـە پـەنایان بـۆ هێنـاوە دەریـان ناکـاو ناشـتوانێ موقابەلەی کوڕانی حەمە پاشا کات، ئەویش لە تەکیانا فیرار دەکات تا دەگەنە قەسری شیرین عەشایەری جافیش بـە سـەرۆکایەتی کوڕەکـانی حەمـە پاشـا دوایـان دەکـەون، دەچنە زەهاو لەوێشەوە بەرەو (داڵەهۆ) فیرار دەکـەن، بـەڵام لـەوێرا دەوریـان دەدەن، دەروێـش ئاغـای بـرای جـوامێرو قـادری حەمەڕەشـی ئـامۆزای دەکـوژرێن، جگـە لـە تاڵانکردن چل کەسیشیان لێ دەکوژن و باقی عەشرەت دەگەڕێتەوە.

٩ــ حەمـە پاشـا لـە ڕەئیـسە پێـشوەکانی جـاف لـە هـەموویان دەسـترۆیوترو دەوڵەمەنـدتر بـووە، تیجـارەتێکی زۆر مـوهیمی کـردووە. ئەغلـەبی صـەرفیاتی لـە تیجارەتی خۆی بووە. دائما بیست هەزار سەرمەڕی بووەو هەشت سـەد مـاینی یـەڵخی لـە سـەحرادا بـووە. (خـزر ئاغـای هەمەوەنـد) بـاوکی (مـەحمود خـزری سـەرەوەند) لەبەرئەوەی تەعەروزی بەزویاتی محەمەد پاشا بـوو، فرسـەتی لێ هێنـا خـۆی و سـی و پێنج کەسانی کوشت، هەروەها پێنجوێن و هەڵەبجە دوو قەسـەبەی بـچووك بـوون ئـەو کردنی بە شار، قەیسەری و حەمام و چایخانەی تیادا دروست کردن. قـەڵای شـیروانەی دروستکرد لەگەڵ قیسمێ لە (قەڵای کانی چەقەڵ):

فەسڵی نۆهەم: باسی ڕیاسەتی کوڕەکانی محەمەد پاشا.

لە تەئریخی (١٢٩٩ ھ) مەحمود پاشا کوڕە گەورەی حەمە پاشا بوویە ڕەئیسی عومومی جاف و بەگزادەو قایمقامی هەڵەبجەو لەساڵی (١٣٠١ ھ)دا لە تەرەف (سوڵتان حەمید)ەوە ڕوتبەی میری میرانی بۆ هات و تا ساڵی (١٣٠٧ ھ) زۆر بە تەرەقی لە هەڵەبجەدا بوو ئەوساکە (وەسمان پاشا) بەسەر پشتماڵەوە بوو. (نامق پاشای میر ئالا) بۆ تەشکیلاتی (ئەرازی سنیە) دێتە شارەزوور. ماڵی وەسمان پاشا لەوێ زۆر خزمەت دەکرێ و پێخۆش دەبێ، بەڵام کە دەچێتە هەڵەبجە مەحمود پاشا موبالاتی پێ ناکا، کابرا لەمە دڵگیردەبێ کە دەگەڕێتەوە سلێمانی تەلگراف بۆ سوڵتان عەبدولحەمید دەکات نارەزایی لە مەحمود پاشا پیشان دەدلو داوا دەکات وەسمان پاشا بکرێ بە قایمقامی هەڵەبجە. سوڵتان لەوەڵامدا موافەقەت دەکات و مەحمود دەکات بە موتەسەریفی (ئورفە)، دوای بەینێك مەحمود بە دیاری و لیرەی زۆرەوە لەگەڵ حەمە عەلی بەگی برای دوای مانەوەی ساڵێك لە ئەستەمبوڵ حەمە عەلی بەگی برای دەگەڕێتەوە ئەویش لەگەڵ شێخ قادری شێخ عوبەیدوڵڵاو کوڕی بەدرخان پاشادا لە ئەستەمبوڵ یەك دەگرن و ئیتیحادێکی قەومییەت دروست دەکەن و قەرار دەدەن هەرسێکیان فیرار بکەن، مەحمود پاشا بۆی دەردەچێ بە ڕێی باکوری ڕوسیادا لەوێوە دەگاتە ڕەشت و لەوێوە بۆ (چوارشەمە بازاڕ) هەمووی بە تەبدیلی قیافەت و لەوێوە بۆ (بیجار) فەتاح بەگی برای لەم لاوە ئەویش لەگەڵ چەند سوارێکدا دەچێت بۆ یارمەتی دەرچوونی. سوڵتان عەبدولحەمید کە خەبەر وەردەگرێ تەلگراف بۆ (ناسرەدین پاشا) دەنووسێ کە دەردەسی بکەن، ئەو ئەمر دەدا بە (عەلی ڕەزاخان)ی حاکمی بیجار کە ئیحترامی بگرن و ئیستقبالی بکەن، لەولاشەوە عەشایەر دێن بەپیریەوەو دێتەوە لەم دواییەدا حکومەتی تورك دەکەوێتە پەلەپەل، چوار ڕۆژ دوای هاتنەوەی مەحمود پاشا دوو هەزار عەسکەری پیادەی تورك دێن بۆ هەڵەبجە، مەحمود پاشا دوای سێ چوار ڕۆژ لەگەڵ پشتماڵە باریان کرد بۆ قەزای کفری تا گەیشتە کانی چەقەڵ

لەدوایيدا لەسەر داوای ئەسرەت پاشای بەغداو قەول و تەئمینی مەحمود پاشا دەچێتە بەغداو ئەسرەت پاشا زۆر هەوڵدەدا نەینێرێتە ئەستەمبوڵ، جواب دێتەوە کە قابیل نیە دەبێ بچێتە ئەستەمبوڵ، ئەمیش داوا دەکات بەرێگای موسڵدا بڕوات، بەڵام لەلای کفرییەوە بۆئەوەی پارەو ئەسباب لەگەڵ خۆی بەرێ ئەوانیش تابور ئاغاسیەك و پانزە سواری لەگەڵ دەنێرن، لەگەڵ گەیشتنی ئەوان بۆ قەرەتەپە، هەزارو پێنج سەد سوار لە عەشایەرو بەگزادە داخڵ دەبن، مەحمود پاشا بەو لەشکرەوە دەگاتە کانی چەقەڵ تاکو بەهار لەناو پشتماڵەدا دادەنیشێت دوای ئەوە لە سلێمانییەوە خەبەری بۆ دەنێرن کە دوو هەزار سوارەو چوار هەزار عەسکەری پیادە بەرەو ڕووی هاتووە. مەحمود پاشا دەچێتە کەژی ئەودیوەو لە سیروان دەپەڕێتەوەو لەوێوە دەچێتە (بانی بنوك) لەسەر کەژی هەورامان و لەوەدوا گەڕاوە زمناکوو لەوێوە تەلەگرافێکی نارد کە ئەو بە عەسکەر ناگیرێ بە شەرتی مەئموری حکومەت لە تەکیانەبێ و لە هەموو شارێکا سەربەست بێ خۆی دەچێتە خزمەت سوڵتان، سوڵتانیش ئەمە قبوڵ دەکات.

مەحمود پاشا چووە ئەستەمبوڵ، دوای مانەوەی ساڵێك لەوێ سوڵتان ئیعادەی مەرحەمەتی لەتەکدا کرد، مەعاشی بۆ بڕینەوە، پانزە مقاتەعەی گەورەی لە قەزای کفری و قەزای هەڵەبجەو لە سلێمانی دایە لەگەڵ پێنج هەزار لیرە پاشا ناردیەوە ناو جاف و شارەزوور کردیەوە بە ڕەئیسی جاف، لەساڵی (١٣١٢ ك) هاتەوە شارەزوور تاکو (١٣٢٦ ك) لە کەماڵی تەرەقی و دەسترۆیندا بوو، بە نەوعێك لە سنەو کرماشان زیاتر دەستی دەڕۆیی تاکو لەناو جافدا، براکانی لەم بەینەدا هەموو مردن خۆشی پیربوو بوو تاقەتی بەعزێ معامەلەی دنیایی نەمابوو، حکومەتی تورکیش لەپاش مەشروتیەت فکریان گۆڕا. مەحمود پاشا دەرکەناری وامایەوە. مەحمود پاشا لە( ١٥ ی شەعبانی ساڵی ١٣٣٩)دا (١٩٢٠-١٩٢١ ز) بەڕەحمەت چوو لە جامیعی قزلابات نێژرا.

فەسڵی دەهەم: باسی ڕیاسەتی عوسمان پاشایە. وەسمان پاشا لە عومری شانزە تا عومری گەیشتە (٦٨ ساڵ) بەرەحمەت چوو لە قایمقامی هەڵبجەو ڕیاسەتی جاف ڕۆژێك خاریج نەبووە.

فەسڵی یانزەهەم: باسی کوڕەزاکانی محەمەد پاشایە.

تێبینی: ئێمە باسی ئەو کوڕو کوڕەزایانەی محەمەد پاشا لێرەدا ناکەین، دەبووایە (د. حەسەن جاف) لە پێشەکییەکەی خۆیدا ئاماژەی بۆ هەموو بەگزادە بکردایە.

فەسڵی دوانزەهەم: باسی ئادابی جاف و بەگزادەو ڕەئیسیان و بە چەند تکلیف موکەللەفبوون کە بیدەن بە ڕەئیسی خۆیان: کە ئەمانەن.

١- (خەرج) هەر ماڵێك لە گەڕیاو موکەللەفبووە لە بیست قرانەوە تا هەزار قران ئەمەیان داوە بە ڕەئیسی جاف، سوارەی خسوسی عەمە لەو پشتماڵەو سەدانی و بەدلخی خاریج بوون. عومومی ساڵی دوانزە هەزار لیرەی عوسمانی زیاتر بووە

٢- سوورانە. هەرکەس ژنێکی لەناو خۆیدا یا بە غەیری جاف بە شوودابێ هەر کەسە بە قەدەر حاڵی خۆی دەبووا بە هێستر یا ماین یا تفەنگ یا گایەك یا بیست قران تا هەزار بدا، بەڵام ئەگەر پیاوێکی جاف لە غەیری جاف ژنێکی بخواستایە سوورانەی لێ نەسێنراوە.

٣- ئەگەر پیاوێکی جاف بکوژرایە لەناوی خۆیدا هەزار قران لە قاتیل دەسێنرا. سێ سەد قرانی عائدی سوارەی خسوسی ڕەئیس بووە، بەڵام ئەگەر ڕەئیسی فیرقە خۆی یا کوڕی یا برای بکوژرایە تا سەد لیرە لەگەڵ ماین و تفەنگ لەگەڵ ژنێکا بۆ واریثی کوژراو مارە دەکرا.

٤- پێنج یەکی حقوق لەو کەسانە دەسێنرا کە شکات دەکەن لە یەکێکی تر لەو پارەیەی لە داوالێکراو (مدعی علیە- ج. ب) سەندراوە بۆ داواکەر(مدعی). قازی لای ڕەئیس بووەو موافقی شەرع تەحسیل کراوە.

جگەلەوە تەكليفی ڕۆنانەو لبادانەش تا تەئريخی (١٢٩٥ ك) دەوامی كردووەو هەروەها ڕەسمی جەزاش هەبووە. ئەم ڕەسمانەی تا ساڵی (١٣٢٦ ك) دەوامی كردووە، لە دوای ئینقلابی عوسمانی خەرج نەما، جاف موكلەفبوون بە ئەغنامی نەقدی.

جاف ئەدەبيان دەرحەق بە گەورە زۆربووە لە عوموومی جاف (٢٥ كەس) حەقی دانيشتنی مەجليسی ڕەئيس و بەعزێ لە بەگزادەی هەبووە.

دوای ئەوە كەريم بەگ دەفەرموێ: "ڕەئيسی ئاخريان كە خۆم بووم لەساڵی (١٩١٩)دا بە ئەمرو تەشكيلاتی حكومەتی ئینگليز بووم بە ڕەئيسی عوموومی جاف و ئەو تەشكيلاتە تا ساڵی (١٩٢٥) دەوامی كرد. ئيدارەكردن لەو تاريخەوە تەشكيلاتەكە نەما. جا ئەگەر منيش لەم ڕووەوە دواكەوتوو بم تەرزی ئيدارەم داخلی سەفحەی ئەم تەئريخە بكەن، ئومێد دەكەم لە حەق لانەدەن، چونكە زەمانی من زەمانی محەمەد پاشا مەحموود پاشا نەبوو".

فەسڵی سيانزەهەم: باسی ئەو شەڕانەی جافە لەناو خۆياندا و لەتەك غەيری جافا بوويانە:

١ـ لە (١٣٠١ ك)بەرامبەر (١٨٨٣–١٨٨٤ ز) (شاتری و هارونی و كەماڵەيی)و سەدانی بە عوموم دەرهەقی ڕۆغزايی و تەرخانی لە مەريواندا ئيتيفاقيان كرد لە (قەڵای خاو)ی نزيك پێنجوين شەڕێكی زۆرخراپ و گەورەيان بوو (١٥٠ )كەس لە شاتری و باقی فيرقەكانی تر كوژران. تەرخانی و ڕوغزايی بە تەوافوق هاتن نزيكەی ( ١٥ ) كەسيان لێ كوژرا. ئەم شەڕە مەشهورە بە (شەڕی قەڵای خاو). ئەم شەڕە تاكو (١٣٠٢)وە دەوامی كرد.

٢ـ لەو ساڵەدا ئەم جارە غەيرە ميكايلی عەمەلە و پشتماڵەو باقی تری جافی قەزای كفری لە تەك شاتريدا لە شكريان ڕاكێشا بۆ سەر ڕۆغزايی و تەرخانی لە (گامە خەلا) لەو شەڕەدا (٤٠) كەسی تر كوژران و هەر ڕوغزايی و تەرخانی موفق بوون.

٣ـ لەساڵی (١٣٠٩ ك)بەرامبەر (١٨٩١–١٨٩٢ ز) تەرخانی لەگەڵ ڕوغزاییدا شەڕیان بوو (٥–٦)کەس کوژرا. تەرخانی لە ڕوغزایی جیابوونەوە لەتەك شاتری و باقی جافدا بوون بەیەك و چوونە سەر ڕوغزایی و تاڵانیان کردن، ئەمەش پێی دەڵێن شەڕی (داری قەلان).

٤ـ تەرخانی و ڕوغزایی لەتەك داودەدا حەوت شەڕیان بووە، لە داودە هەمووی (١٥٠)کەس کوژراوەو لە ڕوغزایی و تەرخانی (٣٠) کەس کوژراوە.

٥ـ لە زەمانی محەمەد پاشادا جاف لەگەڵ هەورامانی تەختدا شەڕیان بووە. لەسەر ئەوەی بە گزادەیەکی وەلەد بەگ لە تەرەف حەیدەر بەگی باپیری مەحمودو خانی مەریوانەوە دەکوژرێ. حەیدەر بەگ ڕادەکا بۆ ناو هەورامی.

عمومی جاف لەشکر دەبەنە سەر هەورامان نزیکەی (١٠٠) کەس لە هەورامی دەکوژن و (ئەحمەد بەگی باسام بەگ) کە ڕەئیسی هەورامی دەبێ دەکوژرێ و ئەم شەڕە مەشهورە بە (شەڕی چەمی شامیان). لێرەدا نووسینەکەی کەریم بەگ کۆتایی هات. منیش هەر بەو جۆرەی کە خۆی نووسیبووی و بەو وشەو (عیبارەتانە) بەکورتی پێشکەشم کردن، لە بەشەکانی داهاتوودا ڕای خۆم دەردەبڕم و باسی هەندێك سەرچاوەی تر دەکەم لە عەشرەتی جاف.

٤

لە بەشەکانی پێشوودا زیاتر لە دووهەم و سێهەم کورتەی نووسینەکەی خوالێخۆشبوو کەریم بەگی جافمان خستە پێش چاوی خوێندەواری بەڕێز، ئنجا لەو بەشەو بەشەکانی دێن تێبینی خۆمان بەرامبەر بە کتێبی (تەئریخی جاف) کە کەریم بەگ نووسیویەتەوەو دکتۆر حەسەن جافی کوڕی کەریم بەگ لێی کۆڵیوەتەوە، لەگەڵ ئاماژە بۆ هەندێك سەرچاوە کە هەر پەیوەندیان بەم باسەوە هەیە دەردەبڕین.

ئێمە ئەوەی دەیڵێین لێرەدا تایبەتە بە جافی عیراقەوە، چونکە وەك لەمەوپێش ڕوونکرایەوە بەشێکی زۆریش جاف لە ئێراندا هەن.

## عەشرەت و ئێل و هۆز

خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی خاڵ لە بەرگی دووهەمی فەرهەنگەکەیا لە لاپەڕە (٣٦)دا دەڵێت:" عێل: چەند هۆزێکە بچنەوە سەر یەك باپیرە گەورە" لە بەرگی سێیەمدا لە لاپەڕەی (٤٠١)دا دەڵێت:"هۆز: چەند ماڵێکە کە بچنەوە سەر یەك تیرە". هەر لە لاپەڕە (٣٣٦ ی بەرگی یەکەمدا) دەڵێت: " تیرە: چەند هۆزێکە کە بچنەوە سەر ئێلێك" لە لاپەڕەی (٨٧ ی جزمی یەکەمدا) دەڵێت:" ئێل: عیل" و هیچی تر.

(لویس معلوف) لە (المنجد)دا لە لاپەڕە (٥٢٩)دا دەڵێت:"العشیرە، القبیلە، عشیرە الرجل بنوابیه الادنون جمعه عشائرو عشیرات" لە لاپەڕە (٦٣٩)دا دەڵێت:" القبیلە: بنواب واحد".

بەم پێیە هۆز دەچێتەوە سەر تیرە، تیرەش چەند هۆزێکە دەچێتەوە سەر ئێل: (ئێل یاخود عێل)یش چەند هۆزێکە دەچنەوە سەر یەك باپیرە گەورە.

لێرەدا ئێمە مەبەستمان یەکەم: ناوەکەیە بەکوردی کە بەرامبەرەکەی (عشیرە)ی عەرەبییە. لەڕاستیدا ئێمە تا ئێستا هەر وشەی (عەشیرەو عەشایەر)مان زیاتر بەکارهێناوە دوای ئەو عێل، یاخود (ئێل بەوەدا کە (ع) لە کوردیدا نییە). ئەوەتا شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەڵێت:"خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا— مێروولە نەچێ چاکە بەگژ قوللەی قافا"، چونکە دکتۆر حەسەن لە لاپەڕە (٢٤ ی تەئریخی جاف)دا (هۆزی جاف لە مێژوودا)ی بەکارهێناوە. مەبەستی دووهەممان جیاکردنەوەی (بەگزادە)یە لە (عیل)ی جاف، چونکە مێژوو ڕوونی نەکردۆتەوە بەگزادەی جاف دەچنەوە سەر چ تیرەیەك لە تیرەکانی جاف وەك ڕوغزایی، یاخود میکایلی، یاخود

بنەماڵەیەكی سەربەخۆو تیرەیەكی جیاوازن كە (بەگزادە یاخود سەرئێل) یا هەر ناوێكی تری مێژووینیان پێوترابێت.

ئەو پرسیارە ئەمڕۆش هەر خەڵك دەیكات، بەڵام چۆن؟ دەكەوێتە بەر گوێمان فڵان پارێزەر ناوی (محەمەد جاف)ەو فڵان نوشدار یاخود پزیشك ناوی (عبدالرحمن جاف)ە گورج دەكەوینە پرسیار ئایا ئەم پیاوە بەگزادەیە، یاخود لە عەشرەتی جافە؟

چونكە دكتۆر حەسەن هەر لە لاپەڕە (٢٤)ی تەئریخی جافدا دەڵێت:"مێژووی نووسراوی جاف لە زاهیر بەگی كوڕی یار ئەحمەد بەگەوە دەست پێدەكات" واتا مێژووی عەشرەتی جاف لەگەڵ پەیدابوونی سەرۆكەكانیانا دەست پێدەكات، جا ئایا پێش (زاهیر بەگ) لقێك لە لقەكانی ئێلی جاف لە عێراقدا هەر هیچ نەبووە؟ من بەش بەحاڵی خۆم لەو بڕوایەدام كە دەبێت هەر تیرەیەكیان لە عێراقدا بووبێت و مەرج نییە هەموو هەر لەو دیوەوە هاتبن. ئەمەش دادەنێین بۆ مێژوو كە زۆرشتی لە سنگدایەو هێشتا بۆی دەرنەخستوین و ڕوونی نەكردۆتەوە بۆمان.

## ئێلی جاف لەچاو ئێلەكانی تری كوردا

من خۆم كە بەڕێوەبەر (مدیری ناحیە)بووم لە ناحیەكانی تانجەرۆ (عەربەت)و خورماڵ و قەرەداغ وچناران (میرزا رۆستەم)و ئیشم كردووە، دەتوانم بڵێم ناحیەی تانجەروو شارەزوور بە یەكجار هەموو جافن، خورماڵ بەشی دەشتاییەكەی كە شارەزوور دەگرێتەوە ئەوانیش جاف بوون. قەرەداخیش زۆریەی دێهاتەكانی جاف نشین بوون، جگە لە میرزا ڕۆستەم كە جافە ڕەشكە لەوێ و لە ناحیەی بنگرد هەبوون. ئەمە نموونەیەك بوو هێنامەوەو دەردی دەڵێت"مشتێك بوو لە خەروارێك" خۆ ئەگەر جافی سورداش و بازیان و پێنجوین و هەڵەبجەو هەندێك لە شارباژێر ئینجا جافی گەرمیانی بچێتە سەر، بەلای منەوە گەورەترین عەشرەت پێكدەهێنێ لە ناوچەكەدا. مێژووی دووری جاف وەك (تەئریخی جاف) باسی دەكات دەگەڕێتەوە بۆ

ساڵەکانی (١٦٣٠–١٦٤٠)و پێشتریش، بەڵام مێژووی نزیکیان کە مستەر ریچ باسی دەکات لەساڵی (١٨٢٠)دا کە سەری سلێمانی داوەو لەوێوە چووە بەو دیولو گەڕاوەتەوە سلێمانی و بە هەمووی ماوەی چەند مانگێکی پێچووە. لەو گەشتەیا کەیخوسرەو بەگی جافی لە دیوانی مەحمود پاشای باباندا دیووە کە ئەو دەمە ئەو پاشای سلێمانی و حوکمدار بووە لەدواییدا چووە ناوچەی پێنجوین میوانی ماڵی کەیخەسرەو بەگ بووەو لەزۆر شوێن باسی ئێلی جاف و تیرەکانی و سەرۆکەکانی دەکات و لەلاپەڕە (٦٨)ی (رحلە ریچ في العراق سنە– ١٨٢٠)دا دەڵێت:"ان عشیرە الجاف ماکانت تاخذ نصیبها من ادارە شؤون کردستان الی ان حل عهد عبدالرحمن باشا بابان". ئەمە پێچەوانەی ئەو نووسینەی دکتۆر حەسەن جافە لە لاپەڕە (٣٧ ی تەئریخی جاف)دا گوایە حوکمڕانی ئەردەڵان و بابان لەسەر تێچێنی ئێران و عوسمانی دەست درێژیان کردۆتە سەر جاف من بۆ ئەردەڵانیەکان پاکانە ناکەم ، بەڵام بە قسەکانی (ریچ)دا دەردەکەوێت کە جاف و بەتایبەتی سەرۆکەکانیان لە سەردەمی مەحمود پاشای بابان و سلێمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای کوڕیا کە دوا میری بابان بوو هەمیشە لەپێش بوون، بەڵکو هێزێکی پاڵپشتی بابانەکان بوون جگەلەوەی ژن و ژنخوازی لە بەینابووەو خاڵ و خوارزای یەکتر بوون.

## گەرمیان و کوێستانی جاف

من خۆم قوتابی سەرەتایی و ناوەندبووم کە لە سلێمانی دەمخوێندو لە پشووی هاویندا دەچوومەوە ماڵی باوکم لە عەربەت کە ئەوسا باوکم لەوێ کاربەدەستی میریی بوو، جارێك (مەحمودی سەمین) ناوێك نازانم دەمراستی چ تیرەیەك بوو لە جاف! کە خۆی و هاوماڵەکانی هاتبوونە دێی (بێستانسور)و ئاژەڵەکانیان زەرعاتی دێیەکەیان خواردبوو، لە ڕێوە هاتبوون بەرەو کوێستان دەچوون. وادیاربوو خوا سەلامەتیان کات هەر بەو عەقڵیەتە کۆنە دەجوڵانەوە کە دەیان وت:" کورانە: کاڵت وەگوێزە". ئەمە

لەساڵەکانی چلەکاندا بوو کە ئەوساش هەر گەرمیان و کوێستانی هەندێك لە عەشرەت بەردەوامبووە، جا ڕەنگ هەیە یاخود من دڵنیام لەوەی کە گەنجی ئەمڕۆ هەرگیز عەقڵی گەرمیان و کوێستان نابڕێ چونکە نەبیستویەتی و نەدیویەتی و نەدەزانێ چییە.

بۆ نموونە ئێلی جاف لە شارەزووردا لە سەرەتاوە لە خانوو، یاخود لە دێهاتدا دانەمەزرابوون و جێگیرنەبوویوون، چونکە لە سەدەی هەڤدەوە تا هەژدەو نۆزدەش زۆریان دەوارنشین و جێگای خۆیان خۆشکردووەو بە چاوێکی سووك سەیری نیشتەجێ واتا دانیشتووی دێهاتەکانیان دەکردو دەیان وت ئەمانە تەمەڵ و ترسنۆکن بۆیە داسەکناون، خۆ ئەگەر ئازاو شەرگێڕ بوونایە وەك ئێمە هەمیشە لە شەڕو هاتوچۆدا دەبوون، بۆیە ناوی دانیشتووەکانیاندا (گۆران)و ناوی خۆشیان بە (کورد) هێشتەوە.

ئیتر گەلێك ناوو ناتۆرەی ناشرینیان لە گۆرانەکان دەناو گۆرانیە فۆلکلۆریەکەی کە منداڵان لە مانگەشەوا دەچوونە دەرەوەی ماڵ و دەیان وت:" (مانگەشەوە– تەق لەدەوە– گۆرانە هێنرەی چاو لە خەوە) مەبەستیان لە سووککردنی دانیشتوان بوو بەپێچەوانەی هەموو تێگەیشتنێکی (حەزاری) بۆیە سێ و دوویان لە زەرعات و بێستانیان نەدەکردو ئەگەر ئاژەڵەکانیان بەوێدا تێپەڕیایە. دەبووایە گۆران زەرعاتەکەی بگواستایەوە، بۆئەوەی ڕێ بۆ ئاژەڵەکانی ئەوان بەرەڵڵا بکات کە پیابڕۆن، نەك کاکەی کورد تۆزێك ئاژەڵەکەی بەڕێگایەکی ترا بەرێت و زیان بە دەغڵودانی جوتیارەکان نەگەیەنن.

وەك وتمان تیرەکانی جاف لە زستاندا لە گەرمیان و شارەزوورو ئەو جۆرە شوێنانە ئەمانەوەو دەمەو هاوین ڕەوە وڵاخ و ئاژەڵیان بەرەو کوێستانەکانی ئێران لێدەخوڕی، واتا لە هاویندا (لەوەڕ) کە بریتییە لە پوش و گیا کە خواردنی ئاژەڵە لەم دیو لای خۆمان وشکایی دەهات و نەدەما لەکاتێکدا کە لە کوێستانەکانی ئەودیو لە ئێران

لەبەرئەوەی کە سارنو فێنك بوون لە هاویندا لەوەڕ لەوێ لەوپەڕی ئەشونمادا بوو. هەر تاقمەو تیرەیەك شوێنی خۆی و ئاژەڵی لەو دیو جیاوازو تەرخانکراو بوو، تیرەیەکی تر توخنی نەدەکەوت، حکومەتی ئێرانیش سەرانە یاخود (ڕەسم) یاخود (باج)ی خۆی دەسەند، لەسەر ئەوە ڕێگای عەشایەری دەدا کە بچنە کوێستانەکانی ئێران ئەمە عەشرەتی جاف هەروەها (هەرکی، بلباس، بۆلی و بابولی) دەچوونە کوێستانەکانی (تەرگەوەڕ)و (مەرگەوەڕ)و دەیەها کوێستانی تر، مەڕوماڵاتیان باش دەلەوەڕان و هەمیشە گوانی مەڕو مانگاو بزنیان پڕ لە شیر بوو، لەو شیرە ڕۆن و پەنیرو جۆرەها شتی تریان دروستدەکردو دەیان فرۆشت و چ لەو دیو دەیان هێنایەوە بەم دیوا، جگەلە دۆو ماست و کەرەو سەرێژو قەیماخ و گەلێك شتی تر کە بۆ خواردنی خۆیان بەکاریان دەهێنا، هەر لەو بەرهەمانەش بە دەستی قورس و ڕەنگینەوە دەچوونە ماڵی پاشای جاف دیاری و خەرج و باجی خۆیان پێشکەش دەکردن، من خۆم کۆچ و ڕەوی عەشرەتی بۆلی و بابۆلیم لەناوچەی ناو دەشتدا دیووە کە بەرەو چیای (قەندیل)و بەو دیوتریشا لە هاویندا دەچوون. کۆچەکەیان بە دوو سەعات ڕۆیشتن بە بەردەممانا ئنجا تەواو بوو، وڵاخی بەرزە هەموو بار پێوە لەناو شەڵتەدا دوو یاخود چوار منداڵ بەسەر پشتی بارگیر یاخود هێسترەوە بوون، لغاوی وڵاخەکە بە دەست ژنێکەوە بوو کە منداڵێکیشی بەکۆڵەوە لە کۆڵوانەدا قایم کردبوو تەشیەکیشی بەدەستەوە بوو جارجار خوری پێ دەڕێسا.

عەشایەر لە کوێستان ئەمانەوە تاکو پاییزو ئنجا دەهاتنەوە بەم دیولو هەموو ساڵێك بەمجۆرە دەیانبردەسەر وەك جەنابی (کەریم بەگ)یش لە تەئریخی جافدا نووسیویەتی، هەر عەشرەتە ڕێگای تایبەتی خۆی هەبوو هەر بەو ڕێگایەدا دەڕۆیشت و دەبوو تیرەی تری پیا نەڕوات نەوەك وڵاخ و ئاژەڵیان تێکەڵاو ببێت، ئەگەر تیرەیەك بەپێچەوانەوە بجوڵایەوە شەڕو کوشتاری لێ دەکەوتەوە.

من نموونەیەکی ئەم کۆچ و ڕەوەم کردووە بە کورتەچیرۆك و بە سەردێڕی (گەرمیان و کوێستان) لەو کۆمەڵە چیرۆکەی بەناوی (سەی کەڵەك)ەوەیە لەساڵی (١٩٦٩)دا بڵاومکردۆتەوە کە ئەویش تیشکێك دەخاتە سەر ئەم کردەوە کۆنەی کە ئێستاو ئەمڕۆ دەتوانم بڵێم نەماوەو کۆتایی پێهاتووە.

## سەرهەڵدانی ئێلی جاف لە کوردستانی خوارووا وەك هێزێکی بەکار

دوای بەستنی دوا پەیمانی ئەرزڕۆم لە بەینی دەوڵەتی عوسمانی و ئێراندا کە لەساڵی (١٨٤٧)دا بوو، ئەو پەیمانەی کە پێکهاتن لە ڕێگای دبلۆماسیەت و گفتوگۆوە لەجیاتی شەڕو بەگژاکردنی ئەمارەتە کوردییەکانی وەك بابان و سۆران و ئەردەڵان و بادینان و شەمدینان بۆ بەرژەوەندی ئەو دوو دەوڵەتە پێویستی نەما، بۆیە ئەو ئەمارەتانە یەك لەدوای یەك قڵپ بوونەوە.

لە کوردستانی خوارو ئەمارەتی بابان لە بەینی ساڵەکانی (١٨٤٧-١٨٥٠)کۆتایی بە تەمەنی هێنراو جڵەوی یەکسەر کەوتە دەست، عوسمانییەکان خۆیان لەم کاتەدا دوو هێز، یاخود دوو بنەماڵە تاکو ڕادەیەکی کەم یا زۆر شوێنی بابانەکانیان گرتەوە، بەوەدا کە لەوەپێش لە سەردەمی بابانەکانیشدا خاوەنی ڕلو ڕێزو شوێنیان دیاربوو، یەکەم بنەماڵەی شێخان لە نەوەی حاجی شێخ مارفی نۆدێ و حاجی کاك ئەحمەدی شێخ کە لە شاری سلێمانیداو بەهۆی شوێنی ئاینی و ژیریانەوە کە سوڵتانی عوسمانی ڕێزی تەواوی لێ دەگرتن تاکو شێخ سەعیدی کوڕەزای حاجی کاك ئەحمەد باوکی شێخ مەحمود دەعوەت کرایە ئەستەمبوڵ و لەوێ نهێنی (شفرە)شی درایەو بەمجۆرە دەوامیان کرد تا هاتنی (اتحادو ترقی).

دووهەم: ئێلی جاف بەسەرۆکایەتی حەمە پاشاو دوای ئەویش مەحمود پاشاو وەسمان پاشای کوڕی. ئێلی جاف وەك وتمان بەئێلێکی هەرە گەورەی ناوچەکە

دەژمێردرێ، جگەلەوەی کە لە ئێرانیش هەن و زۆریشن، لەبەرئەوە دوای ڕوخاندنی بابانەکان چ ئێران و چ عوسمانیەکان هەریەکە هەوڵی ئەوەی دەدا جافەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێ بە خەڵاتکردن و نزیککەوتنەوە لە سەرۆکەکانی جاف و زەوی و زار پێدان. هەریەکە توانی تا ماوەیەك كاریان پێ بكا، سەرۆكەكانی جافیش لە بەگزادەو بەتایبەتی مەحمود پاشا ئەوەندە بەپشوو و بەزیری حوکمی ئەم عەشرەتە گەورەیەیادا، بەجۆرێك توانیان بەتەواوەتی دەستبگرن بەسەر کاروباری گشت تیرەیەکا، تەنها (فیرقەی کەرەم وەیسی نەبێت کە بەشێکە لە فیرقەی شاتری)، ئەوان سەرکێش و یەکێکیان کە عەزیزی شاوەیس بوو لە بەندیخانەدا نەخۆش دەکەوێ و دەمرێ، تیرەکەی وادەزانن حەمە پاشا دەرمان خواردی کردووە، لەسەر ئەوە فرسەت دەهێنن لە حەمە پاشاو لەنزیك كفری دەیكوژن (ئەم باسە دوورودرێژ لە تەئریخی جافدا نووسراوە).

دوای حەمە پاشا کوڕە گەورەکەی کە مەحمود پاشایە شوێنی باوکی دەگرێتەوەو زۆر بەزیریی و ڕەفتاری جوان مامەڵەی ئێلەکەی دەکات، ئێلی جاف ئەوسا دولەوتوویوون و وەك ئەمڕۆ چاریان نەکرابۆوە جێبەجێکردنی هەموو تێکچوونێکیان لای پاشا بوو جاری وادەبوو پاشا وەك قازییەك لەناوبژیکردنا گەلێك قسەی نالەبارو بێجێی لەڕوا دەکرا، بەڵام پاشا چونکە دەیزانی ئەم قسانە لە دڵی بەرق و کینەوە نیە، بەڵکو لە سادەیی خاوەنەکەیەوە هەموو قسەیەکی لێ دەخواردنەوە، بۆ نموونە: مەحمود پاشا تاقمی دان دروستدەکا کە ئەوسا باونەبوو، کابرایەکی جاف لێی دەپرسێ.." باشە پاشا ئەمە قەزوانی پێ دەخۆیت و گوێزی پێدەشکێنی؟" ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ:" نەو ئەمە تەنها شتی نەرمی پێ دەخورێ." کابرا هیچ سێ و دوو ناکاو دەڵێ:"دەسا پاشا ئەوە گووی تێبێ بەکاری چی دێت..." ئیتر زۆر لەم قسەو باسانە هەن کە زۆریەیان لە بەرگەکانی (ڕشتەی مرواری)دا، خوالێخۆشبوو عەلادین سەجادی بڵاویکردونەتەوە، هەروەها لەم ڕووەوە سەیری لاپەڕەکانی (تەئریخی

جاف– ٦١و٦٤)بە دواوە بکە زۆر خاڵی لەم بابەتانەی تێدایە تا دەگاتە لاپەڕە (٩٠) کە باسی گفتوگۆیەك دەکات لە بەینی (میجەر نوئێل)و مەحمود پاشادا لە دەورروبەری ساڵی (١٩٢٠)دا ئەو مێجەرنوئێلەی کە ناوی بە (دۆستی کوردو خێرخوازی کورد) دەرکرابوو کە داوا لە پاشا دەکات هاریکاری لەگەڵ ئینگلیزدا بکات بۆ خزمەتی ناوچەی کوردستان و میللەتی کورد، ئەویش عوزرخوایی بۆ دەهێنێتەوە کەوا بڕوای بە ئینگلیز نییە، هەروەها دکتۆر حەسەن جاف لە لاپەڕە (٩١)ی کتێبەکەدا ئاماژە بۆ (ململانێیەك لەسەر دەسەڵات و سەرۆکایەتی) دەکات (لەبەینی بنەماڵەی بەگزادەی جاف و بنەماڵەی شێخاندا بەتایبەتی لە سەردەمی شێخ سەعیدو شێخ مەحمودی کوڕیدا کە ویستوویانە دەست بەسەر هۆزی جافا بگرن بۆ پاڵپشتی دەسەڵاتی خۆیان) تاکو لەدواییدا لەلاپەڕە (٩٢)دا دەڵێت:" ئەم هەڵوێست و دووبەرەکییە خێڵەکییە شتێکی لە قۆناغ بەدەر نەبووەو لەگەڵ سروشتی ئەو سەردەمەدا گونجاوە، بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەم دووبەرەکییە نەگەیشتۆتە رادەی لەیەك راپەڕین و (بۆ پاڵپشتی ئەم ڕاستییە) (ڕاپەڕینی شەشی ئەیلول بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود) بە نموونە دەهێنێتەوە کە مەبەستی (شەڕی بەردەرگای سەرایە) لە سلێمانی لە ڕۆژی شەشی ئەیلولی ساڵی (١٩٣٠)دا کە یەکێك لە هاندەرەکانی ئەو ڕاپەڕینە (عیزەت بەگی وەسمان پاشای جاف) بووە، ئەمە لە کاتێکدا کە ڕاپەڕینی بەردەرگای سەرا لە شەشی ئەیلولدا بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود نەبووە، شێخی ئەمر ئەو دەمە لە سلێمانی نەبووە، ئنجا دەڵێم ڕەنگ هەیە دکتۆر حەسەن مەبەستی لەم ململانێیە گرتنی ئەحمەد بەگی وەسمان پاشا (ئەحمەد موختار جاف) بێت کە لە سەردەمی حوکمداریەتی شێخ مەحمودا گیراو لە ئەشکەوتی (جاسەنە) بەندکرا لەسەر تێچێنی پیاوخراپ لەکاتێکدا کە ئەحمەد موختار دوای شێخ کەوتبوو ئەویش لە بەندیخانەی (ئەشکەوتی جاسەنە)ی توندکرد تاوەکو ئەم چەند بەیتە دەنێرێتە خزمەت شێخ کە ئەویش دەستبەجێ بەری دەدات.

سەبا عەرزی خلووسی و بەندەگیم و هەم دوعاخوانی ببە بۆ خزمەتی شاهی موحیتی گشت سلێمانی تاکو دەڵێت:" کە جورمێکی نیيە تاکەی لە حەپسا دانیشێ قوربان"

لە تەنهایی لە فیکری چۆتەوە ئادابی ئینسانی
هەتا مردن وەکو بەندە لە خزمەت شاهی کوردستان
حەیاتی خۆی فیدا کا بۆ هەموو ئەمرێك و فەرمانی
ئەوە بۆ من فەخرە بەشەرتێ سەروەری کوردان
لەحەق ئەم بەندەیەی خۆیە بمێنێ لوتفی جارانی
لە لوتفی تۆ زیاتر هیچ پەناهێکی نیە موختار
بەکاری هیچ نەهاتن دۆستەکانی ، خزم و خوێشانی.

دوای مەحمود پاشا وەسمان پاشای برای کاری ئێلی جاف گرتەدەست. ئەویش وەك مەحمود پاشا کرا بە قایمقامی هەڵەبجە، بەخۆی و خانمی ژنی (عادلە خانی ساحێبقران کە بە خانمی وەسمان پاشا ناوی دەرکردبوو) کاروباری عەشرەتیان بەڕێوە دەبرد، لەدواییدا ئەحمەد موختار جاف بوو بە قایمقامی هەڵەبجەو دوای ئەویش حامید بەگی مەجید بەگ، واتا لەسەردەمی حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیزەکان و شێخ مەحمودو لەدواییدا لە سەردەمی حوکمی نیشتمانی عێراقدا جاف هەر دەستڕۆیشتوو بوون.

هەمیشە لە ئەنجومەنی نوێنەران واتا لە پەرلەمانی عێراقدا نوێنەریان هەبووە، حەمە بەگی فەتاح بەگ و حامید بەگی مەجید بەگ و حەسەن بەگی عەلی بەگو ئەحمەد بەگی حەمە صالح بەگ و داوود بەگی فەتاح بەگ هەموو نوێنەرانی جاف و ناوچەکانیان بوون لە پەرلەمانی عێراقدا تاکو ئەم دواییەدا، واتا لەدوای ساڵی (١٩٥٨) دکتۆر ئەکرەم جاف کوڕی حامید بەگ بووبە وەزیری زراعەی ئێستاو ئەمڕۆش گەلێك

پیاوی بەغیرەت و کارمەندیان هەیە کە هەموو خاوەنی دیوەخان و دەستڕۆیشتوون، هەروەها پیاوی ئەدیب و نووسەرو شاعیریان تیا هەڵکەوتووە، جگەلەوەی زۆر لە وەچەیان باش پێگەیشتوون، لە خوای گەورە داوا دەکەین وێنەیان زۆربێ و هەر کەسە لەلای خۆیەوە بتوانێ خزمەتی میللەتەکەی و نیشتمانەکەی بکات.

٥

## ناوەکان لە چییەوە هاتوون؟

کورتەیەك باسی جاف لە گەشتەکەی ڕێچدا لەبەشی یەکەمدا (ڕا)ی خۆم پیشاندا بەرامبەر بە ناوی جاف کە لە چییەوە هاتووە. وتم بەلای منەوە سەلماوترین شت ئەوەیە کە لە (جەعفەر)وە هاتبێ ئنجا بزانین ناوی جافەکانی تر لە چییەوە هاتوون؟ ئەمە بنەچەی ناوی هەندێکیانە:

ڕۆغزایی: دەچنەوە سەر سەرۆکەکەیان کە ڕۆغزاد بووە. لەم دواییەشدا (مەحمود کوڕی ڕۆستەم کوڕی حەمە جان کوڕی عەلی کوڕی ڕۆغزاد گەورەو دەمڕاستیان بوو).

تەرخانی: گوایە لە (تورخان– تورخانی) مەگۆلییەوە هاتووە، کە بەولاتای (ناڵاندن دێت لەناو سەرانە، بەڵام بەڕای من (ناوی تورخان واورخان و هۆلاکۆخان..) لەناو مەگۆلەکاندا هاتووە. دەبێ تورخان ناوێکی زۆردار لە خەرج و باج کۆکردنەوەدا هەبوبێت لە مێژووی ناوچەکەدلو ناوەکە سەپاوە بەسەر سەرۆکی تەرخانیەکاندا کە ئەویش دەبێ کابرایەکی زۆردار بووبێت.

گەلاڵی: لە بنەڕەتا (جەلال)یە، دەبێ ناوەکە لە سەرۆکێکەوە هاتبێ کە ناوی (جەلال) بووبێت.

هارونی: ئەمیش دەبێ (هارون) ناو لە سەرەتاوە سەرۆکی ئەو هۆزە بووبێت لەوەوە ناوەکە سەپابێت بەسەریانا.

یەزدان بەخشی: بەواتای (بەخششی خودا)و بەعەرەبی (عطیة الله)و بەتورکی (اللە ویردی)و بەفارسی (الله کرم) دێت.

مکایلی: لە (میکائیل)ەوە هاتووە. ئەمیش یەکێکبووە لە (پیرە) ئاینییەکان و لەبنەچەدا (پیر میکائیل) بووە پیرەکانی تر بریتین لە (پیرەمەگرون– الشیخ عمر المقرون)و (پیرمەسوور– پیر منصور)و (پیری شەوکێل) میکائیل ناوی سەرۆکەکەیان بێت و باقی لقەکانی ئەم هۆزە بریتین لە (ئاڵی بەگی) کە ئەم ناوە لە (عەلی بەگ)ەوە هاتووە. (ڕەش ویـۆری) ئەمیش بێگومان لە دوو وشەی (ڕەش ویـۆرە)وە هاتووە. (شوانکارە) ئەو کۆمەڵەن کە خاوەن ئاژەڵ و لە بەینی (شوانکارە)کەدا واتا ئەوان دەبن بەشوانی ئاژەڵەکەو بەخێویان دەکەن و بەرهەمەکەیان بەش دەکەن.

پشتماڵە: ئەمانە یەکسەر دەوارو ماڵیان بە پشتماڵی بەگزادە، یاخود پاشا، یاخود سەرۆکی جافەوە بووە بۆ پاراستن و ئاگاداری و ئەم پشتماڵەیە زیاتر لە سەردەمی حەمە پاشادا پەرەی سەند.

سەدانی: یاخود سەهانی یاخود سەدلنی من وادەزانم ئەم ناوە لە ژمارە (سەد–صەد)وە هاتووە، چونکە بۆ یەکەم جار کە (تشکیلات)ی (حرس)ی تایبەتی کرا ژمارەیان سەد تفەنگچی، یاخود ئێشکگربوون، دوای ئەوە ژمارەیان زیادیکرد. وەجۆرە (ترێ)یەکیش لای خۆمان هەیە (سەعدەنی– سەدانی) پێدەڵێن، ئەو ترێیە گوایە (سەیی یاخود سەعیدێك لە بنەڕەتا چاندویەتی و گوایە ئەو نەمامەکەی لەم لاولاوە هێناوە لە ڕاستیشدا ترێی سەدانی خۆشترین ترێی وڵاتی خۆمانە.)

کافرۆشی: لە فرۆشتنی (کا)وە هاتووە، کە دەبێ ئەم تاقمە لەکاتی خۆیدا پێش ئەوانی تر وازیان لە گەرمیان و کوێستان هێنابێت و نیشتەجێ بووین و دەستیان کردبێ بە چاندنی گەنم و جۆ کە(کا)ش لەدوای کوتانی ئەوانە پەیدا دەبێت.

یاروەیسی: لە وەیس ناوەوە هاتووە.

شێخ سمایلی: لە شێخ سمایلەوە هاتووە.

عیسایی: لە عیسا پەیدابووە.

ئیسماعیل عوزەیری: لە ئیسماعیلەوە هاتووە.

صوفی وەند: دەڵێن ئەمانە لەکاتی خۆیدا لە هەمەوەند جیابوونەتەوەو داویانەتە پاڵ جاف، بەوەدا کە هەمەوەند (حەمە وەند) بریتین لە (ڕەمەوەند– ڕەمەزان)و (ڕەشەوەند– ڕەشید)و (سەفرە وەندە– صفر وەند) کە گوایە کاتی خۆی (حەمەو ڕەشیدو ڕەمەزان و سەفەر) چوار برابوون و هەریەکە سەرۆکایەتی بەشێکیان لە هەمەوەند کردووە.

ڕیچ کە باڵیۆزی ئینگلیز بوو لە بەغدا لە سەردەمی عوسمانیەکاندا، دوای تێکچوونی لەگەڵ والی بەناوبانگ (داود پاشا) هەستا لەساڵی (١٨٢٠)دا بۆئەوەی لە بەغدا لەوالی دوورکەوێتەوە گەشتێکی بەرەو سلێمانی کردو بەهەمووی نزیکەی چوار مانگی پێچوو. لەو گەشتەیا ئەوەی دەبینی بە سەری قەڵەم بەگەورەیی دەینووسییەوە تاکو لەدواییدا دوورودرێژتر بینووسێتەوە، بەداخەوە نەخۆشی ڕشانەوەی گرت ڕێی ئەوەی نەدا، بەلام ژنەکەی نەیهێشت ئەو یاداشتە بفەوتێ لە چاپی داو (بهائەدین نوری) وەریگێڕایە سەر عەرەبی بەناوی (رحلە ریچ في العراق. عام– ١٨٢٠ ) ئەوساکە کەیخسرەو بەگ باوکی حەمە پاشا، سەرۆکی عەشرەتی جاف بوو، بۆ یەکەم جار ڕیچ لە دیوەخانی مەحمود پاشای بابان دەیبینێ لەوەوە دۆستایەتی پەیدا دەکەن لە یاداشتی (١٨ ئایاری ١٨٢٠)دا باسی جاف دەکات کەوا هەموویان لەژێر دەوارا دەژین لە هاویندا لەنزیك شاخە بەرزەکانی حاجی ئەحمەدا دەژین نزیك بە شاری (سنە)و لەپایزدا بەو شارەزوورەدا بڵاودەبنەوەو لە زستانیشدا لە ناوچەی شیروانە لە ڕۆخی چەمی سیروان هەڵیان دەدا.دوێنێ کەیخوسرەو میوانم بوو کە سەرۆکی ئیلی جافە پیاوێکی قەڵەم ڕێك بوو، هەروەها پیاوەکانی عەشرەتی جاف هەموو ڕێکوپێك و نازان، بەلام تاکو بەلای کوردەکان خۆشیانەوە دولکەوتووترین کەس بوون، دەم و دولیشیان لەگەڵ باقی کوردەکانی ناوچەی باباندا فەرقیان زۆربوو،

ئەمانە بریتیبوون لە نزیکەی دوو هەزار سوارچاك كە سەربە كەیخەسرەو بەگ بوون و هەمیشە ئامادەبوون بەدەنگ پاشای سلێمانییەوە بچنە مەیدانی شەڕەوە، جگەلەوەی هەموو کاتێك بەئاسانی چوارهەزار پیادەی تفەنگ بە شانیان لەناودا پێك دەهێناو بەڕاستی ئازاترین شەڕکەری کوردبوون.

لە یاداشتی ڕۆژی (٢١ ی ئایاری ١٨٢٠) باسی (وەڵەد) بەگی جاف دەکات کەوا لە سەرخوانی مەحمود پاشای جاف دیویەتی و دەڵێ:" پیاوێکی کەڵەگەت و بۆشناخ و قۆز دیاربوو." لە یاداشتەکانی ڕۆژانی (١٩ ی ئاب) باسی (ئەحمەد کلوان)و (بێستان)و ئەو ناوچانە دەکات کە سەر بە جاف بوون، لە دێی بێستان لە (سابات)دا میوانی دیوەخانی کەیخەسرەو بەگ بوون، وەك لە بەگی بیستوە دانیشتوانی دێهات لەچاو (گەڕیاو- وەك کەریم بەگ ناوی ناون و مەبەست- رحالەیە)یەك بۆ چوار یاخود پێنجن.

چونکە وەك لەمەوپێش وتمان ئەوساکە دانیشتن عەیب و شوورەیی بووەو دانیشتوی دێهاتیان بە تەمەڵ و تەوەزەل و بێکارە لە قەڵەم داوە.

ئەو ڕۆژە کەیخوسرەو بەگ ژمارەی جافی گەڕیاوی بە دەهەزار ماڵ داناوەو هەر ماڵەی حەوت کەس کە هەمووی دەکاتە حەفتا هەزار کەس، لە ڕۆژی (١٣ ی ئابی ١٨٢٠) باسی کۆچی عەشرەتی جاف دەکات لە گەڕانەوەیاندا بەرەو شارەزوور کە دیمەنێکی چەند خۆش و جوانیان بووەو گشت دەوارو نوێن و شتومەکی تریان ڕێکوپێك پێچاوەتەوەو بەسەر پشتی وڵاخ و گاو مانگاوە گواستویانەتەوە، پیاوو ئافرەتیش بەپێ ڕۆیشتوون.

لە گەشتنامەکەی ڕۆژی (٢٠ ی ئاب)دا مستەر ریچ باسی هەوارگەی کەیخەسرەو بەگ دەکات بە دوو میل خوار گۆڵ زرێبارەوە، باسی وڵاخەکانیان و باسی جلوبەرگ و سوارچاکی کوڕەکانی و پیاوەکانی دەکات و دوای ئەوە باسی دەست و دڵ و بەرچاو فەرەحیان دەکات و دەڵێت:" هەرگیز ئەو میواندارییە گەرموگوڕەیانم لەبیرناچێتەوە".

## هەندێک لە ناسراوانی جاف

د. حەسەن جاف لە پێشەکی (تەئریخی جاف)دا ناوی چەند کەسێکی نووسیوە لەگەڵ مێژووی ژیانیاندا، لەپێش هەموانەوە کەریم بەگی فەتاح بەگی باوکی کەدانەری کتێبەکەیە.٢ـ حەمە بەگی فەتاح بەگ.٣ـ داود بەگی جاف.٤ـ ڕەزا بەگ، جگەلەوە دەوری کەیخەسرەو بەگ و کوڕەکانی و حەمە پاشاو کوڕەکانی و کوشتنی حەمە پاشاو ئنجا مەحمود پاشای کوڕی حەمە پاشای پیشانداوە.

بەلای منەوە دەبوایە دکتۆر حەسەن ئەگەر هەر بە پەنجە ڕاکێشانیش بووایە ئاماژەی بۆ ئەم پیاوانەی تر لە بەگزادەی جاف بکردایە کە هەموو ناسراون و هەریەکە بەلای کەمەوە چوار پێنج دێر لە ژیانیان و شوێنی کۆمەڵایەتیان و تواناو (نبوغ)یانی بنووسیایە. من بۆ نموونە ناوی ئەم زاتانە دەبەم:

لەبەگزادە:

١ـ وەسمان پاشای جاف کە دوای مەحمود پاشا ئەوبوو بە سەرۆکی عێلی جاف و بە قایمقامی هەڵەبجە کە مێجەرسۆن پێش ئاشکرابوونی و بەناوی (غولام حسین)ەوە ماوەیەک لە دیوەخانی وەسمان پاشادا مایەوەو لە یاداشتەکەیا باسی ئەوو خانمی خێزانی و تاهر بەگ و ئەحمەد بەگی کوڕانی وەسمان پاشای کردووە، بڕوانە (رحلە متنکر الی بلاد مابین النهرین و کوردستان. تالیف سۆن– میرزا غولام حسین شیرازی) ترجمە (فواد جمیل) الجزئین الاول و الثانی سنە(١٩٧٠و١٩٧١) مطبعة الجمهوریە تایمس).

٢ـ خانمی وەسمان پاشا، ئەم ئافرەتە هەرچەندە خۆی لە بنەماڵەی ساحێبقرانەکانی سنەیە، بەڵام بەناوی جافەوە ماوەیەکی باش حوکمی عێلی جافی گرتبووە دەست و ئینگلیزەکان پایەی (خان بەهادور) یان پێ بەخشی ناوی (عادلە

یاخود عدله خانە)و دایکی تاهیر بەگ و ئەحمەد موختار جافەو خۆشی کچی قادر بەگی ساحێبقرانە.

٣ـ تاهیر بەگ وەسمان پاشا، یەکێکە لە شاعیرە کلاسیکییە ناودارەکانی کورد دیوانی چاپ کراوی کە شیعرە فارسییەکان و کوردییەکانی گرتبێتەوە تاهر بەگ بوو کە هەستی بە میرزا غولام حسێن کرد کە ئینگلیزە، خۆشی دانی بەوەدا ناوە لەدواییدا بوویە مێجەر سۆنەکەی (حاکمی سلێمانی) لەساڵەکانی (١٩١٩–١٩٢٣) لەساڵی (١٩٣٦)دا دیوانەکەی کرایەوە بە نامیلکەیەك و لە چاپخانەی ژین لەچاپ درا.

٤ـ ئەحمەد موختار جاف، ئەمیش کوڕی وەسمان پاشایەو شاعیرێکی بەرزو نیشتمانپەروەری کوردە. دیوانەکەی یەکەم جار (عەلی کەمال باپیر) لەشێوەی نامیلکەیدا ساڵی (١٩٣٦) لەچاپی داوە. دووهەم جار دیوانێکی تێرو تەسەل لەلایەن د. عیزەدین و ئەفراسیابی کوڕیەوە ساڵی (١٩٨٦)لەچاپ دراوە.

٥ـ مینە جاف کوڕی کەریم بەگی فەتاح بەگ (١٩١١–١٩٦٥) دیوانی شیعری لەساڵی (١٩٩٠)دا لەلایەن مستەفا نەریمانەوە لەچاپ دراوە.

٦ـ حەسەن فەهمی جاف، نووسەرو نوێنەری هەڵەبجە بوو لە پەرلەمانی عێراقیدا کتێبی (پاڵەوانی زەندی) لەساڵی (١٩٥٦)لە چاپ دا دووەم کتێبی گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانیەکانە بە کوردستاندا.

٧ـ حامید بەگی کوڕی مەجید بەگی کوڕی وەسمان پاشای جاف، کە ماوەیەکی زۆر نوێنەری ناوچەی هەڵەبجە بوو لە پەرلەمانی عێراقدا و ماوەیەك لەوەپێشتر قایمقامی هەڵەبجە بوو. ئەو لەماوەی ژیانیا بە سەرۆکی عێلی جافی ناوچەی هەڵەبجە دادەنرا.

٨ـ ئەحمەد بەگی حەمە صاڵح بەگ، کە ئەویش ماوەیەك نوێنەری ناوچەی هەڵەبجە بوو لەپەرلەمانی عێراقیدا. ئەمە جگە لە دیوەخانی ئەحمەد بەگ کە نەك هەر لە هەڵەبجە، بەڵکو لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێدەکرد.

٩ـ ئەمە جگە لە گەنجە پێگەیشتووەکانیان کە هەریەکە خاوەنی ماڵوحاڵی خۆیەتی و دەستڕۆیشتوون، جگەلەوانەش گەنجی پێگەیشتوویان لە دەرەوەی وڵات زۆرەو خوا هەموو لایەك سەرخات.

ناسراوانی جاف لە غەیری بەگزادە:

١ـ عەیلی بەگی: کە نزیکەی چوار سەد ساڵ لەمەوپێش ژیاوەو (پاشەڕۆژبینی) لە شیعرە بەناوبانگەکەیا هەیە (هەروا بوەو – هەروا ئەوێ).

٢ـ مەولانا خالیدی نەقشبەندی بەناوبانگ کوڕی ئەحمەد کوڕی حسینی میکایلی (١٧٧٧–١٨٢٦).

٣ـ حەماناغای دەربەند فەقەرە (١٦٦٥–١٧٣٢) بەوەدا دەڵێم ئەم پیاوە جافە کە دانیشتوانی دێی دەربەند فەقەرەی سەربە ناحیەی تانجەرۆ (عەربەت) کە هەمووی جافن.

٤ـ وەلی دێوانەی کەماڵەیی (١٨٢٦–١٨٨١) دێوانەو شێتی (شەم) (یاران وەسیەتم ئەمەبێ لاتان– هەرچەند کەوتوومە دوورە وڵاتان).

٥ـ ئەحمەد پریسی (١٨١٣–١٨٨٠) پریس دێیەکە نزیك هەڵەبجە، ئەمەش شاعیر بووە.

٦ـ عەبدوڵلای حەسەن– میکایلی (١٨٣٧–١٨٩٦) شاعیر بووە.

٧ـ مستەفا بەگی باوەجانی (مچە گەوج)، هاوڕێی شێخ ڕەزای تاڵەبانی و شاعیر بووە.

٨ـ مەلا وەڵەدخانی شاعیری جافان.

٩ـ شاکەی گەلاڵی، شاعیربووە.

١٠ـ مەلا ئەحمەد قسرت (١٨٨٩–١٩٤٥) قسرت دێیەکە لە ناحیەی تانجەرۆ– عەربەت. شاعیربووە.

١١ـ خەلیفە یونس کوڕەزای لالە سەرحەدی ڕۆغزایی، خۆم دیومە پیاوێکی لێهاتوو سوارچاك و نیشانشکێن و خاوەن دیوەخان بوو. لە(دسکەرە)ی ناحیەی تانجەرۆ دادەنیشت.

١٢ـ حاجی برایمی شاتری، شاعیر بووەو دیوانەکەی لەلایەن دەزگای ڕۆشنبیرییەوە ساڵی (١٩٨٩) لەچاپ دراوە.

١٣ـ ئنجا دوای هەموان شای شاعیرانی کورد مەلا خدری (نالی) کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی ئالی بەگی میکایلییە (١٧٩٧-١٨٥٥). نالی زۆر لەوە زیاترە کە من لێرەدا بە خوێندەوارانی بەڕێزی بناسێنم، چونکە خۆی ئەستێرەیەکی درەوشاوەیە لە ئاسمانی ئەدەب و شیعری کوردیدا.

ئەمە جگە لەو کەسانەی بە بەگزادەیاندا هەڵداوە (هەر بۆ نموونە) وەك:

١- لە مامۆستا محەمەد عەلی قەرەدلخیم بیستووە هەندێك دەستنووسی بەناوی (ذات الوفاء في سيرة المصطفى) کە (محەمەد یوسف السلیمانی شافعی) ناوبانگی بە(المحجر) دەرکردووەو کتێبەکەی لە سەردەمی سوڵتان عەبدول حەمیدا لەسەر داوای شێخ (حسام الدینی تەوێڵە) دلناوەو پێشکەشی وەسمان پاشای جافی کردوە، ئەو دەستخەتە لە(دار صدام للمخطوطات) ژمارەی (١٢) هەروەها لەیادی مەردانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لەپەڕە (٣٤٩-٣٥٠)باسی مەحمود پاشای تیدا هاتووە.

٢- ئەمە جگە لە شیعری شێخ ڕەزاو

٣ـ (دوا وانەکەی شوێن ماڵە گەورە)ی پیرەمێردو

٤ـ گەلاوێژی ژمارە (٧) ساڵی (١٩٤٩)کە مستەفا نەریمان هەواڵی وەفاتی کەریم بەگی جافی تێدا بڵاوکردۆتەوە هەر ئەو نووسینە لە کاروانی ژمارە (٧٨ ی ساڵی١٩٨٩ )دا جارێکی تر بڵاوکراوەتەوە.

٥- عەلی باپیر ئاغاو شێخ سەلام و مەلا ئەحمەدی دەککە ماتەمی کەریم بەگیان لە گەلاوێژی ژمارە (٨ ی ساڵی ١٩٤٩)دا بلاوکردۆتەوە.

٦- ئومێد ئاشنا لە کاروانی ژمارە (٨٠-٨١) ساڵی (١٩٨٩)دا دوو نووسینی وردو پوختی لەسەر مەحمود پاشا نووسیوەو بەراستی پشکنینێکی تەواوی لە نووسینەکەیا کردووە! بۆیە دەڵێم خۆزگە دکتۆر حەسەن جاف پێش لەچاپدانی (تەئریخی جاف) ئەو دەستخەتەی کەریم بەگی باوکی بەهاریکاری عەلی بەگی حسین بەگی جاف کە شارەزاییەکی باشی لە مێژووی جافدا هەیەو هەروەها بەیارمەتی و لێکۆڵینەوەی یەکێکی شارەزا کتێبەکە بایەخی گەلێك زیاتر دەبوو، بەڵام تکاشم ئەوەیە ئەم قسەیەم بەو جۆرە لێك نەدرێتەوە کە ئێستا کتێبەکە بێ بایەخ یاخود کەم بایەخە.

## چەند تێبینییەکی تر

## ٦

یەکەم: لەلاپەڕە (١٥٦)ی تەئریخی جافدا هاتووە کەوا کەیخسرەو بەگ وتویەتی: "ئێمە ژن بەغەیری جینسی خۆمان نادەین و ئەم قاعیدەیە وەصیەتی ئەجدادمانە." ئەمما وەلەد بەگ کە یەکێکە لە بەگزادانی جاف کچی هەیە... کچی وەلەد بەگ پەریزاد خانم ئەدەن بە سلێمان پاشای بابان لەو کچە ئەحمەد پاشاو عەبدوڵڵا پاشاو محەمەد پاشای باوکی حەمدی بەگی لێ دەبێ.

جا من لێرەدا وەڵامی نووسینەکەی کاك ئومێد ئاشنا دەدەمەوە کە هەر لەسەرباسی محمود پاشای جاف لە لاپەڕە (١١٧ ی کاروانی ژمارە ٨١ ی ١٩٨٩) دەڵێ:" حەسەن بەگ خوشکەزای کەیخسرەو بەگ نەبووە، بەڵکو خوشکەزای وەلەد بەگ بووەو باوکی مەحمود پاشای بابانی سەردەمی ریچ کێ بووە؟ خوشکەکەی وەلەد بەگ ژنی ئەو بووە ئیتر سلێمان پاشا بووە، یان یەکێکی تر لەلام روون نییە".

لە وەڵامی خوالێخۆشبوو ئومێد ئاشنادا دەڵێم: باوکی مەحمود پاشای سەردەمی ڕێبەئەوڕەحمان پاشای بابان بووە کە ئێستا ئارامگای لە (صحن)ی مزگەوتی گەورەی سلێمانیدایە، ئەو مزگەوتە گەورەیەی کە برایم پاشای بابان لەگەڵ شاری سلێمانیدا دروستیکرد کەوابوو ئەو فەرمودەیەی کەریم بەگ کە بەزمانی کەیخوسرەو بەگەوە دەیگێڕێتەوە چاوپیاخشاندنەوەی تری ئەویّ جگەلەوەی ئەو (تەحقیقات)ی مستەر ڕیچ لە نووسینەکانیا کردوویەتی تا ئێستا هیچیان بەپێچەوانەوە دەرنەچوون، کە وابوو حەسەن بەگ کوڕی ئەوڕەحمان پاشاش هەر دایکی لە بەگزادەکانی جافەو ئەوەی لای من ڕوونە ئەوڕەحمان پاشا چوار ژنی هێناوە.

یەکێك لەوانە (ڕەندانە)ی دایکی (شەریف هەمەوەند) ئەوی تریان ئامۆزای خۆی بووەو خوشکی خالد پاشا بووە، سێهەمیان ئەو خوشکەی کەیخەسرەو بەگ بووە، چوارەمم تەواو لێ ڕوون نییە، ئەمەش هەرگیز ڕێ لەوەناگرێت کە ژنی سلێمان پاشاش (کە باپیرە گەورەی نووسەری ئەم کتێبەیە) لە بەگزادەی جاف بێت، چونکە ژن و ژنخوازی لە بەینا زۆربووەو هەردەوامی کردووە تاکو ئێستا.

دووهەم: کەریم بەگ لە لاپەڕە (١٥٧)ی تەئریخی جافدا دەفەرموێت:" شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود کوڕی کاك ئەحمەدە." ئەمە وانییەو شێخ سەعید کوڕی شێخ محەمەدە کە ئەم کوڕی حاجی کاك ئەحمەدی شێخەو کاك ئەحمەد هەر تەنها ئەو کوڕەی هەبووە کە بە شێخە بچکۆلە بەناوبانگە، بەڵام شێخ محەمەد حەوت کوڕی هەبووە کە ئەمانەن (١ـ شێخ سەعید باوکی شێخ مەحمود ٢ـ شێخ مارفی نەقیب ٣ـ شێخ مستەفای نەقیب ٤ـ حاجی سەی حەسەن ٥ـ سەی عومەر ٦ـ سەی ئەحمەد ٧ـ سەی عیسا).

سێهەم: کەریم بەگ لە لاپەڕەی (١٧٠)ی تەئریخەکەیدا دەفەرموێت:" (ئینقیراضی پاشاکانی بابان لەساڵی هەزارو دوو سەدو حەفتاو چواری هیجری بووە..." ساڵی (١٢٧٤ ك) دەکاتە (١٨٥٧–١٨٥٨)ی زاینی، بەڵام ئەوەی کە مێژوو ساخی کردۆتەوە

(سقوتی ئەمارەتی بابان)و ڕوخاندنی ئەو میرنشینە لەلایەن عوسمانیەکانەوە لەبەینی ساڵەکانی (١٢٦٤-١٢٦٧ ك) بەرامبەر بە (١٨٤٧-١٨٥٠ ز)بووە، چونکە هەر کەریم بەگ خۆی لەلاپەڕەی (١٥٩)ی نووسینەکەیا دەڵێت:" (ئینقراضی حکومەتی بابان لە تەئریخی هەزارو دوو سەدو شەست و شەشی هیجریدا بووە) کە بە ساڵی زاینی دەکاتە (١٨٤٩-١٨٥٠) کە ئەمەیان ڕاست و تەواوە.

چوارەم: دەبووایە د. حەسەن جاف ئەوەی ڕوونبکردایەوە کە بۆچی حەمە پاشا نەیهێشتووە (پشتماڵە) لە هاوین و بەهاردا سواری ئەسپ ببن، واتا سواریەکە تەنها لە پایزو زستاندا ڕێی دراوە؟ ئایا ئەمە لەبەر ئەوە بووە ولاخەکان عەزێتیان نەگات و تووریان بەهێز بێت بۆ (جولنو) خستنەوە یا لەبەر پشتماڵەکان خۆیان بووە؟

پێنجەم: دەبووایە د. حەسەن درەختێك، یاخود وەك دەڵێن (شجرە)یەکی بۆ بەگزادە (ناڵێم بۆ هەموو عەشرەت) بکردایە، لەگەڵ خەریتەیەکدا بۆ ئارامگای جاف و خەریتەش بۆ ئەو ڕێگایانەی گەرمیان و کوێستانیان بە سەرەوە دەکرد، چونکە خوێندەوار هەرچەندە نووسینەکانی کەریم بەگ بخوێنێتەوە لەلایەن هاتوچۆی عەشیرەتەوە شارەزای شوێنەکان نییەو نایانناسێتەوە بەتایبەتی خوێندەوارو گەنجی ئەمڕۆ.

شەشەم: مەحمود پاشا جگەلەوەی کەشکۆڵی هەبووە خۆشی شاعیر بووەو مامۆستا ئومێد ئاشنا هەندێك لە شیعرەکانی لە ژمارەی (٨١ ی ساڵی ١٩٨٩ ی کاروان)دا بلاوکردۆتەوە، بەلام ئایا ئەو کەشکۆڵەی مەحمود پاشا کە لای حەسەن فەهمی بەگی جاف بوو چی لێهات؟ ئەی کەشکۆڵی عەولقادر بەگی سلێمان بەگ و کەشکۆڵی ڕەزا بەگی فەتاح بەگ ئەمانە چیان لێهات؟ پێویستە عەلی بەگی حسێن بەگی حەسەن بەگ لەگەڵ یەکێکی وەك خوالێخۆشبوو ئومێد ئاشنا یا هەر کەسێکی شارەزادا لە مانە بکۆڵنەوە

حەوتەم: شوێنی جاف و هەروەها ئافرەتانی هۆزەکانی جاف زیاتر لە ئافرەتانی تری کورد سەربەستیان هەیەو نازدارتر بوون، لەبەرئەوە شوێنێکی شیاویان بۆ خۆیان دابین کردووە هەمیشە قسەیان ڕۆیشتوەو ڕایان لە کاروباری ماڵ و منداڵ و خێزاندا بەتایبەتی و لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بگرە تارادەیەك لە کاروباری سیاسی و عەشرەتگەریدا بووە، ئەمە جگەلەوەی وەك پیاو لە باخ و بێستان و کێڵگەدا ئیشیان کردووەو هەرگیز عەباوچارشێویان نەپۆشیوەو زۆر زۆر لەچکێکیان کردووەو چارۆکەیەکیان کردۆتە کۆڵیان بەوە ئیشیان بەڕێوە بردووە.

لە عەشرەتا ژنەکەی (خەلیفە یونس)م لە بیرە کە کچی (کاکە حەمەی موان) بوو. ئەو ژنە شاژنێك بوو بۆ خۆی. لەبیرمە مدیر ناحیەی تانجەرۆ( عەریەت)بووم جارێك نزیکەی بیست سوار دەبووین لامان دایە (دسکەرە)ی خەلیفە یونس ئەو ئافرەتە نەیهێشت هەست بەوە بکەین کە خەلیفە یونس لەماڵ نییە، لەژێرچادری چەند ئەستونیا خۆمانی داناو وڵاخەکانیشمان لەولاوە هەمووی سێ سەعاتی نەبرد نان هات، بەڵام چ نانێك هەردوو زەلام و سینییەك. ئەم ئافرەتە بەڕێزە دایکی سەرحەدو ئەکبەر کوڕانی خەلیفە یونس بوو.

لەولاوە خانمی وەسمان پاشای جاف وەك لەمەوپێش باسمان کرد جڵەوو حوکمی میری و عەشرەتگەری گرتبووە دەست و ئازایانە بەڕێوەی دەبرد. کەوابوو هەرشتێك لەسەر جاف نووسرا پێویستە ئەم ڕووەش ڕوون بکرێتەوە.

هەشتەم: لام وایە خزمایەتی بەگزادەی جاف لەگەڵ بنەماڵەکانی تردا وەك (شێخان)و (ئاغا)کان و (سەیدەکانی کفری)و (بەگزادەی هەورامان)و (میرانی ئەردەڵان)و (بابان) ... پێویستیان زیاتر بە ڕوونکردنەوە هەیە.

## خەلیفە یونسی ڕۆغزایی و لالە سەرحەدی باپیری

پێشەکی: لەساڵی (١٩٣٧–١٩٤٤) (حەوت ساڵ) باوکم کاربەدەستی میری بوو لە ناحیەی تانجەرۆ(عەربەت). زۆربەی ئەو ساڵانە جێگری کارگێڕ بوو. لە بەرزنجەوە گوێزرایەوە بۆ عەربەت. ئەوساکە عەربەت قوتابخانەیەکی دوو پۆلی لێبوو، پۆلی یەك و دوو، من لە بەرزنجە لە پۆلی دووەوە دەرچووبووم بۆ سێ، بۆیە نێررامە سلێمانی بۆ خوێندن، بەڵام لە پشووی هاوین و گەلێك ڕۆژانی ترا هەر هەلم بۆ هەڵکەوتایە دەچوومەوە بۆ عەربەت، چوونەوەکەشم زۆر بەکەیف و ئەوپەڕی ئارەزووەوە بوو، چونکە یەکەم ماڵمان لەوێ بوو، دووهەم من لەوێ ئازادبووم، باوکی خواڵێخۆشبووم سەرفرازی کردبووم کە بە هەوەسی خۆم بەرەڵڵا بم و بۆکوێ بمەوێ بچم، لام وایە باوکم دەیویست حەقی ئەو دوورکەوتنەوەیەم بۆ بکاتەوە کە ساڵی هەشت تۆ مانگ لە سلێمانی گیرکردبووم بۆ خوێندن. بەکورتی دەتوانم بڵێم ئەو سەربەستییەی پێم بەخشرابوو کە تێکەڵاوی دانیشتوانی عەربەت و هەموو گەلی شارەزوور بم، بووبە هۆی ئەوەی زۆرشتیان لێوەرگرم و فێری هەڵسان و دانیشتن و خوڕەوشت و نەریتیان بەجۆرێك بم کە کارێکی هێجگار زۆری کردەسەر ئایندەی ئەدەبیم... جا ئەوەی سەیر بوو ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆیشت، (ئەو جەماڵەی کە هەموو عەربەتییەك و زۆربەی دێهاتییەکانی ناوچەی تانجەرۆ بە کوڕی خۆیان، یاخود بەیەکێك لە خۆیان دادەنا کە(حقوق)ی تەواوکرد خواوڕاستان بوویە کارگێڕی ناوچەی تانجەرۆ) کە لەوەپێش ئەوڕەحمان ئاغای خاڵی باوکم، دوای ئەو مامم ئنجا خەزوورم و باوکم هەموو هەر لە عەربەت کارگێڕ بوون، بۆیە من دەتوانم بڵێم تاکو منداڵی سەر بێشکەشیانم دەناسی، ئەمەم لە هەندێ شوێنی ترا نووسیوە، بەڵام دووپاتکردنەوە لێرەدا پێویستبوو وەك لەمەودوا دەردەکەوێ. دانیشتووانی ئەوسای ناوچە، یاخود ناحیەی تانجەرۆ کە نزیکەی(٥٦)دێ بوو، بەتایبەتی ڕۆغزایی و میکایلی هەر تەواو زۆر بوون، لەڕووی

ڕێبەندی ئاینیشەوە زۆری دانیشتووانی دێهاتەکانی ئەو بنارە سەربە شێخی (سۆڵە- شێخ قادر قەمچی ڕەش)بوون، کە لە دێی (سۆڵە) سەربە ناحیەی قەرەداخ دادەنیشت.

ئێڵی ڕۆغزایی لە دێهاتەکانی (قەراڵی)یەوە بیگرە تا (دسکەرە)و ئەو لاتریش دادەنیشتن. لە قەراڵی (حەمە سەعیدی حەسەنی حاجی قادرو کەسوکاری) دەمڕاستیان بوون، بەڵام ئەوەی خۆی بە سەرۆکی تەواوی ڕۆغزایی دادەنا، هەر (خەلیفە یونس)بوو. جا با بزانین خەلیفە یونس کێیە؟

ئەوەندەی لە تێکەڵاوبوونما بە کۆمەڵی شارەزوور بۆم دەرکەوتبێ، خەلیفە یونس کوڕی (موال) ئەمیش کوڕی لالە سەرحەدی بەناوبانگە. ئەو لالە سەرحەدەی کە خوالێخۆشبوو عەلائەدین سجادی لە ڕشتەی مرواریدا باسی خەوەکەی دەکات لە بەرگی یەکەم لاپەڕە (٢٥-٣١). ئەو خەوەی کە بەلای منەوە دەردی بەعەرەبی دەڵێن بە(رائعە)یەکی بێ وێنە دادەنرێ لە فۆلکلۆری کوردیا کە لەدواییدا ئەویشتان بۆ باس دەکەم.

خەلیفە یونس لە دێی دسکەرە دادەنیشت کە نزیک بە دێهاتی خاك وخۆڵەکەی حەزرەتی نالی و قەرەگۆل و نەمەڵ و بێستانسوور... بوو زەویەکانی دەسکەرە وەك هەموو زەوی باقی دێهاتەکانی تری ئەوناوە زۆری (مفوضة بالطابو)بوو، کە میکێشی (لزمە) بوو، تەسویەی دێهاتەکان هەمووکرابوون، (تسویەی حقوق الاراضي) وەك تاپۆ، یاخود (تسجیلی عقاری) ئەمڕۆ بوو، ئینگلیزەکان لەگەڵ خۆیانا هێنایان، کە ئەوەش سەرگوزشتەکەی دووروودرێژە، کاك مستەفای مەجید بەڕێوەبەری تەسجیلی عەقاری پێشوو لە کتێبە بەنرخەکانیا دووروودرێژ باسی کردووە، جا نازانم خەلیفە یونس بۆچی لەکاتی خۆیا ئەویش وەك باقی دێهاتەکانی تر لە تسویەدا ئەو زەویانەی لەژێر دەستیابوون لە دەسکەرە بەناوی خۆیەوە تۆماری نەکردن؟ ئەو زەویانەی دسکەرە

دوای مردنی خەلیفە یونس هەروا مانەوەو بوون بەهۆی سزاو نەهامەتی بۆ منداڵەکانی که لەدواییدا باسیان دەکەم.

لەبیرمە که خەلیفە یونس دەهات بۆ (عەربەت– مەرکەزی ناحیە) چەند سوارێك لەگەڵیا، یەکێکیان لەپێشەوە دەڕۆیشت تەپڵێك بەسەر قەڵپوزی زینی وڵاخەکەیەوە دامەزرابوو، که نزیك عەربەت دەکەوتنەوە دەستی دەکرد بە تەپڵلێدان. خەلیفە یونس خۆی لەناوەڕاستا سوارەکانی تر ئەم لاولای و لەدوایەوە تەپڵژەنیش لەپێشەوە، که ئەمە وەك من بزانم نەریتێکی ئیلایەتی کۆن بوو، بەڵام زیاتر بۆ سام و شکۆو خۆدەرخستنی بوو. خەلیفە دەگەیشتە نزیك سەرای میریی دەمانچەو تفەنگ و فیشەکلغی هەموو لە خۆی دەکردەوە، کڵاوێکی (قوچ و گوڵنکەدار)ی لەسەرا، جوتێ جزمەی چەرم بەو هاوینە لەگەڵ شەرواڵ و دەمەر قویان و پشتێن و خەنجەر بە بەرۆکیەوە، خەنجەرەکەی دانەدەنا، تەزبیحێکی دەنك گەورەی لە مشتوەکەیەوە دەناڵان، خۆی پیاوێکی نەختێك سورکەڵەو کەڵەگەت بوو، ریشێکی سوری دوو فاقی هەبوو، دەنگی تۆزێك گربوو، بەو پەڕی (اطاعة)ـەوە دەهاتە سەرای حکومەت لای بەڕێوەبەرو پۆلیسخانە، که ئەوانیش زیاتر ڕێزیان لێدەگرت.

لەبیرمە جارێك لە دێی سۆڵە دەگەڕاینەوە باوکم حەزی کرد سەرێك لە خەلیفە یونسی خۆشەویستی بدا لە دسکەرە، بەڵام خەلیفە لەماڵ نەبوو، خێزان و پیاوەکانی خەلیفە نەیان هێشت بڕۆین دایان بەزانین بۆ قاوەڵتی، ئەوە یەکەم جاربوو چادری وا گەورەو جوان و ڕێکوپێك ببینم که ناوەکەی بە قوماشی ڕەنگاوڕەنگ گیرابوو. بەشی چێشتلێنان و چاو خزمەتی تر جیاکرابۆوە، ئەستونی چادر چوبوون بە عاسمانا، چادرەکە پەنجەرەشی تیابوو. چەند مریشك سەر بڕاو بەرخیان هێنا ئەویش سەربڕن باوکم سوێندی لێ خواردن نەیهێشت سەریبڕن. لە پەردلخی ڕەنگاوڕەنگ و پیاڵەو ژێرپیاڵەی عەجەما چایان بۆ هێناین و لەکاسەدا دۆی مزرو خۆش... یەك لەدوای یەك دەیانکرد بە قورگمانا تا عەسرێکی درەنگ ئنجا وازیان لێ هێناین که بگەڕێینەوە. بەڵێ

ئەمە ڕەوشتی عەشایەرە، خاوەن ماڵ خۆی لە ماڵێ و لەماڵ نەبێ ئەو ئەركە بەرامبەر بەمیوان هەر دەكێشرێ، بەڵام لە ماڵی خەلیفە یونسا دابونەریتێكی ترو تام و لەزەتێكی زیاتری هەبوو.

لەبیرمە: بەراز بە جۆرێك بڵاوبووبۆوە لە بێشەو قەرەمی چەمی تانجەرۆدا، زیانی زۆری بە (مەرەزە– برنج) دەگەیاند، بۆیە میریی بڵاویكردەوە هەركەس بەرازێك بكوژێ و گوێچكەكەی ببڕێ و بیهێنێ بۆ مەركەزی ناحیە، یاخود بیبات بۆ شار بۆ دایەرەی (بەیتاڵ خانە) ڕوبعە دینارێك (٢٥٠) فلسی دەدرێتێ، كە ئەمە چارەیەكی باشبوو بۆ ئەو ڕۆژە، بۆیە خەڵك كەوتنە گیانی بەراز.

بەڵام لەلایەكی ترەوە لە بێستانسور، ئەوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا (خاڵی باوكم) كە زۆری دێی بێستانسورو قازلو مولكی ئەو بوون و مەرەزەی تیا دەكردن، دەنگی پیاوماقوڵان و عەشایەری بەرزبۆوە كە فڵانە ڕۆژ ڕاوەبەرازە، من ئەو كاتە قوتابی ناوەندی بووم (سێی متەوەستە)، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوەندە سواری وڵاخ دەبووم و دەكەوتمە خوارەوەو غارم دەكرد گوێم نەدەدایە، خۆم باش بەسەر وڵاخەوە دەگرت، منیش بۆ سەیری ڕاوە بەراز بانگكرام خۆشم تەختێك سەرەڕۆبووم ئەو ڕۆژە سوارێكی زۆر كۆبوونەوە، خەلیفە یونس بە سواری ئەسپێكی بۆرە كە خەلیفە ئاوزەنگی لێدەدا كلكی و ملی وەك یەك بەرزدەكردەوە كە ئەوە سیفەتی وڵاخی ڕەسەنە، بەكورتی: ڕاوەبەراز دەستی پێكرد لە چەمی بێستانسورەوە بیگرە تا چەمی تانجەرۆ. سەگەل بەردەدرانە ئەو بێشەڵان و قەرەمی قەراخ چەمەوە كە بەراز بەڕۆژخۆی تیا حەشار دەدلو، بەشەو بەردەبووە گیانی مەرەزە. سەگەل بەرازێكیان دەرپەڕاندو سوارەكان نیشتنە سەری، بەڵام خەلیفە یونس بە ئەسپە بۆرەوە كە ئاوزەنگی لێدا پێش هەموو سوارەكان كەوت و نیشتەسەر بەراز، هەر بەسەر سواریەوەو لەغارا بە تفەنگەكەی گولەیەكی نا بە بەرازەكەوە (بەتەنها یەك گوللەو لەوپەڕی تاودانی وڵاخا) هەر لەجێدا گلۆڵەی كردو سەگەل نیشتنە سەر بەراز، ئیتر

دوای ئەوەش ڕلو بەردەوام بوو تا دەمەو ئێوارە، بەراز قڕان بـوو ئـەو چـەم و بێشەڵانە لە بەراز کران بە جەهەنەم.

بگەڕێینـەوە سەرباسـی زەوی و زاری دەسـکەرە سـاڵی (١٩٥٠) کـە بـۆ یەکـەمجار بووم بە بەڕێوەبەری ناحیەی تانجەرۆ لـە (عەربـەت)، ئەوسا خەلیفـە یـونس وەفـاتی کردبوو. کوڕێکی گەورەی هەبوو لام وایە (حەمە عەلی) ناو بوو بێ جەوهـەر بـوو، بـەڵام منداڵەکانی تری کە لە کچەکەی کاکە حەمەی موان بوون، سەرحەدو ئەکبـەرو ئـەنوەر، ئەوسا منداڵ بوون. سەیرمکرد زەوی و زاری دسـکەرە هـەموو بـەناوی یـەک دوو ئاغـای قەرەداخییەوە لە تسویەدا تۆمارکراون و ئەو دوو کەسە هاتن بـۆلای (مـدیر ناحیـە) کـە زەویەکانیان تەسلیم بکات، منـیش لـەوەپێش کـە بـاوکم لـەوێبوو، یـاخود کـە خەلیفـە یونس مابوو، هەرگیز نەمبیستبوو کە ئەو دوو زەلامە کـەم و زۆر پەیوەنـدیان بـەو دێـی دسکەرەیەوە هەبێت، یاخود تۆ بڵێی خەلیفە یونس لەم دواییەدا پێی فرۆشتبن؟ نـاردم بەشوێن دلیکی سەرحەدا هات کە ئەمەم پێوت کەوا ئەم کابرایانە سەنەدی تەسـویەیان هێنـاوە کـە زەوی و زاری دسـکەرە مـوڵکی ئـەوانن، وەک لـە بانێکـەوە بەربێتـەوە... ئێستاو ئەوساش کەس نەیزانی ئەوانە ئەو کارەیان چۆن جێبەجێ کردبوو؟! چۆن ئـەو زەویانەیان بەناوی خۆیانەوە تۆمارکردبوو؟ من لە قەناعەت و بەدڵنیایی بـۆم دەرکـەوت کە ئەم ئیشە فروفێڵێکی تیـابوو، بـەڵام چ سـوود؟ بڕیـاری تەسویە دەرچـووەو تـەواو بووە واتا (کسبی قطعیـەتی) کردوە. ناچار چووم بۆ سلێمانی، کارەکـەم لـە قائمقـامی مەرکەزو دوای ئەو (متصرف– محافظ) کە (جەلال خالد) بوو گەیاند. ئەمە بوو بـەهۆی ئەوەی کە بە (محضوری اداری) ئەو دوو کەسە ڕێیان نەدرێ بچنە دسـکەرەوە نـەخۆیان و نە وەکیلیـان. بـەمجۆرە تـوانیم یارمـەتی ئـەو بنەماڵـە بـەڕێزە بـدەم کـەوا غـەدریان لێکرابوو، بـەڵام بیـستومە ئێـستا لـە سـایەی خـواوە سـەرحەد پێگەیـشتووەو شـوێنی باوکی گرتۆتەوەو وەجاخی ڕوونکردۆتەوە.

# لاڤاوو سلێمانی– بابان و بابائی

خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی بەگ لە کۆبونەوەکەیا کە بەستبوی لەگەڵ ڕۆژنامەچییەکانی بەغادا ڕۆژی (١٩٥٧/١٠/٢٨) بەهۆی کارەساتی لاڤاوەکەی سلێمانییەوە وەڵامی هەندێ پرسیاری ڕۆژنامەچییەکانی داوەتەوە، جۆرە وەڵامێك کە هێشتا نەبیستراون هەر وەکو دەڵێ:" وشەی بابان لە بابائیەوە هاتووە– بابائیش نەتەوەیەك بوون ئاینێکی تایبەتیان بووەو لە فارسەوە پێش سەدەها ساڵ هاتوون و لەبەشی ژووروی عێراق هێجگار لە سلێمانیا جێگیربوون، دوای ئەوە وردە وردە پەرەیان سەندوەو ناوەکەش لە بابائیەوە بووەبە بابان".

ئەمە وادەگەیەنێ کەوا ڕەگەزی بابانەکان (فرس) یاخود (عەجەم)ە، دەسا ئەمە هەڵەیەکی زۆرگەورەیە، چونکە باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵە (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەیە) دارەشمانەش دێیەکە لە هەرێمی پشدەرو ساتەرییەك یاخود کەمتریش دوورە لە قەڵادزەوە. ئەم دێیە ئێستاش ماوەتەوە زۆربەی دانیشتوەکانی هەر بابانن.

کەوابوو دارەشمانە دەکەوێتە عێراقەوەو ناکەوێتە وڵاتی (فرس و عەجەم)ەوە، بەڵام ئایە وشەی بابان لە کوێوە هاتووە؟ لەم ڕووەوە مێژووناسی بەناوبانگ خوالێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگ لە پەرتووکەکەیا (مێژووی سلێمانی و وڵاتی چاپی ساڵی (١٩٥١) کە (جەمیل بەندی) گۆڕیویە بۆ عەرەبی) دەڵێ:" ئەم سەرناوە دەبێ لەو بابانە کۆنانەوە مابێتەوە کە فەرمانڕەوایی (موکری)یان دەکرد، یاخود لەکاتی سلێمان بەبەوە پەیدا بووە کە دامەزرێنەری بناغەی ئەم بنەماڵەیەیە." بەڵام ئایا بۆچی بەم سلێمان بەگەیان وتووە سلێمان بەبە؟ ئەمین زەکی بەگ دەفەرمۆێ:" دەڵێن ئەم سلێمان بەبەیە کاتێك کە چووە بۆ لای سوڵتان (کە ئەو کاتە سلێمانی

قانونی بوو) سوڵتان پێی دەڵێ حەز دەکا بەبەرگی کوردییەوە بیبینێ (چونکە زۆر باسی ئەم بەرگەیان لاکردبووە)، ئەمیش دەچێ بەرگی کوردی لەبەردەکاو زڕێ دەپۆشێ، چونکە خۆشی زەلامێکی بوشناخ و چوارشانە دەبێ کە دەچێتە لای سوڵتان لەپڕ سوڵتان دادەچڵەکێ، وە سەری سووڕدەمێنێ و دەڵێ وای بەبەم! واتا (ئەی- بابە)"

گوایە ئەمە دەبێ بەهۆی ناودەرکردنی بە سلێمان بەبە، یاخود بابا سلێمان کە ئەم قسەیەش زۆر ناچێ بە عەقڵا. جگەلەوە وشەی (بابا) تا ئێستاش هەر بۆ ناوڕێك خستن و ناو تەواوکردن بەکاردەهێنرێ، جگەلەوەی بۆ خۆشەویستی و سەنگینی بەکار دەهێنرێ وەك بابا عەلی و بابا تایەر... هتد. لەم ڕووەوە هەروەك وشەی (کاکە) وایە کە هەر بۆ خۆشەویستی و خۆ نزیکخستنەوە بەکار دەهێنرێ.

(دائیرەی مەعارفی ئیسلامی)ەش دەڵێ:" ئەم بنەماڵەیە ڕەگەزیان بڵباسە لە دارەشمانەوە پەیابوون. باپیرە گەورەشیان بابا سلێمانە کە تا ساڵی ( ١٠٨٨ ك)بەرامبەر(١٦٧٧ ز)ژیاوە."

(مستەر لونگریك)یش لە پەرتووکەکەیا (چوار چەرخی دوایی لە مێژووی عێراق) دەڵێ:" بابا سلێمان کوڕی ماوەند کوڕی فەقێ ئەحمەد، کە ئەم میرنشینە لە نیوەی دوایی سەدەی حەڤدەهەما پێك هاتوە."

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە وڵاتی کوردستان لەوکاتەدا وڵاتی بابانیان پێ وتووە.

ئینجا دەڵێین کە هەموو کەس دەیزانی لە هەمووان باشتر تۆفیق وەهبی بەگ خۆیەتی کەوا بابانەکان لە هیچ کاتێکا سەربە هیچ ئاینێکی تایبەتی نەبوون، ئاینی ئیسلامی پیرۆز نەبێ ئەمەش پێویستی بە چەندوچوون، یاخود ساخکردنەوە نییە. جگەلەوە مامۆستای ناوبراو هەندێ شتی تری وتووە کە ئەوانەش پێویستیان بەلێدوان و ورندکردنەوە هەیە وەك (هۆی دروستکردنی شاری سلێمانی لەم شوێنەی

ئێستایا؟و سلێمانی کێ دروستیکردووەو بەناوی کێوە ناونراوە؟)، بەڵام لەبەرئـەوەی من بەینێك لەمەوبـەر لـە ڕۆژنامـەی (ژینـی ژمـارە ١٣٤٨ ی ڕۆژی ١٩٥٧/٦/١٣) هـەر لەسەر ئەم باسە دووروودرێژ دوام، نامەوێ ئێستا دوویـارەی کەمـەوە تـەنها ئەوەنـدە دەڵێم برایم پاشا لەکاتێکدا کە سلێمانی دروستکرد نەیدەزانی ڕۆژێك دەبـێ لافـاوێکی ئاوا بێ ئامان لەناکاو لە گۆیژەوە هورووژمی بۆ دەهێنێتە خوارێ بەجۆرێکی ئەوتۆ کە ئەم شارە نازدارە بەم دەردە بەرێ (ئەگەر برایم پاشـا زینـدوو بووایـەوە وەك جـاری جاران و سلێمانی لەکاتی ئەم کارەسـاتەدا بووبایـە لـەپێش هـەموو کەسـێکا لاشـەی خۆی دەکرد بە بەرگری ئاوەکە). برایم پاشا موهەندیس نەبووە تا لە شوێنی بـاش و خراپ بزانێ بۆ شار دروستکردن، لەبەرئەوە گلەیی لێ ناکرێ، ئەگەر ئەم گلەییە لـەو بکرێ دەبێ لە (ئەبو جەعفەر مەنصور)یش بکرێ کەوا شـاری بەغـدای لـە شـوێنێکی وادا دروستکردووە کە ئاوی دیجلەی بەسەرا سوار دەبێ لەکاتی ئاو زۆر بووندا.

بـە هـەرحاڵ، مێـژووی بابـان گـەلێك لـە فـەقی ئەحمـدی دارەشمانـەش کۆنترە. شــەرەفخانی بدلیــسی کەلــە ســەدەی پانزەهەمــدا، باســی بابــان لــە کتێبــی (شـەرەفنامە)دا ئـەکات ئـەڵێت: ئـەو بابانانـەی لـەم کاتـەدا هـەن (مەبەسـتی کـاتی نووسینەوەی (شەرەفنامە)یە، زنجیرەی سێهەمن لـە بنەماڵـەی بابـان. واتـا پـێش سەدەی پانزەش دوو زنجیرەی تر لە بنەماڵەی بابان هەبوە.

# مەلای مەزبورە کێیەو کەی ژیاوە؟

گاڵتەوگەپی:

ئەوەندەی لە زەمانی ڕابردوودا گاڵتەو گەپ و قسەی بەتوێکڵ (بەڵام بێ کینە) زۆر بووە بەپێچەوانەی ئەوەوە ئێستا نە ئەو قسە خۆشانە هەن نە ئەو گاڵتەو ڕابواردنانە ماون، بێگومان هۆی ئەمەش گۆڕان و پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕێگای نانپەیداکردنە. ئەگەر چاوێك بە کتێبەکەی مستەر ڕیچدا بخشێنین کە لەساڵی (١٨٢٠ ز)دا هاتووە بۆ سلێمانی، دەبینین ڕابواردنی ئەو دەمە چەند ئاسان و سەیر بووە. ڕیچ دەڵێ:" خۆشترین ڕابواردنی ئەوسای ئەهلی سلێمانی شەڕە کەوو شەڕە سەگ و شەڕە کەڵەشێر بووە."

بێینەوە سەرباسی مامۆستا: زۆرقسەی خۆش و حازربەدەست دەگێڕنەوەو دەیدەنە پاڵ مەلای مەزبورە. جا بابزانین ئەم مەلایە کێیەو کەی ژیاوە؟ لە مێژووی وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا چەند کەسێك بوون کە زۆر سەیرو عەنتیکە بوون لەوانە: (جحاو ئەبی نەواس و قەرەقوش و مەلای مەزبورەو مەلا نەسرەدین).

جاری مەلای خۆشەویست (جحا) نیە، چونکە جحا عەرەب بووەو لە سەدەی هەشتەمی میلادیدا ژیاوە، بێگومان (ئەبی نەواس)یش نیە، چونکە ئەویش هەر عەرەبەو لە خەلافەتی عەباسیەکانا ژیاوە. خۆ هەمووشمان دەیزانین کە قەرەقوشیش نیە، چونکە قەرەقوش کاربەدەستێك بووە مەبەست حاکم یا پاشایەك بووە لە وڵاتی میسر، بەڵام مەلا نە حاکم و نە پاشا ، کەوابوو هەر دەبێ مەلای مەزبورە مەلا نەسرەدین بێت.

مەلا نەسرەدین وا دیارە تورك بووە لە دێی (سیوری حسار) هاتۆتە جیهانەوەو لە شاری(ئاق شەهر) لەساڵی ( ٦٨٣ ك)دا کۆچی دوایی کردووە، هەندێکیش دەڵێن لە شاری قونیە وەفاتی کردووە، بەڵام بێگومان گۆڕی پیرۆزی هەر لە ئاق شەهرەو

لەسەر کێلی گۆڕەکەی ساڵی وەفاتی (٣٨٦ ك) نووسراوە، بەڵام زۆرکەس لە شارەزاکان و مستەشرقەکان دەڵێن ئەو نووسینە پێچەوانەیە وەك قسە پێچەوانەو بە تەوسەکانیەتی و ڕاستییەکی (٦٨٣ ك)یە. بەمجۆرە وەکو گەڕۆك (ڕەحالە)ی تورکی (ئەولیا چەلەبی) دەڵێ:" مامۆستا لە زەمانی حوکمی سوڵتان بایەزیدی عوسمانیدا ژیاوە."

زۆر لە ڕۆژهەڵاتشوناسی (مستەشرق)ەکانیش خۆیان بە باس و پەندوباوی مەلاوە خەریك کردووە، بەڵام ئەوەی کە هیچ گومانی تیانیە ئەوەیە مەلا لە سەرێکەوە تابڵێی پیاوێکی ژیرو زانابووە لەسەرێکی کەوە زۆر خۆی بە نەزان و نەفام دەرخستووە، وە پەندی جوان و سەیری بڵاوکردۆتەوە. زۆر خۆی لەگەڵ گەلەکەی خەریك کردووەو دەستی گرتوون و یارمەتی داون، جگەلەوانە زۆری ڕۆژگاری بە وتنەوەی (قدووری شەریف) کە نامەیەکی ئاینی مەزهەبی (ئەبو حەنیفە)یە بردۆتە سەر. لە شوێنی خۆیدا گەلێ بە هونەرو ڕۆشەنگی ناوبانگی ڕۆیشتووە تا گەیشتۆتە پایەی زانایانی تر وەکو (باڵوڵی دانا)و (ئەبو دلامە)و (تلحك)، بەڵکو گەلێ بەپایە بەرزتر دراوەتە دەفتەرەوە لەناو گەلەکەی خۆیدا زۆر خۆشەویست و جێگای باوەڕ بووە.

مامۆستا لەتای تەرازوودا: پەندوباو قسەی ولخۆش لە مەلا دەگێڕنەوە کە هەموو کەس ناتوانێ بیکا ئەمەش وادەبەخشێ کە زانایەکی بێ هاوتا بووە. کەچی لەلایەکی کەوە قسەی پڕوپووچی وای دەدەنە پاڵ کە هیچ نەفامێك نایکا. کەوابوو ئایا چۆن دەبێ دوو ڕەوشتی پێچەوانە (موتەناقین) لەیەك کەسا کۆببێتەوە؟ من دەڵێم و بڕوام وایە کە ئەو پڕوپووچانە دیسانەوە مەلا هەر بۆ پەندو سەیر دەری خستوون و هەندێکیشی دوورنیە لەو نەوەشابێتەوە، بەڵکو درابێتە پاڵی. بۆ بڕواش بەم قسەیە دووان لە پەندەکانی مەلا دەخەمە پێش چاو:-

ڕۆژێك لە شاری ئاق شەهر هەندێ لە قوتابیان مەلا ڕاپێچ دەکەن بۆ بەزم لەگەڵ خۆیان بیبەنە حەمام هەموشیان تەگبیر دەکەن هەریەکە هێلکەیەك لەگەڵ خۆیان دەبەن کە لەوێ زۆر لە مامۆستا بکەن یا ئەویش هێلکەیەك بکا، یا پارەی حەمامی هەموان بدا، کە دەچنە ژووری حەمامەوە لەکاتی خۆشتنا هەر کەس لە جێی خۆی مریشك ئاسایی دەسدەکەن بە گارەگارو هەریەکە هێلکەیەك بەدەسەوە لەمەلا دەچنە پێشەوەو دەڵێن: " مامۆستا تۆش دەبێ وەك ئێمە هێلکەیەك بکەیت، یاخود پارەی حەمامی هەموان بدەی." مەلاش گورج کەڵەشێر ئاسا شەق شەق باڵی دەدا بەیەکاو دەس دەکا بە خوێندن، قوتابیەکانی: " دەڵێن ئەوە چیتە مامۆستا؟! وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێ: " ئەی ئەم هەموو مریشکە کەڵەشێرێکیان ناوێ؟"

ئەمە لەکوێ؟ ئەوەلە کوێ کە دەڵێن جارێك مەلا دەسنوێژ دەگرێ، ئاو بەشی ناکا پێیەکی بەوشکی دەمێنێتەوە. ڕوودەکاتە قیبلەو قاز ئاسایی لەسەر یەك قاچ ڕادەوەستێ، ئەهلی جەماعەت لێی دەپرسن..: " مەلا ئەوە چیتە؟" ئەویش دەڵێ:" ئێوە نازانن پێی چەپم بێ دەستنوێژە."

کە وابوو دەبێ ئێمە هەر باوەڕ بە زیرەکی و زانایی مەلا بکەین لە پەندەکانیا نەك بە نەفامی و بێ هۆشی، بڕوام وایە هەر لەبەر ئەوەش پێویستی کردووە هەر کەسێك پەندێکی بگێڕێتەوە دەبێ لەسەری بڕوا تا حەوت کە خەڵك پەند لە پەندەکانی وەربگرن.

ژین. ژمارە ١٢٨٦ ڕۆژی ١٩٥٦/٣/١

# لە کۆڕێکی مامۆستا حسێن جەمیلدا
# هەڵوێستی شێخی ئەمر لەدژی ئینگلیز

مامۆستای بەڕێز حسێن جەمیل لە وتەیەکیا لە (یانەی علویە)دا وتووێژی سەرباسەکەی ئەمە بوو (هەڵسەنگاندنی ڕژێمی مەلیکی کردارەکانی- تقیم النظام الملکی و ممارسته) کە ئەمە وتەیەکی درێژترەو ئەو کاسێتەی ئەم شتەی لەسەر تۆمارکراوە من بەهۆی برادەری هاوڕێ و هاوکارم (عەبدولقادر زەهاوی)یەوە گەیشتە دەستم کە ئەویش زاوای حسین جەمیلە.

جا پێش ئەوەی بێمە سەرباسەکە.. دەمەوێ مامۆستا حسێن جەمیل بە خوێنەران بناسێنم ئەم پیاوە لە بنەماڵەی (ال جمیل)ی بەناوبانگە لە بەغدا کە گەلێك پیاوی زاناو هەڵکەوتویان تیا پەیدابووە.

حسێن جەمیل خۆشی دەرچووی قانوونە لە سوریاو هەر لە قوتابیەتییەوە بە ڕۆڵەیەکی نیشتمانپەروەر ناسراوەو لەدواییدا بوویە یەکێك لە ئەندامە ناسراوەکانی (پارتی وەتەنی دیموکراتی) لەگەڵ (کامل چادرچی و محەمەد حدید)ا دوای ئەوە چەند جارێك بە نوێنەری شاری بەغدا هەڵبژێردراوە بە ئەندام لە پەرلەمانی عێراقداو ئەمانە هەمووی جگەلەوەی کە پیاوێکی تێگەیشتوو ڕۆشنبیرو سیاسییەکی پێشڕەو بووە.

دوای ئەمە پێشەکییەکی کورت بۆ باسەکە دەنووسم تاکو خوێنەری بەڕێز وتەکەی باش بۆ ڕوونبێتەوە.

دوای کشانەوەی هێزی عوسمانیەکان لە کوردستانی خواروو (ناوچەی سلێمانی) لە کۆتایی شەڕی گێتی یەکەمداو لەکاتی هاتنی ئینگلیزدا بۆ عێراق لەساڵی (١٩١٧)دا ئەو دەمە لە سلێمانیدا شێخ مەحمودی حەفید، یاخود حەفید زادە بەوەدا

کە شێخ سەعیدی باوکی کوڕەزا، یاخود حەفیدی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ بوو لە هەمووکەس ناسراوتربوو، دەستڕۆیشتووتر بوو کە لەگەڵ ئنگلیزەکاندا پەیمانی بەست کە بەگوێرەی چەند مەرجێك بەبێ شەڕ بێنەناو سلێمانی، وە هەر لەسەر ئەو قسەو پەیمانە شێخ مەحمود لەلایەن ئینگلیزەکانەوە کرا بە حاکمی سلێمانی و ئەویش حکومەتی دامەزراند، ئەمەش لەساڵی (١٩١٩)وە دەستی پێکرد تا ساڵی (١٩٢٣)، بەڵام لەم دوابیەداو لە ئەنجامی تێکچوونی شێخ لەگەڵ ئینگلیزەکانا لە حوکمیان دوورخستەوەو بەڵکو لە ئەنجامی شەڕی دەربەندی بازیاندا دژی ئینگلیزەکان دوای ئەوەی لەشکری شێخ شکاو خۆشی بریندار کراو ئنجا بەدیلگیراو هێنرا بۆ بەغدا دادگای عورفی سوپایی بەریتانی فەرمانی خنکاندنی بەسەردا دراو لەدواییدا لەباتی خنکاندن و لەترسی هەڵسانی کورد دووریان خستەوە بۆ هندستان و دوای بەینێك هەمدیسان هێنایانەوەو کرایەوە بە حاکمی سلێمانی، بەڵام ئەوەی کە شێخ مەحمود دەیوست و بۆی تێدەکۆشا کە پێکهێنانی قەوارەیەك بوو بۆ کورد لەگەڵ ئەوەی کە لەبیری ئینگلیزو مێشکیا بوو بەتایبەتی دوای ڕێککەوتن لەگەڵ تورکیای کەمالی و دوای پێکهێنانی حکومەتی عێراق و بەستنی پەیمان لەگەڵیا لەیەکەوە گەلێك دووربوون، بۆیە دیسانەوە شێخ مەحمود لەدژی ئینگلیز هەستایەوەو لە مانگی تەموزی ساڵی (١٩٢٤)دا شێخ سلێمانی بەجێهێشت و عەسکەری ئینگلیز دوای بۆمبارانی سلێمانی شارەکەیان گرتەوە. شێخ ڕوویکردە جاسەنەو ئەشکەوتەکانی و دوای ئەوە بەرەو (پیران)ی ناوچەی (مەریوانی ئێران) نزیك بە پێنجوین لەوێ گیرسایەوە.

لەم کاتەدا بوو واتا لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٥)دا کە (مەندوبی سامی) بەغداو حکومەتی ئەوسای عێراق فەرمانێکیان دەرکرد کە هەرکەس شێخ مەحمودی یاخی و هەڤاڵەکانی (کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف و سابیر بەگی هەمەوەند) بەزیندوویی یا بەکوژراوی تەسلیم بکات شەست هەزار ڕوپیە (ڕوپیە: حەفتاو پێنج فلس)ی ئەو

دەمە بوو. بۆ کوشتنی شێخ مەحمود بیست هەزار ڕوپیە بۆ کوشتنی هەڤاڵەکانی بەخشیش دەدرێتێ تاکو کابرایەکی (فەلە)ی (لیوی) بە خۆگۆڕین چوو بۆ بۆ کوشتنی شێخ مەحمودو ئەوانی تر. شێخ پێیزانی و گرتی دوای لێکۆڵینەوە کابرا دانی بەهەموو شتێکدا نا. شێخ ناچار فەرمانی کوشتنیدا (سەیری شۆڕشەکانی کوردی مامۆستا عەلائین سجادی لاپەڕە ١٠٥ بکە).

ئنجا ئەم داوای کوشتنی شێخ و هەڤاڵەکانی لەو وتەیەی مامۆستا حسین جەمیلدا لە (یانەی علویە) وتووێژی لەسەر کراوەو ئایا ئەم بریارە چۆن دەرکراوەو کێ دەریکردووەو ئایا بریارەکە دەستوری و یاسایی بووە؟

مامۆستا حسین جەمیل دوای چاوگێرانی بە هەگبە تۆمارکراوەکانی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقدا بریاری ئەنجوومەنی وەزیرانی ڕۆژی (١٣ ی حوزیرانی ساڵی ١٩٢٥)ی بەرچاو کەوتووەو سەرنجی ڕاکێشاوە کە بەمجۆرە بووە.

(برگەی چوارەم بریاری موستەشار – مەبەستی موستەشاری ئینگلیز کە کورنوالیس بووە) ژمارە (١٢٢) ڕۆژی (٨ ی حوزەیرانی ١٩٢٥) خوێندرایەوە کە لە بابەت کوشتنی چەند کەسێکەوە بوو لەناوچەی سلێمانیدا کە ئەوانیش شێخ مەحمود کەریم بەگی فەتاح بەگ و سابیر بوون بۆ یەکەم شەست هەزار ڕوپیە بەخشیش و بۆ دووەم و سێیەم هەریەکە بیست هەزار ڕوپیە دەستخۆشانە تەرخانکراوە ئەم بریارە لە ئەنجوومەنی وەزیرانەوە دەرچووە کە وەك مامۆستا جەمیل دەڵێت. یاسین ئەلهاشمی سەرەك وەزیران بووە. کورنوالیس ڕاوێژکەری ئینگلیز لەو ئەنجومەنەدا ئامادە بووە لەدوایدا مەلیکیش بریارەکەی مۆرکردەوە دوای دەرچوونی بریارەکەو لاچوونی وەزارەتی یاسین ئەلهاشمی و هاتنی موحسین ئەلسەعدون بەسەرەك وەزیران ئەویش بریارەکەی ناردووە بۆ ڕاوێژکەری ئینگلیز لە سلێمانی (مفتیش ئیداری) کە ئیشی پێبکرێ و بەجێ بهێنرێ.

مامۆستا جەمیل دەڵێت:" ئەم بڕیارە لە کاتی دوو سەرەك وەزیراندا بوو کە هەردووکیان دوو پێشەوای نیشتمانی بوون لە عێراقدا؟" دوای ئەوە مامۆستای بەڕێز دەڵێت:" ئایا ئەم بڕیارەی ئەنجوومەنی وەزیران بەگوێرەی دەستورو یاسا بووە، یاخود بەپێچەوانەوە پێشێلکردنی دەستورو یاسا بووە؟" لە وەڵامدا دەڵێت:" شێخ مەحمود موحاکەمەی پاشەملە دەکرا تاکو دادگا فەرمانی خنکاندنی بەسەرا بدا، خۆ ئەگەر واشبووایە دەبوو کاربەدەستانی میری (سوڵتەی حوکمی) ئەو فەرمانە جێبەجێ بکەن نەك ئەم و ئەو." ئینجا دەڵێت:" ئەم بڕیارە لە دەسەڵاتێکی دەستورییەوە دەرچوو (سوڵتەی دەستوریە) نەك لە دەسەڵاتێکی شۆڕشگێڕانەی وەك حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسمەوە دەرچوویێت."جا ئایا لەسەردەمی مەلیکیدا کاروباری وڵات بەگوێرەی دەستوری یاسا دەبران بەڕێوەو ئایا مافی دانیشتوانی وڵات و ژیان و ماڵ و ئازادییان پارێزراو بوون؟ مامۆستا جەمیل بەو شێوەیەی سەرەوە هەڵی سەنگاندووە کە ئەوەی باسمان کرد نمونەیەك، یاخود خاڵێك بوو لە هەندێك نمونەو خاڵی تر کە لەسەر ڕژێمی مەلیکی و کردەوەو مامەڵەی کاربەدەستانی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە هێناونیەتیەوە.

لە دانیشتووان مامۆستا (فەیسەڵ حەبیب ئەلخیزران) پرسیارێکی لە مامۆستا جەمیل کردووە کە ئایا شێخ مەحمود بە هەڵسەنگاندنی گشتی شۆڕشگێڕ واتا (ثائر) بووە، مامۆستا جەمیل لە وەڵامدا دەڵێت بەڵێ بە شۆڕشگێڕ دادەنرێت.

دوای ئەو دکتۆر (مالك دوهان ئەلحەسەن) تێکەڵاوی باسەکە دەبێت بەوەدا ئەو دکتۆرای لە قانوندا هەیە دەڵێت:" بڕیاری ئەنجومەنی وەزیرانی بەکوشتنی خەڵك هەرگیز لەگەڵ شەرع و یاسادا ناگونجێ، بەڵکو ئەم بڕیارە ئەبێ لە دادگاوە دەربچێت."

# کوردانی بەناوبانگ

## برایم پاشای بابان

## بنیاتنەری شاری سلێمانی

(برایم پاشا ئەگەر لە ئەسکەندەر کە شاری ئەسکەندەریەی دروستکرد لە جەعفەری مەنسور کە بنیاتی شاری بەغدای نا زیاتر نەبێ کەمترنی – ئەحمەدین مەلا).

(برایم پاشا) کوڕی (ئەحمەد پاشای بابان)ە، دوای مەحمود پاشای مامی واتا لەساڵی (١١٩٧ ك)دا میرنیشینی وڵاتی (بەبە– بابان)ی گرتەدەس. لەساڵی (١١٩٩ ك)بەرامبەر(١٧٨٤ ز)دا بنیاتی شاری سلێمانی نا لە شوێنی ئێستای. برایم پاشا هەر لە منداڵییەوە لە بەغدا لە شارستانیەتی و ژیانێکی بەرزترا دەژیا، بۆیە کە هاتە سەر حوکم نەیتوانی لە شارێکی پاشکەوتووی وەکو قەڵاچوالاندا بژی (١)، هات سلێمانی دورستکرد لە دەوروپشتی ئەو قەڵایەی مەحمود پاشای مامی دروستی کردبوو لە شوێنی دەبۆ کۆنەکەوە قەڵاکەی کرد بە شوێنی سەرباز (قشڵەی عەسکەری)و بەم لاتریشەوە سەرای دروستکرد(٢). بەشی حەرەم و دەستوپێوەندیشی هەر بە تەنیشت سەراکەوە دروستکرد.

برایم پاشا بە دروستکردنی شاری سلێمانی جێماوێکی بەنرخی بۆ میللەتی کورد بەجێهێشت، جگەلەوە خۆشی گەلێك ماندوو کرد بۆ پێشکەوتنی وڵاتەکەی لەرووی (تەعمیر)و بڵاوکردنەوەی ئاسایش و شەکاندنەوەی ئاڵای هەق بەناو خەڵکیدا، هەر لەکاتی فەرمانداری ئەوا بوو سنووری ژێردەستەی بابان گەیشتە خانەقین و قەسری شیرین و زەهاو... میللەت لەکاتی حوکمڕانی ئەوا بەتەواوەتی کەوتنە ئاسودەییەوە،

لە هەر چوار لاوە وڵات فراوان بوو، کشتوکاڵ و بازرگانی پەرەی سەند، هەرلو هوریا نەما.

والی بەغدا گەلێ جار خۆی هۆی دەکەوتە برایم پاشا کە کارێکی گرنگ ڕوویبدایە، بەجۆرێك بەو نەبووایە ئیشی بۆهەڵنەدەسوڕا یا ئاگری شۆڕشێك بکەوتایەوە بەو نەبوایە نەدەکوژایەوە. ئەوەبوو لەساڵی (١٢٠٠ ك )دا بەسەر لەشکرایەتی هێزی بەغداو لەسەر تکای والی برایم پاشا هەستا چوو بۆ عەرەبستانی عێراق، لەوێ (حاجی سلێمان بەگ) هەڵسایەوە، ئەم جارە (عوسمان پاشا)ی برای چوو بۆ شکاندنی خۆی و لەشکرەکەی. دیسان (شێخ ثوینی) شێخی (منتفك) کە هەڵسا، برایم پاشاو عوسمان پاشا چوون شۆڕشەکەیان کوژانەوە، هەروەها کە یەزیدیەکانی ناوچەی (سنجار) هەڵسان برایم پاشا لەسەر تکای والی بەغدا چوو بڵاوەی پێکردن. کەچی والی بەغدا لەگەڵ ئەمانەشا هەمووی چەند جارێك برایم پاشای لە پاشایەتی خست بۆئەوەی کە ئاسودەیی و(استقرار) پەیدا نەبێ لە وڵاتی بابانا ، ئەوەبوو کە برایم پاشا بۆ دواجار کە شوێنی خۆی گرتەوە تەولو جێی قایمکردو دەستیکرد بە ئیشکردن لە شارەکەداو ناردی لە هەموو لایەکەوە زانای بەناوبانگی هێنا، لە سلێمانی کۆیکردنەوە، (مەدرسە)و مزگەوتی بۆ دروستکردن(٣)و دەستی هێنا بە وڵاتا، ئیتر مایەوە تا لە گەڕانەوەیا لە کوژاندنەوەی شۆڕشی یەزیدیەکان لە ڕێ نەخۆشکەوت و فەرمانی یەزدانی بەجێهێنا، تەرمەکەیان هێنایە موسڵ لەوێ لە تەنیشت گۆڕی (نەبی یونس) شاردیانەوە لە (١٢١٧ ك)دا.

لام وایە مەلا نەجمەدین زۆر جوانی فەرمووە کە دەڵێ:" برایم پاشا ئەگەر لە ئەسکەندر مەزنتر نەبێ کە شاری ئەسکەندریەی دروستکردو لە جەعفەری مەنسور زیاتر نەبێ کە بەغدای دروستکرد، لەوانە کەمتر نیە."

لە نەوەی ئەم میرە ئێستا لە بەغدا (جەلال بابان وبراو برازاکانی)و (بابانەکانی کفری محەمەدو مەحمودو عبدولقادر بابان).

له سلێمانیش (سەعید بەگی ئەحمەد بەگ کە سەعید بەگی گومرگی پێ دەڵێن و عەبدولڕەحمان بەگی نفوس و کوڕو وەچەیان هەن).

له بیرم دێ سلێمانی کە دارملکی بابان بوو
نه مەحکومی عەجەم نه سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو
لەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلاو زاهید
مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت- گردی سەیوان بوو
لەبەر تابووری عەسکەر، ڕێ نەبو بۆ مەجلیسی پاشا
سەدای موزیقەو نەقارە تا ئەیوانی- کەیوان بوو
دریغ بو ئەو زەمانە ئەو دەمە ئەو ڕۆژە
کە مەیدانی جریدبازی لە دەشتی- کانی ئاسکان بوو

شێخ ڕەزای تاڵەبانی
هیوا ژمارە (١٠ ساڵی ١-١٩٥٨)

## مامه یاره

بێگومان زۆرکەس گردەکەی مامەیارەیان بینیوە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە، ڕەنگ هەیە گەلێکیش چووبنە سەری و دەوروپشتی بۆ سەیران لە بەهارا، هێکجار سەیرانی ڕۆژەکانی نەورۆز کە تاکو خوالێخۆشبوو پیرەمێرد مابوو پێکی دەهێناو دەیکرد بەشایی و زەماوەند لەو ناوەدا.

جا ئایا ئەو مامەیارەیە کێیە کە ئەم گردەی بەناوەوە ناو نراوە؟

مامەیارە لە بنچینەدا خەڵکی دێی (کانی درکە)ی ناوچەی شارباژێڕە، خۆی یەکێك دەبێ لە تۆپچییەکانی ئەحمەد پاشای دوا میری بابان، ئەحمەد پاشا کە

دەبێ بە شەڕی لەگەڵ سوپای تورکیاو تەنگ بە لەشکرەکەیان هەڵدەچنێ لە ناوچەی کۆیەدلو لەوەدا دەبێ تورکەکان بشکێنێ و تەفروتونایان بکات. (نەجیب پاشای گۆزلگلی) کە ئەو دەمە والی تورك دەبێ لە بەغدا هانای ڕێککەوتن دەباتە بەر ئەحمەد پاشا، بەڵام ئەحمەد پاشا گوێی ناداتێ، ناچار نەجیب پاشا دەکەوێتە تەڵەکەو ساختەکاری بەناو شێخ و مەلاو پیاوە ئاینیەکاناو پێیان دەسەلمێنێ هەر کەسێ شەڕ بکات و دەست لە سەربازی والی بەغدا بکاتەوە، وادەگەیەنێ کە چەك دژی سوڵتان واتا لە (خەلیفەی ئیسلام) هەڵدەکێشێ. ئەم ئاین و ئۆینکارییە کاری خۆی کرد لەناو شەڕکەرەکانی ئەحمەد پاشادا کە هەموو دەستیان لە شەڕ کێشایەوەو هەرکەس بەلایەکا بڵاوەیان لێکرد، ئەحمەد پاشاش ناچار ڕۆیشت و وڵاتی بەجێهێشت (١٨٤٩–١٨٥٠ ز).

سۆفی یارە لەم شەڕەدا لە بارەگای ئەحمەد پاشادا مایەوەو لەگەڵ لەشکرە شکاوەکەدا هەڵنەهات. کە پیاوەکانی نەجیب گۆزلگلی دەچن بۆ تاڵانی بارەگای لەشکری شکاو، سۆفی یارە هەر لەسەر تۆپەکەی خۆیەوە دەیانداتە بەر ئاگرو لێزمەی گوللە تا درەنگێك نایەڵێت کەس بچێتە ناو بارەگاکەیانەوە، تاکو لە دواییا دەیگرن، کە ئەی بەنە لای والی ولێی دەپرسێ.. "ئاخر تۆ ئەمەت بۆ کرد، بەچاوی خۆت دیت لەشکر شکاو هەڵهات، بۆ خۆت نەدا بەدەستەوە؟" ئەویش لە وەڵاما دەڵێ: "شکاندنی لەشکر نابێ من لە ئیش و(واجب)ی خۆم بخات کە سەربازێکم و نابێ خۆم بە دەستەوە بدەم، لەبەرئەوە ناچاربووم تا لە وزەما بوو چیم لەسەربوو بە جێم هێنا". والی وەڵامەکەی زۆر لا جوان دەبێ لەسەرئەوە دێی دڕکەی سەروبەر دەداتێ کە بیخوا، ئێستا ئەو دێیە بەکانی دڕکەی سەگانی سۆفی یارە ناوی دەرکردووە، چونکە مامە سۆفی ڕاوچی و سەگەلێکی زۆری بووە.

دیسان دەڵێن هەر لەسەر ئەو ئازایی و چالاکییەی مامەیارە کە لەشەڕدا نواندوویەتی، وە لە پاداشتی وەڵامە جوانەکەی والی کە داوەتەوە، دەیبەن بۆ

ئەستەمبوڵ لەوێ لێی دەپرسن خواستت چییە؟ داوا بکە، ئەویش جگە لە ئازادی خۆی لە دێی کانی دڕکەو گردی مامەیارە زیاتر داوای هیچی تر ناکات، کە گورج پێی دەبەخشن. لام وایە ئەگەر بیویستایە کام پایە لە میریا کە بە شان و بازووی ئەو بشیایە تورکەکان دەیان دایە، بەڵام کابرا ژێردەستی و مووچەخۆری بێگانەی پێ هەزم نەکراوەو نەی گۆڕیوەتەوە بە سەربەستی. بۆیە شیرینیشی بە گردەکەدا چوویوو کە شوێنەکەی خۆش و لەو گوێ کارێزو ئاوە روونەی دیمەنێکی دڵفرێن و جوان پێك دەهێنێ کە بەتەواوەتی بشێ بۆ مەزار.

مامەیارە، پیاوێکی تێگەیشتوو بە ئاین و دەس بڵاوو پیاو چاك بووە. گوایا پاش داگیرکردنی سلێمانی لە لایەن تورکەکانەوە ئەم بە بەرگی جەنگاوەری و سەربازێتییەوە بە چەك و زرێوە، یاخود بە سواری و ڕم بەدەستەوەو سونی بە لاقەدەوەو خەنجەر بە بەرۆکەوە (بە یادی جارانەوە) جار جار هەر سووڕاوەتەوەو وەك جارچی جاڕی داوە بۆ کردەوەی باش و ئیشی دروست. لام وایە هەر بە بیرەوەری ئەوساشەوە پانتۆڵ (شەڕواڵ)ی سەربازیەکەی دانەکەندووەو هەر لەپێیا بووە.

مامەیارە پیاوێکی زۆر بەسام و ڕێزگیراویش بووە، بیریشی ئەوەندە بەرزبووە ویستوویەتی کانی دڕکە کە ئەوسا چۆڵ و وێرانەو بێ کشتوکاڵ و باخات بووە، بەشێوەیەکی نوێ لەسەر هونەری کشتوکاڵ ئاوای بکاتەوە.

خوالێخۆشبوو تا مردیش هەر دڵسۆزبوو بۆ ئەحمەد پاشاو بنەماڵەی بابان.

لەم دواییەدا لە خانووەکەی خۆیا دەژیا لە سلێمانی لە گەڕەکی گۆیژە کە ژوورێکی تەرخانکردبوو بۆ خۆی و ژێرەکەی کردبوو بە خانی وڵاخ، لەوە ڕۆژی چەند (بێچوو)یەکی دەست دەکەوت و گوزەرانی پێدەکرد. لەبەرئەوەی کە وەجاخیشی کوێربوو کە مرد جێماوی هەمووی بە (ئەحە گوساڵە) ناوێك بڕا کە خزمی بوو، یاخود

خۆی کردبوو بە خزمی. لەسەر ڕاسپاردەی خۆشی لە گردەکەی خۆی ناشتیان ئەو گردەی کە پیرەمێردیش ڕایسپارد کە مرد هەر لەوێ بنێژرێ.

ئێستا گردی مامەیارەی پیرۆز تەرمی دوو ڕۆڵەی نەمر، واتا گۆڕی دوو ئەستێرەی گەشی کوردی پێوەیە، یەکێکیان مامەیارەی قارەمان لە ئازایی و ڕاستی و پیاوچاکی و ئایندارپا، دووەمیان پیرەمێردی مەزن فەیلەسووفی گەورەی کورد لە ئەدەب و پەندی جوان و بیری بەرزو نیشتمانپەروەریدا.

## کاوێس ئاغا (١٨٨٠–١٩٣٦)

پێشکەشە بە هەموو خاوەن هونەرێك لە گۆرانی و ئاوازو سازدا

(بەکورتی و دوای دەستکارییەکی کەم لە پەرتووکی(هەرکی)یەوە وەرگیراوە. نووسینی (م. هۆشەنگ) لە شەقلاوە کە هێشتا لەچاپ نەدراوە).

کاوێس ئاغا کوڕی کانبی(کانو) لە خێڵی هەرکییە(١) لە لقی(بەرەناوی)(٢).

١ـ هەرکی: ئەو خێڵە گەورەیەی کوردە کە لە سنوری کوردستانی عێراق و ئێران و تورکیادا دەژین. ژمارەی گشتیان پترە لە پەنجا هەزار کەس، ژمارەیان لە کوردستانی عێراقا بەگوێرەی سەر ژماردنەکەی ساڵی (١٩٥٧) هەشت هەزار سەر پترن.

٢ـ خێڵی هەرکی سێ بەشی گەورەیە (مەندا یاخود مەندان)و (سییدا یان سییدان)و (سەرانی یا سەرهاتی). سەرانیش دەبێ بە سێ لق (فەخری، سمایلی، ناوی) ناویش دیسان دوو لقە (مژدینی، بەرەناوی).

لەبەینی مانگی خەرمانان– گەلاوێژی ساڵی (١٨٨٠ ز) لە یەکێك لە کوێستانەکانی کوردستانی ئێرانا لە دایك بووە. بۆیە دەڵێن لە کوێستان، چونکە باوکی ڕەوەند واتا کۆچەر بووەو گەرمیان و کوێستانی کردووە. دایکی ناوی لەیلییە.

کاوێس هەر لە منداڵییەوە بە ئاوو بای خۆش و دڵگیری کوێستانە دڵفرێنەکانی کوردستانی ئێران وەك (مەرگەوەڕ)و (تەرگەوەڕ)و (دەشت)و (دەشتی بەراندین)و (چارچەلی هەرکیان) گیانی پەروەردە بووەو بەژیانی کۆچەرایەتی و هەچە هەچەی وڵاخ و لێخوڕینی ماڵات و باربردن و کۆچکردنی ناو ئەو کوێستانانە پێگەیشتووەو گەورە بووە، یەك ڕۆژەی دووڕۆژە ئەو کاوێسە ناوی دەرکردووە، چ بەئاوازی خۆش و چ بەئازایی و بەشداربوونی لە جەنگ و هەرای هەرکی لەگەڵ خێڵەکانی ترا وەك خەیلانی و سورچی و برادۆست.. تاد. لەگەڵ ئێرانی و تورکەکانا چ بەتفەنگچێتی و نیشانپێکان و سوارچاکی و چ بەتیابوونی ئەو مەرجانەی تر دێن کە پێیان دەڵێن (ڕسپی یا ریشسپی) کە هەر لەکۆنەوە لە پلەی گەورەو بچووکی ناو خێڵی هەرکیا، ئاغا گەورەی هەموانیانە پاش ئەو پاش ئاغا یاخود باش ئاغا دێت. ئەم دووانە پێویستە لە بەشی (مەندان)(٣)بن. ئنجا سەرۆك دێ، کە ئەویش لەپلەی پاش ئاغادایەو پێویستی بەوە نیە لە بنەماڵەی ئاغا بێت، بەڵکو هی واهەیە بەلێشیاوی و توانای خۆی دەگاتە ئەم پلەیە. پاش ئەویش چینێکی کە دێن، کە پێیان دەڵێن (ڕسپی یا ریشسپی) کە هەر لەکۆنەوە تاکو (٢٠-٣٠) ساڵێکیش لەمەوبەر هەرکیەکان پێیان وتون (بەرایی) دوای ئەمانیش چینی (سەرزوم) دێن کە هەر یەکێك لەوانە گەورەیەتی بیست ماڵێك دەکات(٤).

کاوێس ئاغا لەناو هەرکیا لە سەرزمەوە تاپلەی بەرایی گەیشتووە. گەیشتنیش بەو پلەیە هەروا گاڵتە نییە، جا بۆئەوەی هەر کەسێك ببێ بە بەرایی یا سەرۆك یا ڕسپی پێویستە هەندێ مەرجی تیا بێت وەك:

پسپۆڕیەتی لە ماڵات و لەوەڕو ئەو گژوگیایانەدا کە دەیخۆن، پسپۆڕیەتی لە کەش و تەوش و باران و بەفرو ساردو گەرمی و خۆشی و ناخۆشی ساڵی ئایندە بەوردی کە ئەویش بەگوێرەی بنك و لێکدانەوەو بەراوردێکی تایبەتییە کە لە چلەی هاوینی ساڵی پێشووتردا لە کوێستان ڕایدەگرن، کە هاتنەوە بۆ گەرمیان لە زستانا

هەمووی دەق دەردەچێ، ئاگاداری خورەوشت و دەستوری تایبەتی خێڵەکی بێ، هێجگار هی هەرکی و بەسەرهاتەکان و ڕووداوەکانی هەرکی بەوردی بزانێ، خاوەنی ڕەوشت و خووی خاوێن و دەس و داوێن و زمانپاك و لەسەرخۆو مەنگ بێ، هەموو هەرکی بەژن و پیاوەوە ڕایان لێبێ، خوێن لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی نەبێ، نان بدەو ئازاو قسەزان و ژێردەستدارو خاوەن بنەماڵەیەکی ناسراوی هەرکیان بیو بۆنی سوکیان لێ نەیەت... تاد.

بەم گوێرەیە بە کۆبونەوەی ئەم مەرجانە لە کاوێسا، کاوێس کراوە بە ڕسپی ئەمجا بە بەرایی لە خێڵەکەی خۆیا بۆ ئەو چوار لقە. کە پترترن لە (٤٠٠)خێزان کە ئەمانەن (ماله حەمان)و (ماله ئاورنج)و (ماله بابەکر)و (ماله چەلەنگ).

ئەوەی شایانی باسە لێرەدا، هەرکی تا (٣٠)ساڵیش لەمەوبەر بەر(ئاغا)ی هەموو خێڵەکەیان نەبووایە نەیان دەوت ئاغا کە ئەویش هەر یەکێك بووە بۆ گشت خێڵەکەو پێویستبووە لە لقێکی تایبەتی هەرکی بێت. کاوێس سەرناوی ئاغایەتی وەرگرتووە، لە کاتێکا کە لەبەشی هەرە دوایی لقەکانی هەرکی بووە. ئەمەش بە ئازایەتی و دەمڕاستی و ژیریەتی و تیابوون نەبێ دەستی نەکەوتووە، ئەو بیرە بەرزە نیشتمانپەروەریەی کە پاڵی بە کاوێسەوە دەناو ئەو بیرە تیژەی کە هەیبووەو ئەو ناهەمواریەی ژیانی کۆچەرایەتی بەتایبەتی ژیانی هەرکی و پاشیکەوتنیان و بێ شوێنیان.

دیسان لەبەر زۆری دارایی هەرکی لە هەموو لاوە دەسیان بۆ درێژکردوون و دەمیان تێوە ژەنون. ئەمانەو گەلێ هەستی تر هەموو بونەتە گرێیەکی نەفسی ئەوتۆ کە ئەم کاوێسە هەر لە منداڵییەوە گرنگترین و گرانترین باری لەسەر شان قورس بێو لە دڵی بپەسترێ و ئەم کارانەی بەوە لێ دیاری بدات کە زمانی پس و لاڵە پەتە بێ.

ڕاستە وابووە کە کاوێس لە قسەکردنا زۆر وشەی بۆ نەهاتووە، وەیا زۆر پەرێشان بووە لەکاتی دواناو بەزۆر توانیویەتی بیری خۆی پچرپچرو نیوەو نیوەچڵ

دەربـبڕێ. دەبـە پێـچەوانەی ئەمانـەوە هـەمووی لـەکاتی گۆرانی وتنـدا زۆر ڕەوان و زمانپاراو بووەو هەرگیز زمانی نەگیراوە. کاوێس ئاغا زۆر باری دەردی و پەیغامەکەی گرانبووە، بۆیە لەوە باشتری نەدۆزیوەتـەوە کە واز لـە ژیـانی ڕەوەندایـەتی، واز لـە سەرۆکی ئەمرو ئاغایـەتی دواڕۆژ بهێنـێ، خـۆی تێکـەڵاوی خێڵـەکان و خـەمی خـۆی بەبادا. هەر لـەم تێکەڵبوونەیدا فێـری خواردنـەوە بـووە کـە ئەمەشـی بەچـارەیەکی دەردی خۆی دۆزیوەتەوە.

کاوێس ئاغا کەوازی لە ژیانی کۆچەرایەتی هێناوە لە شەقلاوە لەساڵی (١٩١٤)وە بۆ(١٩١٧) لەلایەن مدیرێکی ئەوسای ناحیەی شەقلاوەوە کە نـاوی (نـەورۆز ئەفـەندی ڕەواندن)ی دەبیّ دەکرێ بە (مەئمور مەخزەن— اشیاو ارزاق)ی تورك کە لە خـەڵکیان ئەسەندو لە دێر(کنیـسە)ی ئێـستای دیانـە کلدانییـەکانی شـەقلاوە دابـووە. کـاوێس هەرچەندە نەخوێندەوار بووە، بـەڵام بـەهۆی ئـەوەی بڕوایـان پێـی بـووە بۆیـە ئـەم ئیـشەیان داوەتـێ، تەنانـەت ئیمزاشـی نـەزانیوە، ئـەو مـدیرە فێـری کـردووە. ئـیتر لـەوەش بـەدواوە موچـەخۆری مـیری نـەکردووە، زۆری ژیانیـشی لـەوەدوا لای بـرا گەورەکانی کوردو لە دیوانە بەرزەکاندا بەنرخەوە ڕایبواردوەو لای هەمووان ڕێـزگیراو بووە.

زۆر دۆستی شێخ مەحمود بووەو هاتوچۆی کردووەو ڕاوشکاری لەگەڵ کـردووە. کاوێس ئاغا هەرچـەند وازی لـە ژیـانی کۆچـەرایەتی و ڕسـپیەتی هـەرکیان هێنـابوو، بەڵام جارجارە سۆزێکی دەروونی کەوا هەر لە دایکبوونیەوە ئاوێتـەی لـەش و گیـانی بوویبوو، بەڵام ئەو هێزە پاڵی پیوەدەنا کە هەندێکجار سـەر لـە خزمـانی نـاو هـەرکی بـداو بـۆ ماوەیـەك ئـاگری ئـەو سـۆزەی دڵـی دامرکێنێتـەوە، تـاکو هـەر جارێـك لـە جارەکانی ئەم سەردانەدا کە کەمێك نەخۆشیش دەبێ سـەرێکی نـاو ئـەو هەرکیانـە دەدا کە لە ناحیەی سـەلاحەدین خـستبوویان، بـەو بڕیـارەش کـە لـەوەدوا سـەرێکی هەرکییەکانی ناوچەی کۆیەش بـدا بـۆ زاخـاوی چـاو بەدیمەنـە جوانـە خۆرسـکەکانی

کوردستان و دیدەنی برا گەورەکانی کۆیەش، بەڵام لەکاتی گەیشتنە نزیک گوندی- هەرشەم- دا کە لە ناحیەی سەلاحەدین دایەو کەوتۆتە لای خوارووی قەڵای (دیوین)(٥)ی بەناوبانگ و ڕۆژهەڵاتی گوندو چایخانەی (بانەمان)ی سەر ڕێگەی هەولێرو سەلاحەدین لەبن چیای پیرمەم دا، لەوێ لە یەکێك لە پاوەنە زستانەکانی دەوروبەری ئەم گوندی هەرشەمەدا بۆ دواجار دیدەنی هەرکیانی کردو چوونەکەی کۆیەشی بۆ ڕێکنەکەوت. لەوێ بەدەستێکی پیس و چڵکنی تاوانبارێك کوژرا، گوایە لەسەر حەزلێکردنی لە ئافرەتێك و هەرلەوێ گیانی پاکی بەخاك سپاردو لە ڕۆژی چوارشەممەی مانگی ڕەزەبەری ساڵی (١٩٣٦)داو تەرمەکەی هەر لە گۆڕستانی ئەم گوندەدا شارایەوە کە گۆڕی گەلێکی تر لە پیاوە ناسراوەکانی هەرکی تیایە: ئەولەی دوای کاوێسی خوالێخۆشبوو مانەوە خوشکەکەیەتی کە ناوی دەروێش فاتمی هەرکییە لە گوندی (سپی گرە)ی نزیك شەقلاوە شوی کردووەو ژنەکەی خاتوو هەمینێ و کوڕەکانی ئەحمەد ئەفەندی (مدیری مال)ی شەقلاوەو محەمەدو عەبدوڵڵا کە هەر لە شەقلاوەن و جەمیل کە سەریازە، کاوێس ئاغا کاتێ کە مردووە ریشی ماش و برنجی بووە، پیاوێکی (زەلام و کەڵەگەت بووە. بەزۆری بەرگی خۆشناوەتی لەبەرکردووەو جار جارەش بەرگی بادینانی. چاوی چەپی تانەیەکی سپی بچووکی لەسەربووە).

## هونەرمەندیی و بوێژی کاوێس ئاغا

لام وایە هەموو کوردێك ئاوازی ئەم بولبولی خۆشئاوازەی کوردستانی بیستوە لە حەیران لاوك. هەروەها کاوێس بوێژیش واتا شاعیر بووە. دانانی هونراوە(شیعر) کە بیرێکی بۆ هاتبێ ئەو شەوە نەنووسیتوە هەتا شیعرەکەی گەڵاڵە کردووە، ئەمجا پوختەی کردووەو بۆ بەیانی ئاوازی تایبەتی هەر خۆی بۆی داناوە ئەمجا لەبەر خوێندویەتیەوەو وتویەتیەوە، بەڵام لەبەر نەخوێندەواری خۆی و کۆمەڵەکەی زۆری

هەڵبەست و ئاوازەکانیشی هەر دەماودەم ماونەتەوە، بۆیە هەندێکی ونبوون. ئەوەندە هەیە شیعرەکانی ئەم لەگەڵ هەندێ لە شیعری شەریف ئاغا (شر) کە ژنێکی خۆ بەپیاوکردووی مەردانەی هەرکی بوو تێکەڵبوون. کاوێس لە هۆنراوەی لاوك و حەیرانا دەستێکی باڵای هەبووە. واتاکانی هەموو خوکرد وەیا بەگوێرەی ژیانی رەوەندایەتییە وەکو سنگی یارەکەی خۆی کردووە بەسینی و زەرفی ساوەر کە کاوێس بۆ بەربانگی رۆژووشکاندنی خۆی هەڵگرتووە، یاخود سنگ و مەمانی کردووە بە بەردەنوێژی پێش نوێژو تەرخانی کردووە بۆ نوێژ لەسەرکردنی خۆی و (ئاگا– الهام)ی لە هەڵسان و دانیشتنی و وێنەو نیگای کۆچەرایەتی وەرگرتووە. هۆنراوەکانیشی لەسەر شێوەی چیرۆك و لەسەر ئاوازی لاوك و حەیرانە کە بە ئانوپۆی هەندێ رووداوی دڵداری، وەیا قەومیدا هەڵدەدا، ئاوازو گۆرانی کاوێس هەرگیزاو هەرگیز نامرن و کۆن نابن لەساڵی (١٩٣٠)ش بەدواشەوە دەستیکرد بە قەوان دەرکردن، نزیکەی چل قەوانێکی هەن لە ئاوازو هۆنراوەی خۆی. ئەمانە هەندێکی هاوکاری (نەعیم)و ئەوانی تر هاوکاری (بێزافۆن) تۆماری کردوون. ئەوانەی هاوکاری بیزا دەریکردووەو لەسەری نووسراوە لێدانی لە ئێستگەدا قەدەغەیە ئەم دووانەن بۆ نموونە:

١ـ بیانووخانە فیفی بە ژمارە (٩٢٢١٠) تۆمارە لە جەنگێ دەدوێ.

٢ـ هامدانە دولبەر بە ژمارە (٩٢٢٣٦) تۆمارە.

زووریشی قەوانی شێخ مەحمودو شەرە قەومییەکانی و کوژرانی (سمایل ئاغای سمکۆ) هەیە، هەندێ قەوانی تریش هەن کە نەیان هێشتووە بڵاوبکرێنەوە لەبەر نیشتمانپەروەریتی.

هیوا. ژمارە ١٢ ی ساڵی –١– ١٩٥٨

## کوردی و مەریوانی کێن؟

ئەگەر سەیرێکی نامیلکە، یاخود هەندێك لە کتێبە کۆنەکان بکەین ئەوانەی لەساڵەکانی بیست و سییەکاندا لەچاپ دەدران و دەرچوون، دەبینین زۆریان لەلایەن دوو کەسەوە دانراون، یاخود چاپکراون، ئەو دووانەش کوردی و مەریوانین ئەوەتا کتێبی (گۆرانی) ژمارەی چوارەمی بەرهەمی کوردی و مەریوانییە کە ساڵی (١٩٣٢) لە چاپخانەی (ایتام) چاپکراوەو نرخی (٢٤) فلسە. لە پێشکەشکردنا بۆ کچانی کورد ئەم پێشەکییە نووسراوە: (لەبەرئەوەی گۆرانی زۆر تەئسیر ئەکاتە سەر حسیات و شعور بەهیوای ئەوەی کە بەحسیاتی بەرز نەسلێکی نەجیب و فیداکار پێبگەیەنن بۆ ئەم وڵات ومیلەتە بەدبەختەو بەئومێدی ئەوەی کە لەمەولا گۆرانی تایبەتی مکتەبی کچانیش ببینن ئەم کتێبەمان پێشکەشی خوشکە خۆشەویستەکانی وڵاتی کورد کرد. بەغدا (١٩٣٢)کوردی مەریوانی گۆرانییەکانی ئەم کتێبەش هەموو گۆرانی نەتەوەیی و نیشتمانی لە شیعرە بەرزە نیشتمانپەروەرەکان بۆ نموونە ئەم گۆرانیانەی کرتۆتە دوو توێی خۆی:

(پیرەمەگرون مقدسی – دۆستی دایمی کوردی. شیعری زێوەر)

(ئەی تانجەرۆ کەوسەری هەموو خاکی کوردستانی خۆمانی) بێکەس.

(علمە ملت نائلی جاهو شکوەو شان ئەکا) م. نوری، عەلی کەمال واتا شێخ نوری شێخ ساڵح و عەلی باپیر ئاغا.

(کوردین ئێمە زۆر بێ پەروایـن – بەشەرە گوللە ئاشنایـن) رەفیق حیلمی.

(دڵ لە دەردی وەتەن پەست و گیراوە– وەك کەوی ناو قەفەس شەوقی نەماوە) بێکەس.

(ئەی وەتەن ئەی شوێن و جێگای مللەتی کوردی جهان) عارف سائب.

(ئێمە کە منداڵ و نەوجەوانین– هەموو بەقوربانی کوردوستانین) زێوەر.

(وەختی ئەمنیش حاکمی مجموعی جهان بوم– مەروانە ئالەم ڕۆژە بێ ناونیشان بووم) ئەسیری.

(گلەیی لە کەس ناکەم بۆ بەختی خۆم ئەگریم) پیرەمێرد.

نزیکەی پەنجا (نەشید) دەبێت جگە لەلاوك و قەتارو حەیران و ئەلاوەیسی و خاوکەر. کۆتایی کتێبەکە بەناوی مانگە کوردییەکان هاتۆتەوە کە جیاوازی هەیە لەگەڵ ناوە بیستراوەکانی ئەمڕۆدا وەك (مارت– نەورۆز)، (نیسان– گوڵان)، (مایس– دروێنە)، (حوزەیران– خەرمانان)، (تەموز– میوەخۆش)، (ئۆگستۆس – میوەچن)، (ئەیلول– مشتافان)، (تەشرین ئەوەل– پەڵە)، (تشرینی دووەم– گەڵارێزان) (کانون اول– شێف بڕ)، (کانونی دووەم– تۆویر)، (شوبات– ڕەشەمێ) دوای ئەوە ئەلفبای کوردی و (دەنگیەکان) بەپیتی لاتینی دوای ئەم کتێبە: ئەمانەی تریان بە چاپ گەیاندووە.

١ـ توتنەکەمان ٢ـ دیوانی سالم ٣ـ دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ٤ـ هەموو کچێك چی بزانێ...

## کوردی کێیە؟

کاتی خۆی کوردی لە بابەت خۆیەوە ئەم نامەیەی بە دەستوخەتی خۆی بۆ نووسەری ئەم کتێبە ناردووەو تیایدا دەڵێت: "ڕۆژی ١٩٠٤/٨/٢٥ لە شاری کفری لە دایك بووم، چونکە ئەو وەختە باوکم لەوێ قازی بوو. لەپاش دوو ساڵێك هاتینەوە سلێمانی. لە عومری شەش ساڵانیدا چوومە قوتابخانەی ئەو زەمانە کە بەتورکی ئەمانخوێند تا پۆلی شەشەم تەواو کرد. کە ئینگلیز لەسەر داواکردنی میلەتی کورد خۆی بێ شەڕو شۆڕ هاتە سلێمانی دیسان چوومەوە قوتابخانەی ئەوسا کە مێجەرسۆن حاکمی سیاسی بوو چاپێکی هێنابووە سلێمانی و ڕۆژنامەی پێشکەوتنی دەردەهێناو بەهەموو دێهات و ناحیەو قەزاو شارەکانا بڵاوی ئەکردەوە، هەموو

هەفتەیەکیش بەشێکی زۆری لەو ڕۆژنامەیەی ئەنارد بۆ قوتابخانەکەمان و بەسەر هەموولانا دابەش ئەکرا بۆئەوەی کە زاخاوی چاومان بدەینەوە بەکوردی بخوێنین و بخوێنینەوەو لەواقعیدا زوو تەئسیری کردەسەر بیرو هۆشمان... لە پاش ساڵێك لەبەرئەوەی پۆلێك نەبوو من و چەند کەسێك کە لەشەش دەرچوویووین تیا بخوێنین وازم لە مەکتەب هێنا. لە (١٩٢١)دا هاوین لەگەڵ... برامدا کە مدیری ماڵ بوو لەوێ چووم بۆ هەڵەبجەو لەوێ لەگەڵ هەرزەکارەکانی ئەوێ وەکو عەبدوڵڵا سلێمان (گۆران)و مەحمود بەگی ئەورەحمان و ئەحمەد بەگی برای و هەندێکی تردا کۆمەڵەیەکی بچووکمان پێکەوەناو کەوتینە بڵاوکردنەوەی بیرو هۆشی کوردی و خوێندنی و یەکیەتی بەتایبەتی لەناو بازاڕاو لەو دێهاتە نزیکانەی هەڵەبجە. لەو وەختانەدا قەرارماندا بچین بۆ کەرکوك کە مەکتەبێکی باشی لێبوو قسمی دلخلی هەبوو و من و عەبدوڵڵا گۆران و عەبدولواحد مەجید (ع. و. نوری) بە کاروان چووینە کەرکوك بۆ خوێندن لەوێش لەگەڵ ئەو قوتابییە کوردانەی کەرکوك و ئەوانەی لە کۆیەو کفری و هەولێرەوە هاتبوون کەوتینە ئیشکردن بۆ بڵاوکردنەوەی بیری میللیەت لەناو قوتابیان و ئەهالیدا بەچەشنێك لەپاش ساڵێك موفەتیشی عامی مەعارفی ئەوسا (مستر دایلی) کە کوردی خۆشئەویست و نیازیبوو (دار ئەلمعلمین)ێك بکاتەوە لە کەرکوك بۆ پێگەیاندنی مامۆستا بۆ کوردەکان و ڕێگەیان نەئەدا، قەراریدا (ئیستفتا)یەك بکرێ بۆ تاقیکردنەوەی بیری کوردی خوێندن ئەوەندە هەوڵماندا لەناو قوتابیەکاندا لای کەسوکاری قوتابیەکان و لەناو ئەهلی کەرکوك لە بەشی گەڕەکی کوردەکانا وەکو تەکیەو ئاخی حسین و زیویەو ئەوانە لە نەتیجەی ئیستفتاکەدا (سەدی ٦٠–٧٠) داوای بە کوردی خوێندنیان کرد، بەڵام داخەکەم پاش ساڵێك ئەو مفتشی عامە کە هۆی ئەم بیرو ڕایە بوو لایان برد لە معارف و ئیشەکە سەری نەگرت. ئەو وەختە ئێمە زۆر هاتوچۆی شاعیری میللی کورد (عەبدولخالق ئەسیری)مان ئەکردو زۆر شیعرم لێ سەندبوو ئەوەی بەیانیان

لەگەڵ نەشیدی عەرەبی و تورکیدا بە کوردیش، گۆرانی بخوێنینەوە کە بەهۆی مستەر دایلییەوەو ئەو ئەمری دابو.

لە (١٩٢٣)دا هاتمە بەغداو چومە مەکتەبی هەندەسەوە لەبەرئەوەی لە وڵاتەکەی خۆماندا ئەو زەمانە خوێندن و مەکتەب کەمبو حەتا وەکو نەبوون وابو. جا زۆریەی قوتابیەکانی کوردستانی عێراق ئەچونە بەغدا لەوێ بخوێنن و لەپاش چەند مانگێك کۆمەڵەیەکی بچوکمان پێکەوە نا لەناو خۆمانا بەناوی (لاوانی کورد)ەوەو مۆرو تەمغەوشتمان هەبو و هەر کەسە بەپێی توانای خۆی مانگی شتێکی ئەدا لەعانەیەکەوە تاڕوپیەیەك و ئەوپارەی لای من ئەبو چونکە من (معتمد)ی کۆمەڵەکە بووم. دەسمانکرد بە بڵاوکردنەوەی بیرو هۆشی میللی و نەشراتمان ئەنووسی و ئەماننارد بەهەموو لایەکی کوردوستانا هەموو هاوینێکیش کە ئەچوینەوە وڵاتەکەمان زیاتر هەوڵمانئەدا بۆ بڵاوکردنەوەی بیری کوردایەتی و یەکیەتی و هەر کەسەمان لە شاری خۆیدا لە قوتابخانەکان کە ئەوساکە لەبەر دواکەوتنی خوێندن و خوێندەواری لەوڵاتا هەوڵمان ئەدا قوتابخانەکان ڕێیان بۆ ئەکردینەوە کەئێمەومانان بەخۆڕایی دەرسمان ئەوتەوە بەڕۆڵەکانمان کە دوانەکەون و هەندێکیشمان ئەسوڕاینەوە بە دێهاتەکاندا بەناوی گەشتەوە بۆ بڵاوکردنەوەی یەکیەتی و بیرو هۆشی قەومی بەدڵێکی پاك و گەرمەوە هەموو هەوڵمان ئەدلو وازمان لەڕەحەتی هاوینەکانمان هێنابوو. کە وەختێ مەکتەبی شەوی زانستی کرایەوە خۆم یەکێك بووم لەو ئەوەل خزمەتکەرانەی چووینە پێشەوە کە شەوو ڕۆژ خزمەتکەین و زانستی سەربخەین و شەو دەرسمان ئەوتەوە بەو قوتابیانە کە لە خوێندن بێبەشبوون و زۆریەیان کاسب و کرێکارو ئیشکەربوون بەرۆژ ئیشیان دەکردو شەو دەیانخوێند لەو وەختانەدا لە (١٩٢٦)دا کە هاتمەوە وڵات موهەندس بووم لە دائرەی ئەشغال بەهۆی گەڕۆکی وەزیفەکەمەوە هەموو وەختێ دەچوومە دێهات و ناو عشائرەوە وبیرو هۆشی میللیم بڵاودەکردەوەو نەشرات و بەیاننامەم بڵاودەکردەوە بەناویانا. لەو وەختەدا لەگەڵ

هاوڵاتیە تێگەیشتوەکانا کۆمەڵەیەکمان پێکەوەنا بەناوی (زەردەشت)ەوە کە دیسان من (معتەمەد)ی کۆمەڵە بووم و زۆربەی نووسینەکان بۆ هەموو لایەك من دەمنوسی و ئەندامێکی زۆرمان هەبوو لەوانە (شەوکەت بەگی عزمی بابان، عوسمان فائق، فووئاد مەستی، شێخ سەلام، کەریم سەعید، کەریم ڕۆستەم (مەشهورە بە کەریم شەلوم)و شێخ مەحمود، عەبدولواحد مەجیدو زۆر کەسی تر) لە خوێندەواران و تێگەیشتوانی وڵات و دەسمانکرد بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەی ئاگرین بە ناو دێهات و عەشائردا، لەو ساتانەدا لە ئەوەلی ساڵی (١٩٢٨)دا کە ئینگلیز هانی شێخ مەحمودیدا کە هەستێ لە دژی حکومەت حەرەکەت بکات. لەبەرئەوەی شێخ خۆی ئەندامێك بوو لە کۆمەڵەکەمان نەمان هێشت بێ پاداشت هیچ بکات و داوای هەندێ متالیبمانکرد کە یە کەمیان (مختاریت ئیدارە)بوو بۆ کوردستان و لەبەرئەوەی بۆیان دەست نەداو نەیانکرد ئێمەش ماوەمان نەدا کە شێخ مەحمود بێ مقابل و بێ سوود هەستێ... لە (١٩٢٩)دا هەندێ بەیاننامەو کاغەزم لێ کەوتبوو پێم نەزانی و لەپاش پرسین و تەحقیقاتی زۆر گۆریمیان بۆ ڕەواندوز لەوێش لەگەڵ ئاغاکانی رایات و باڵەك و حەریرو باتاس و لەگەڵ سەید عەبدوڵڵا کە مدیریوو لە حەریر نووسینم هەبوو لە بەینا بەهۆی ئەوانەوە بیاناتم بڵاودەکردەوە. دیسان حکومەت پێیزانی گۆریمیان بۆ موسڵ کە لەوێ ئیشی زۆرتروبەهێزترمانکرد لەگەڵ مەحمود جەودەت و ڕەفیق حیلمی و محەمەد عەلی کوردی (زابت بوو)و زۆر لە خوێندەوارەکانی کوردی ئەو ناوەش وەکو حازم شەمدین و میر ئیسماعیل یەزیدی کە کوڕەکەی لەگەڵمانا ئیشی ئەکردو لەوساتەدا بە هەموو لایەکمان ویستمان حەرەکەتێك بکرێ بە عەشائری زێبارو سورچی و یەزیدی و ئەوانە دژی ئینگلیز حەتا لەگەڵ برا عەرەبەکانی جەیشدا ڕێککەوتین بەمەرجێك کە حەرەکەکەمان سەریگرت و ئینگلیزمان دەرپەڕان ئێمە (مختاریت ئیدارە) وەربگرین لە داخلی حکومەتی عێراقداو قەرار درابو کە لەوسەرە حەرکەتکرا دوو فەوج لە جەیشی عێراق ئەلتحاق بکەن و بێنە سەر موسڵ و

قەرارماندا مەحمود جەودەت و محەمەد عەلی کوردی و عەبدولعەزیز کوردی کە زابت بوون ئەمانیش بچن بۆ عەقرەو ئەوانە کە داخڵی حەرەکەت ببن... لە پڕێکا سەعید قەزاز کە ئەوسا کاتبی مفەتیشی ئیداری بوو لە موسڵ خەبەری بۆ هێنام کە بەیاننامەو کاغەزەکانم گیراوە لەلایەن حکومەتەوە دەست بەجێ خەبەرمدا بە مەحمود جەودەت و ئەوان و هەرچی مۆرو تەمغەو کاغەزێکمان هەبوو لە شوێنێکی قایم شاردمانەوە هەر بۆ ڕۆژی دوایی گوێزرامەوە بۆ بەسرە. لە ئەولی ساڵی(١٩٣٠)دا هاتمە حلە لەوێ زیاترو گەرمتر لەگەڵ هاوڕێکانی ئەوێ و بەغداد هەوڵماندا کۆمەڵەیەکمان پێکەوەنابوو کەوتمە مخابرە لەگەڵ هەموو خوێندەوارەکانماندا لە کوردستان و بەغداد لەگەڵ تێگەیشتوەکانی سوریاو لوبنان و میسرو تورکیاو ئەمریکادا لەگەڵ ئەمین ڕەواندزی و سەید حەسەن و سەید حسێن و ئەمین یاملکی و سەدیق شاویس و گەلێکی تر کە ئەفیکرابوین بۆ حلەو لەگەڵ وەهبی بەگ و دکتۆر شکری و مستەفا شوقی و گەلێکی تر لە بەغدا. کە هەراکەی ٦ ی ڕەشەی ئەیلولی (١٩٣٠) ڕوییدا من و هاوڕێکانم لەحلەوە دەسمانکرد بە بەیاننامەو نشرات ناردن بۆ کوردستانی عێراق و ئێران و بۆ دەرەوەی عێراق بەهۆی برا کوردەکانی سوریاو لوبنانەوە پەیتا پەیتا لە بابەت شەڕو هەوڵدانەکەی کوردەوە بەتورکی هەموو دەنگوباسێکم ئەنارد بۆجلادەت و کامەران بەدرخان لە شام و بەیروت و بۆ مستەفا شاهین کە گەورەی عەشائری بەرازی بوو لە حەلەب بۆ سوریا بەدرخان لە پاریس و بۆ دکتۆر مستەفا نەجیب کە کوردی ئەو سەرەیەو بە نوسین ئەمناسی ئەوانیش لەوێ بەفرانسزی و ئینگلیزی وئەڵمانی بلاویان ئەکردەوەو هەموو جارێکیش نوسخەیان ئەدا بۆ عوسبەت ئەلئومەم کە ئەوسایە لە جنیف لە سویسرە بوو حتا هەموو تەلگرافەکانی خەڵکی ولات و هی ئافرەتەکانی کوردستان ئەیاننارد بۆ ئێمە چونکە حکومەت ئەو تەلگرافانەی کە بۆ عوسبەت ئەلئومەم و دەوڵەتە گەورەکان ئەنوسران و ئەنێرران نەیان ئەهێشت بنێرێ لەبەر ئەوە صوریتان ئەنارد بۆ ئێمەو من

ئەمکرد بە تورکی وەکو کاغەزی ئعتیادی بەپۆستەدا ئەمنارد بۆ بەیروت لەوێوە کوردەکانی ئەوێ بە فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی بڵاویان ئەکردەوە بەعالەمدا و صورتیان ئەدا بە عصبە الامم هەر لەو وەختانەدا لە بابەت تەئریخ و حاڵەتی ئیجتماعی و ئیقتسادی و مەعارفی کوردستانی عێراقەوە کتێبی بچوکم نوسیەوە بە تورکی و ناردم بۆ سورەیا بەدرخان لە پاریس لەوێ گوریە سەر فەرەنسی و بڵاویکردەوە.

لە (١٩٣٧)دا کە ئینقلابەکەی بەکر سدقی بوو لەگەڵ هاورێکانما دیسان زۆر هەوڵ و تەقەلاماندا کەلەم هەلەدا حقوقمان بسەپێنین و گەلێ بەیاننامەو نوسینمان بڵاوکردەوە بە ناو دیهات و ئەو عەشائرانەی لەگەڵمانا ئیشیانکردبوو. دیسان حکومەت بەم ئیشانەی زانی لە زەمانی متەسەرفێتی مەجید یعقوبیدا گوریانم بۆ کەربەلا و حلەو دوایی بۆ بەغدا لە ١٩٤١دا کە هەراکەی رەشید عالی روویدا دیسان کەوتینەوە هەوڵدان کە لەم هەلەدا حەقمان بسێنین و لەگەڵ ئەمین رەواندزی و سەید حەسەن و رفیقەکانی ترا قەراردرا کە بە بیانوی پاراستنیەوە دەست بەسەر فەیسڵی دووەمدا بگرین کە لەو وەختەدا لە شەقلاوەبوو کە ئەو بکرێ بە بارمتە بۆ داواکردنی حقوقمان بەڵام رێکنەکەوت و لەوەدا هەندێ لە رەفیقەکان دڵنەرمیان کردو سەری نەگرت لە ١٩٤٨دا کە معاهەدەی پورتسموس کرا دیسان ویستمان بەو هۆیەوە شتێك بکەین کە حەقمان بسێنین کە ئەو هەستانە گەورەیە رویدلو معاهەدەکەش هەڵوەشایەوەو ئیشەکەی ئێمەش مایەوە.

ئیتر ئەوەی راستیبێ لە ١٩٥٠ بەدولوە بەهۆی ئەوەوە کە زروف گۆڕاو نەتەوەی تازە پێگەیشتوو کەوتنە ناوەوە من کەوتمە کونجی پیرانەوەو بۆئەوەی ئەم نەونەمامە خوێن گەرمانە خزمەتی وڵاتەکە لە ئێمەی کۆن و پیرەکان زیاترو باشتربکەن خۆم لە سیاسەت دوور خستۆتەوە."

## ڕوونکردنەوەی هەندێ خاڵ

کوردی هەرچەند لەبەرگی کتێبەکەی چاپکراوە لەلایەن کوردی و مەریوانییەوە نووسراوە (گۆرانی)، بەڵام زۆری (نەشید)ن. نەشید ئەوەیە کە زیاتر لە قوتابخانەکانا قوتابی دەیڵێن، بەڵام گۆرانی فراوانترە لە نەشید لەسەر هەر نەشیدێکیش (وەزن)ەکەی نووسراوە وەك: (برگیز لی سس- تورکی) (وەزنی- گۆرانی فارسی) (اننەم بنی- تورکی) (وزنی - مارشی سواری تایبەتی)...هتد.

- ناوی مانگە کوردیەکان کە لێرەدا هاتوون زیاتر لەگەڵ کەشی مانگەکەدا ئەگونجێ واتا (واقیعی) ترە لەو ناوانەی ئێستا بڵاودەکرێنەوە. جابۆ ئەوەی واقیعەتی ناوەکان زیاتر ڕوونبکەمەوە دەڵێم مانگی کانونی ئەوەل بە (شیف بڕ) هاتووە. شیف کێڵانی زەویە لەو مانگەدا بۆ ئامادەکردنی بۆ چاندن. کانونی دووەم (تۆوبڕ). واتا لەو مانگەدا بەدواوە تۆو (گەنم وجۆ) ناوەشێنرێ. ڕەشەمێ یەکگرتنی پشیلەی نێرومێیە و دوای ئەوە زاوزێیان دەست پێ دەکات. ئەمەش شتێکی سەیرنیە. چونکە مانگی (شەوال)ی عەرەبیش لە (بەتەڵەب)بوونی حوشترەوە هاتووە.

- ڕۆژنامەی پێشکەوتن (١١٨) دانەی لێ دەرچوو، یەکەم ژمارەی ڕۆژی (٢٩ ئەبریل- نیسانی ١٩٢٠)و دوا ژمارەی (١١٨ هەمی ڕۆژی ٢٧ جولای- تەموزی ١٩٢٢) دەرچوو. ڕۆژنامەیەکی حەفتانە بوو، نووسەری ئەم باسە هەموو ژمارەکانی هەیە. هەروەها ژمارەکانی (بانگ کردستان)یشی هەیەو لەکاتی خۆیا خوالێخۆشبوو (کوردی) کە لەم نووسینەدا لێی دەدوێین پێی بەخشیوەو جارێکی تر لە سلێمانی بەهۆی برادەران ڕەفیق صالح و صدیق صالحەوە سەرلەنوێ لەچاپ درانەوە.

- مەحمود بەگی ئەوڕەحمانە فەنی و ئەحمد بەگی برای: هەڵەبجەیین. مەحمود بەگ باشکاتبی (مەحکەمەی هەڵەبجە)بوو، ئەحمەد بەگی برای هەر زوو چووە دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن، لام وایە لە نەمسا گیرسایەوەو لەوێ مایەوەو نەهاتەوە.

برایەکی کەیان سالّح لەگەلّ نووسەری ئەم باسەدا هاوپۆل بوو، هەموو ساڵێك بە یەکەم دەردەچوو، لەدواییدا بوو بە ئەندازیار.

- عەبدولواحید مەجید (ع. و. نوری یاخود عەبدولواحد نوری)یە لەڕاستیدا باوکی عبدولواحد مەجیدە، بەلاّم هەر زوو وەفاتی کردووە (نوری عەلی ئەجزاچی) کە خاڵی عەبدولواحد بوو، ئەو بەخێوی کردو پێیگەیاند، بۆیە عەبدولواحید ئەوی کرد بە باوکی خۆی و دەینووسی عەبدولواحد نوری.

- شاعیری میللی عەبدولخالق (ئەسیری). ئەوسا (میللیەت) واتای (وەتەنیەت)ی ئەمڕۆی دەبەخشی. (ئەسیری)یش پێویست بە ناساندن ناکات، چونکە ئەوو مەلا عەبدوللاّی زێوەرو مەلا حەسەنی قازی هەرچەند مەلا بوون، بەلاّم زۆریەی شیعرەکانیان نیشتمانین، پڕن لە دڵسۆزی و کوردایەتی.

- لاوانی کورد لە بەغدا: کوردی ڕوونیکردۆتەوە. وا دوو وێنەی گشتی ئەو لاوانەم پێشکەشکرد کە بلاّویکردینەوەو ئەو وێنانەشم هەر لە (کوردی) وەرگرتووە.

- مەکتەبی زانستی زۆری لەسەر نووسراوە لە هەموویان تێروتەسەلتر نووسینەکەی غەفوری میرزا کەریمە (کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی) چاپخانەی (دار الجاحظ) ساڵی (١٩٨٥).

- کۆمەڵەی زەردەشت: ناوی ئەم کۆمەڵەیە لە (الجمعیات و المنظمات و الاحزاب الکردیة)دا نەهاتووە. لەکاتی خۆیدا هەر نووسەری ئەم باسە بەناوی (ئارام)ەوە لە گۆڤاری (بەیان. ژمارە ١٩ ساڵی ١٩٧٤)دا شتێکی لە بابەت ئەم کۆمەڵەوە بلاّوکردەوە کە هەر لە (کوردی) وەرگرتبوو. تەمەنی کۆمەڵە لە بەینی (١٩٢٦ – ١٩٢٩)و یەکێك لە ئەندامەکانی (مامم) (شەوکەت عەزمی بابان)بوو کە ئەویش کاتی خۆی هەر ئەو شتانەی بۆ گێڕاومەتەوە کە (کوردی) باسیان دەکات.

- (مختاریت ئدارە) بەواتای (خود مختاری) دێت کە (حوکمی زاتیە)

مەریوانی: ناوی طاهر بەهجەت کوڕی مەلا مەحمود صدیقی زادەیە. لە بنەچەدا خەڵکی مەریوان بوو. لە سلێمانی لەساڵی (١٩٠٥) لەدایك بووەو ساڵی (١٩٧١) لە ئەمریکا وەفاتی کردووە. لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی ڕابردوودا لەگەڵ مستەفا سائیب دەستیان کرد بە چاپکردنی کتێبی کوردی. نزیکەی سیانزە کتێبیان چاپ کرد وەك دیوانی شیعری سالم و کوردی و نالی .

لە سەرەتاوە برینپێچ بوو، بەلاّم مرۆیەکی زیرەك ولێهاتوو بوو، لەدواییدا چوو بۆ ئەمریکا بۆ خوێندن، بڕوانامەی دکتۆرای هێناو هەر لەوێش مایەوە تا کۆچی دوایی کرد.

# فەلسەفەی جەمال عیرفان (حقائق)

سێ دانە لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)دا کە لەکاتی خۆیا (لە بیستەکانی سەدەی ڕابردووەوە تا ١٩٢٢) لە سلێمانی دەردەچوو. ئەم نووسینانەی خوالێخۆشبوو جەمال عیرفانم دی لەژێر ناوی (حقائق)دا، چونکە بە سوودن حەزم کرد خوێنەری خۆمان لێی بێبەش نەبن. خوالێخۆشبوو جەمال عیرفان لە بنەماڵەی (عیرفان)ە لە سلێمانی.

مەلا عەبدوڵڵای عیرفان باوکی جەمال عیرفان مامۆستایەکی گەورەو مەلایەکی خوێندەواری ئەوتۆ بووە کە نەك لە سلێمانیا، بەڵکو لە هەموو وڵاتا ناوبانگی دەرکردبوو. بۆ نموونە لە قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری کە لە سەردەمی عوسمانیا لە سلێمانی کرایەوە، مامۆستایان وەك (عیرفانە فەنی و زێوەرە فەنی و مەلا سەعیدی کابان) هەریەکە مامۆستای (مادەیەك یاخود دەرس) ێك بوون، بەڵام عیرفانە فەنی (برنجی معلم- مامۆستا یەکەم) بووە.

جەمال عیرفان وەختی خۆی چۆتە تورکیا(ئەستەمبوڵ)، لەوێ خوێندنی تەواو کردووە ئنجا هاتۆتەوە سلێمانی، چونکە ئەو سەردەمە (ئەستانە- ئەستەمبوڵ) سەرچاوەی ڕۆشنبیری و زانیاری هەموو وڵاتەکان بووەو خوێندەواری سلێمانی تەنها ڕوویان لەوێ کردووە. واتا ئەو بیرە ڕۆشنەو ئەو خوێندەوارییەی لەوێ وەرگرتووە، یا بە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی لەوێوە هاتوون و لەم لاشەوە کتێبی فارسی کە لە ئێرانەوە دەهات، ئەگینا دەزگای ڕۆشنبیری تر (وەك ئەمڕۆ) نەبووە. لەگەڵ ئەوەشا ئەو پیاوە گەیشتە پلەی بە فەلسەفە ئاشنا بوون و ئەو قسانەی ئەو دەیکردن هەموو فەلسەفە بوون بە جۆرێك لەکاتی دەرچوونی گۆڤاری (گەلاوێژ)دا مامۆستا (نوری مەجید سلیم) قسەکانی ئەو پیاوەی بەسەر ناوی (فەلسەفەی جەمال عیرفان) بڵاودەکردەوە.

ئەو ڕۆژگارەی ئەم پیاوەی تیا دەژیا لە سلێمانیدا ساڵی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو بوو سەردەمی ئینگلیزەکان و دوای ئەوان سەردەمی حوکمی شێخ مەحمود بوو.

ئەم قسانەی ئەم پیاوە دەیکردن لای هەندێ کەس بە قسەی (قۆڕ)و لای تاقمی سێیەم هەر بە (کفری موتڵەق) دادەنراو خاوەنەکەی بە (منەوەرێکی فەرمەسۆن) دەدرایە قەڵەم و ڕەنگ هەیەو دوورنیە لەسەرئەوە (فەتوای حەڵاڵی کوشتنی)ی دەرچوو بێت. ئەوەتا ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) (ژمارە ٥ ی ساڵی ١ ی چوارشەممە ٣٠ رەبیع ئاخر ١٣٤١-٢٠ کانون ئەول ١٣٣٨- واتا ساڵی ١٩٢٢) لە (ئیفتتاحیە)ی یەکەم پەڕەدا لەناو چوارچێوەیەکی ڕەشدا ئەم هەواڵەی بڵاوکردۆتەوە:

(زیاعێکی گەورە)

(لە ئەزکیاو منورانی وەتەن عیرفان زادە جەمال بەگ. شەوی چوارشەممەی ڕابردوو (١٢-١٣ ی کانون ئەول ٣٣٨) لە تەرەف ئەشخاس مەجهولەوە دەستڕێژێکی لێکرا. دوو گوللە ئەسابتی کرد. پاش سێ سەعات وەفاتی کرد. لە حەقیقەتا زیاعی ئەم زاتە بۆ کوردستان موجەب تەئەسور بوو. بەناوی ئەشراف و عموم ئەهالی مەملکەتەوە لە عائلەی محترمەیان بەیان تەعزیەو تەمەنای تەسلیت ئەکەین) ڕۆژی کوردستان.

ئنجا فەرموون بۆ گەشت بە باخچەی (حقائق)دا:

١ـ سەدەقە بە سواڵکەری کوێر بکە، چونکە چاوی لێت نیە. سپڵەییت لەگەڵ ناکا. ئەگەر بتبینێ (معاز الله).

٢ـ عەقڵی دوێنێ کە ڕووی هەڵهێناوە. هینی سبحەینێ (فتیرەت). بۆ ئینسانی ئەمڕۆ فکری ئەمڕۆ لازمە.

٣ـ سەگ لغاوی بکەیت، خۆی بە ئەسپ دەزانێ، دەحیلێنێ.

٤ـ شەڕ بە دەست دەکرێ، فەقەت جیدالی حەیات بەسەر.

٥ـ پیاوی عاقڵ لە مقامی بەرزدا گەورە دیارە. فەقەت لە پەستیدا گەورەتر دیارە.

٦ـ کتێب و ژن بە بەرگیانا دیاری نادەن. هەتا تێنەگەیت.

٧ـ هەموو شتێک دەبێ لە جێگای خۆی بێت. لە مزگەوت بە سەفیە و لە مەیخانە بە فقیە بڕوا مەکە.

٨ـ لە قاوەخانەو لە جەماعەت گۆشەو کەنار بگرە، چونکە هیچ نەبێ لایەکت ڕەحەتە.

٩ـ عەشق میوانێکی بێ مەعنایە بێ پرس دێت و بێ سەبب دەڕوا.

١٠ـ دەرگای بێ ئەخلاقی گرێژەنەی شلە، هەر ئەختێك بیکەیتەوە دێتە سەرپشت.

١١ـ بەعزێ کەس (ریا)و (حەیا) فەرق ناکەن، والەزانێ بێ ڕیایی بێ حەیاییە.

١٢ـ منداڵ بە بچکۆلەیی سەر ئێشەیە، بە گەورەیی دڵئێشەیە.

١٣ـ فیراق و جوێبوونەوە نیو مسراعی شیعری خۆشەویستییە.

١٤ـ دڵ سەعاتێکی درۆزنە جار جار ڕۆژی بەقەد مانگێك درێژ بەعزە مانگی بە قەد ڕۆژێك کورت دەنوێنێ.

١٥ـ سەر وەت و دەوڵەت قەرزاری درۆو بێ ئینسافی دەوڵەمەندییە. سەبەبی فەقیری هەزار کەسە.

١٦ـ هەتا عەردی درۆ هەڵنەکەنی ئەمامی ڕاستی مەنێژە، چونکە بەر نادلو ناش ڕوێ.

١٧ـ لە چاکی هەر پیاوی چاك لێ دەکات. لە خراپی هەموو کەسێك.

١٨ـ دەڵێن ئەگەر کەلەشێر شەوو ڕۆژ بخوێنێ ڕۆژ قەت نابێتەوە. مەگەر لە مەکتەبی کچان نەبێ.

١٩- چاو بۆ بەعزێ سەر پەنجەرەیەو بۆ بەعزێ سەر ئاوێنەیە، بۆ بەعزێکیش (دووربینە).

٢٠- پارەپەیداکەر وەکو کێچ و ئەسپێ وایە، خوێنی خەڵقی تر دەمژێ، خسوسەن کێچ خوێنی جنسی خۆی نامژێت.

٢١- زەرب ئەلمەسەلە کە دەڵێن (من سەبەتە نەبەتە) بە عەرەبیەکەی (من ثبت نبت) یەعنی ئەوی سابیتە نابیتە، بەشەرتێك عەردەکە پڕ لە پەینبێ (ڕۆژنامەی پێشکەوتن ژمارە ٩٤ ی ڕۆژی ٩ ی فێبروەری ١٩٢٢)

٢٢- ئەوی بە بەهایەکی زۆر بیکڕی، هەموو وەختێ قیمەتدار نییە، بەها جوێیەو قیمەتیش جوێیە نانێکی بێ بەها لە نەفس ئەلئەمردا قیمەتدارە، ئەڵماسێکی بێ قیمەت بەهادارە.

٢٣- حوقەبازو ساختەچی دووشتیان لازمە، لە خۆیدا حیلەو مەهارەت و لە تەماشاکەرانیشدا بلاهەت و حەماقەت.

٢٤- کۆکەو کۆکەڕەشە حەماو حەمای ئەسفەر، هەر ڕەنگێکی ڕەش و زەردیان فەرق هەیە.

٢٥- ئەگەر بەرزو قایم قسە بکەیت زەرەری نیە، بەشەرتێ فکری قسەکە بە قەدەر بەرزیەکە قووڵ بێت.

٢٦- مامۆستای نوێنێ دەرسی ئیمرۆیە، جەبرو معادلەش سبحەینێ.

٢٧- هەموو کەس دەیەوێ لەدنیادا هەڵبگیرسێت فەقەت دەبێ لە تەملکەی گڕگرتن بترسێ.

٢٨- لە دنیا ئینسان جێگەی لە نوقتەو ناوەڕاستی ئەو خەتەدایە کە سەرێکی بەدەست دوژمنانی و سەرێکیشی بەدەست دۆستانیەوەیە.

٢٩- جلی جوان جارجار بۆ باڵانشینی جەسارەت دەبەخشێ، فەقەت وەکو کەوڵەکەی مەلای مەزیورە موەقەتییە.

٣٠ـ خۆت هەرزمانت حەفز بکە، حەفزی ئەعزاکانی ترت عائد بەخوا.

٣١ـ ئەگەر زەرافەت و گاڵتەچێشتبێ خۆی و بەهاراتەکەشی تەربیەیە.

٣٢ـ بەهیچ وەعدێك بڕوا نەکەیت چاکترە لەوەی کە بە هەموو وەعدێك بڕوا بکەیت.

٣٣ـ پیاوی ڕووخۆش سپی و ڕووناکە پیاوی عەبوس ڕەش و تاریکە.

٣٤ـ هەموو شتێك مەربوتی قەدەرە بعزا بۆ ئاڵتون بگەڕێیت ئاسن و بۆ ئاسن بگەڕێیت ئاڵتونت تووش دێ.

٣٥ـ لە هەموو بارانێك بەنەفع تر عارەق و بارانی ناوچاوانە.

٣٦ـ عەزەمەتی درۆ وەکو لاستیك وایە، شلی بگری زوو دێتەوە یەك.

٣٧ـ بەسەر ژندا بەعزێ کەسی تەملك عاقڵانەو بەعزێکیشی بە تەحەکم جاهلانە فەخر دەکات.

٣٨ـ عەقڵ هەیە وەکو ئاو بەبێ دەنگ نفوز دەکاتە ئیشەوە، عەقڵیش هەیە وەکو بەرداش بەکرەکرِ ئیش دەهارێتەوە دەیکا بە بروێش.

٣٩ـ ڕژانی خەفەت بەسەر عەشقدا وەك ڕژانی خەڵوز بەسەر ئاگردا وایە. لەپێشدا دایدەپۆشێ لەپاشدا خەڵوزەکەش دەبێ بە ئاگرو هەموویشی دەبێ بەخۆڵ (پێشکەوتن ژمارە –٩٦– ڕۆژ ٢٣ فەبریوەری ١٩٢٢)

٤٠ـ ئاسن موقەدەسە ئەگەر ببێ بە گاسن مەلعونە ئەگەر ببێ بە زنجیر.

٤١ـ فرمێسك ئاوی چاوە. عارەقیش فرمێسکی ناوچاوانە.

٤٢ـ گۆڕینی حس چەند سووك بێ گۆڕینی فکر ئەوەندە گرانە.

٤٣ـ ئەشرف ساعت بۆ ئیشی باش، ئەول ساعت بۆ ئیشی خراپ ساعتی ئەلنهایت.

٤٤ـ پیاو پێبکەنێ ئەختێ لە ژن، ژنیش پێبکەنێ کەمی لە پیاو دەچێ.

٤٥ـ بەعقڵی من حیات قومارە. بعزا چاکیشی قوماربزانی هەموو وەختێ دوشـەش ناهاوێ و دووخانە ناگرێ.

٤٦ـ ئەگەر خۆت زۆر خۆش بوێ خۆت کەم خۆشەویست دەکەی.

٤٧ـ فەقەت ئەو خۆشەویستیەی بە ئاڵتون دەستنەکەوێ زوو دەبێ بە تەوقی ئاسن.

٤٨ـ عاشقێتی وەکو چوونە سەر شاخ وایە چونکە کرێ و زەحمەتی نەبوایە نزارەت و هەواکەی خۆش ئەبوو.

٤٩ـ بعزا درۆم خۆشدەوێ چونکە ئعتباری ڕاستی زیاددەکات.

٥٠ـ شیعر مثلەقە قافیەی بویستایە دەبوو لە دنیادا ئەشعار هەر بە قەد قوافی ببێژرایە.

٥١ـ ئەگەر باوەڕ بە ئاخیرەت نەکرایە، عیلم هەموو دەبوو بە حەفز ئەلسحەو عالەمیش هەموو بە حەکیم.

٥٢ـ ئەوی بێ ڕیا نوێژ بکات لە ئەلتحیاتدا ئەژنۆی قەت هیلاك نابێ

٥٣ـ حیات تابورێك و قوعاتە، قوماندانەکە ناوی تسادفە، لە دنیادا پیاوێکی بۆلشەویك و سۆسیالیستی بە قوەتیش دەناسم و ڕەفیقمە، ئەویش ناوی(ئەجەل)ە
(پێشکەوتن ژمارە– ٩٨ ی ڕۆژی ٩ ی مارتی ١٩٢٢)

# خەوبینین و خەوەکەی لالە سەرحەد

## بەشی یەکەم

خەوبینین تائێستا نهێنییەکە لای زانایانی نەفسی و کۆمەڵایەتی روون نەبۆتەوە. زانایانی وەك (فرۆید)و (ئسیرنسکی) زۆر خۆیان بەم (لغز)ەوە خەریك کردووە، بەڵام نەگەیشتوونەتە ئەنجامێکی ئەوتۆ دڵی پێخۆش بکرێت. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ زۆرپێشووتر واتا بۆ سەردەمی (سوقرات و ئەفلاتون و دیمۆکرتیس و ئابوقرات و ئەرستۆ) لە زانایان و فەیلەسوفەکانی ئەوسای یۆنان دەبینین ئەوانیش گەلێك خۆیان بەم کارەوە خەریك کردووەو هەریەکە بەجۆرێك (وەسف)ی خەوبینینی کردووە. لەو بەینەشدا زانایانی ئیسلام وەك (ڕازی)و (زمخشری)و (فارابی)و (ئیمامی غەزالی)و (ئەبو حەیانی تەوحیدی)و (ئیبن سینا)و (ئیبن رشد)و (ئیبن خلدون)و زۆری تر، هەموو لەم بوارەیان کەم و زۆر داوەو لێیان کۆڵیوەتەوە. هەندێك لە زانایانی ئیسلام کتێبیان لە سەرداناوە وەك(عەبدولغەنی نابلسی) لە کتێبەکەیدا (تعطیر الانام في تعبیر المنام)و (محەمەد سیرین یاخود ئیبن سیرین) لە کتێبەکەیدا (منتخب الکلام فی تفسیر الاحلام)و (ئیبن شاهین) لە کتێبەکەیدا (الاشارات فی علم العبارات) کە ئەمانە هەموو لەو کتێبانەیاندا خەویان لێکداوەتەوەو تەفسیریان کردووە (فرۆید)یش هەندێك کتێبی لەسەر لێکدانەوەی خەوو زانیاری خەو داناوە.

لەکاتی خۆیدا سوقرات خەوبینینی (بە شتێکی پیرۆزو کارامەیی دەرك بەشتکردن داناوە) ئەفلاتونیش دەڵێت: "بریتییە لە (وەحی) کە بۆگیان دێتەخوارەوە." دیمۆکریتس وتویە: "خەوبینین بریتییە لە چالاکی و کارامەیی مۆخ لەکاتی ئاوابوونی درك پێکردنی هەستدا". ئەبوقرات و ئەرستۆ دەڵێن: "خەوبینین لە ئەنجامی چالاکی

مۆخەوە سەر هەڵ دەدات" زانایانی ئیسلام لێکدانەوەی خەویان زیاتر بەستوە بە ئایین و بەتایبەتی بە قورئانەوە، واتا خەوبینینیان بردۆتەوە سەر سێ سەرچاوە: یەکەمیان لە یەزدانی پاکەوەیە کە ئەمەش باشەکەیانە. دووەم لە شەیتانەوەیە کە ئەمەیان پووچە. سێ هەمیشیان وڕێنەیە واتا لە نەفسەوەیە. بەڵام لێکدانەوەی زانایانی نوێ وەک زانایانی کۆن خەوبینین ئەبەنەوە سەر (سێ و دووی دەروون واتا نەفس).

فرۆید کە پزیشکێکی نەمساوی بوو لە دەستپێکردنی ئەم سەدەیەدا تیۆرییەکی بۆ خەوبینین دانا کەوا (تاودانەوەی ئەو خواست و هەستەیە کە تێرنەبوون و لە ناخدا خۆیان مەڵاس داوەو پەیوەندی بە سیکسیشەوە هەیە)(١)

## سەرچاوەکانی پەیدابوونی خەوبینین

ئەوەندەی زانایان بۆیان ڕوون بۆتەوە، بەزۆری سێ شت هەن کە زیاتر دەبنە هۆی خەوبینین کە بەکورتی ئەمانەن:

یەکەم: ئەو شتانەی هەست دەبزوێنن و سەرنج ڕادەکێشن و مرۆ هۆشیار دەکەنەوە لەو دنیایەدا کە دەوریداوە وەک ئەوەی مێشوولەیەک سنگی نووستویەک بگەزێ لە خەویا وادەزانێ چەقۆ دەکەن بەسنگیدا لە خەوبینیندا، یاخود نزیک ئاگردان یا زۆپا نووستوەو تینی گەرماکەی بۆ دێت لە خەویا وادەزانێ ئاگریان تێبەرداوە.

دووەم: ئەو کارانەی بەهۆی هەندێک ئەندامەکانی لەشی مرۆوە کار دەکەنە سەر مرۆی نووستوو: وەک پڕبوونی میزەڵدان لە میز، یاخود پڕبوونی گەدە لە خواردن، یاخود نارەحەتی جەستە لە نووستندا.. ئەمانە دەبنە هۆی خەوبینینی ناخۆش، مرۆ وا هەست دەکات کە خەریکە بخنکێت، یاخود لە ئاوا نقوم بێت، یاخود دەنگی دەرنایەت چەند هاوار بکات، یاخود درندە پەلاماری دەداو ناتوانێ ڕاکات.

سێهەم: ئەو شتانەی کە بەخەبەرین بە چاو دەیان بینین و هەستیان پێدەکەین و هەموو لە مێشکماندا کۆدەبنەوەو دەبن بە بیرەوەری، لەکاتی نووستن، یاخود خەوبینیندا سەر بەجۆرێکی تر هەڵدەدەنەوە(٢). زۆرکەس خەو بە کاروکردەی ڕۆژانەیەوە دەبینێ بەتایبەتی ئەوانەی کە زیاتر کاری لێدەکەن جاهەر ئەوشەوە کە دەنوێت، یاخود لە دوای بەینێك سەرهەڵدەدات بەشێوەیەکی ڕوون، یاخود ئاڵۆز گەلێك شتی تری تێکەڵاو دەبێت. منداڵ خەو بە بووکەشووشەوەو قوتابی بە تاقیکردنەوە (ئیمتیحان)و برسی بە خواردنەوەو ئاوارە بە نیشتمانەوەو بەندو حەپس بە ئازادبوونەوە دەبینن.

## خەوبینین لە قورئاندا

لە قورئانی پیرۆزدا باسی خەوەکانی حەزرەتی ئیبراهیم و یوسف و محەمەد پێغەمبەری تێدایە. حەزرەتی ئیبراهیم لەناو کۆمەڵێکی بتپەرستدا سەری هەڵدا، کە دەستیکرد بە ئامۆژگاری میللەتەکەی و بەریەرەکانیان دژی بتپەرستن، خێرا گرتیان و ئاگرێکیان بۆ کردەوەو فڕێیاندایە ناوی، بەڵام خوای گەورە ڕزگاری کرد (یانار کونی بردا وسلاما علی ابراهیم). لە تاوانا ئیبراهیم فەلەستینی بەجێهێشت و چوو بۆ میسر لەوێ (هاجر)ی هێنا کە ئیسماعیلی لێبوو لەوێشەوە هەستا خۆی و کوڕەکەی و ژنەکەی چوون بۆ (مەکە) لەوێ (کەعبە)ی دروستکرد دوای ئەوەی خەونێکی بینی کەوا کوڕە خۆشەویستەکەی دەکات بەقوربانی و لەڕێی خودادا سەری دەبڕێت (فبشرناه بغلام حليم فلما بلغ معه السعي قال يابني اني ارى في المنام اني اذبحك فانظر ماذا ترى؟ قال يا أبت افعل ماتؤمر ستجدني ان شاء الله من الصابرين. .......... و ناديناه ان يا ابراهيم قد صدقت الرؤيا انا كذلك نجزي المحسنين.. ان هذا لهو البلاء المبين وفديناه بذبح عظيم. و تركنا عليه في الاخرين سلام على ابراهيم كذلك نجزي المحسنين انه من عبادنا المؤمنين.. وبشرناه باسحق نبيا من الصالحين...) کە ئەمەی بە کوڕەکەی وت ئەویش قایل بوو، چونکە فەرمانی یەزدان

ئەوەبوو خەریکی سەربڕینی بوو واتا.. چەقۆکە بهێنێ بە ملیا، خوای گەورە بەرانێکی بۆ ڕەخساند کە لەجیاتی ئیسماعیل سەری ببڕێت و بیکات بە قوربانی. دوای ئەوە خوای گەورە ئیسحاقیشی پێ بەخشی کە بوویە پێغەمبەرێکی ڕاست و پاك و خۆشەویست..

دیسانەوە خەوەکەی لە قورئانی پیرۆزدا خەوبینینەکەی حەزرەتی یوسف کوڕی یەعقوبە.. (اذ قال يوسف لأبيه يا ابت انی رأيت احدعشر كوكبا و الشمس و القمر رأيتهم لی ساجدين قال يا بنی لاتقصص رؤياك علی اخوتك فيكيدوا لك كيدا ان الشيطان للانسان عدومبين... و كذلك يجتبيك ربك و يعلمك من تاويل الاحاديث ويتم نعمته عليك و علی ال يعقوب كما أتمها علی ابويك من قبل ابراهيم و اسحاق ان ربك حكيم عليم..).

یوسف بە منداڵی خەوی بینیوە کەوا یانزە ئەستێرە (کە بریتین لە یانزە براکانی) لەگەڵ ڕۆژو مانگیشدا (کە باوك و دایکین) سوجدەیان بۆ بردووە ئەم خەوەی(٣) بۆ باوکی گێڕاوەتەوە، ئەویش هەست دەکات کەوا کوڕەکەی لەم دنیاو لەودنیاش بە پایەیەکی بەرزدەگات و براکانی و دایك و باوکی هەموو سەری بۆ دادەنەوێنن بۆیە پێی دەڵێت قسە نەکات و لای براکانی نەی درکێنێ بۆئەوەی تووشی زیانێکی نەکەن و بەخیلی پێ نەبەن.

بەڵام لە ڕاستیدا لەبەرئەوەی یوسف کوڕێکی ژیرو ئێسکسووك و منداڵیش بوو باوکی لەوانی تری خۆشتر دەویست و ڕووی زیاتر دەدایە. ئەوانیش بەمە ڕقیان هەڵدەستا، تا ڕۆژێك بردیانە دەرەوەی شارو فڕێیاندایە بیرێکەوەو بە باوکیان وت کەوا گورگ خواردوویەتی. کراسەکەیان بە خوێنی بەرخێك ئاڵکردو دایان بە باوکیان بۆئەوەی بڕوایان پێ بکات، بەڵام باوکیان ئومێدی هەرنەبڕی خواو ڕاستان کاروانێك لە خەڵکی شام بەلای بیرەکەدا تێدەپەڕن یوسف دەردێنن و لەگەڵ خۆیان دەیبەن بۆ میسر لەوێ دەیفرۆشن بە (عەزیزی میسر واتا وەزیری میسر) عەزیز لەبەر ڕاستی

و ژیری یوسفی زۆر دەچێت بەدڵا، بەجۆرێك لە ئەنجامدا هەموو کاروبارێکی ماڵەکەی دەداتە دەست، لەولاشەوە ژنی عەزیز لەبەرجوانی و قۆزی بەتیری عەشقی یوسف گرفتار دەبێت یوسفیش ئاوڕی لێ ناداتەوە لەسەرئەوە ژنە قسەیەکی بۆ هەڵدەبەستێ، لەئەنجامدا یوسف فرێ دەدەنە بەندیخانەیەکەوە کە دوو کەسی تری تیا حەپس کراوە یەکێکیان مەیگێڕی فیرعەونەو ئەوی تر نانەواکەی بووە. ئەم دوانە لە بەندیخانەدا هەریەکە خەوێك دەبینن کە بۆ یوسفی دەگێڕنەوەو ئەویش بۆیان لێك دەداتەوە هەردوو لێك دانەوەکە بەڕاست دەردەچێت (و دخل معه في السجن فتيان قال: احدهما اني اراني اعصر خمرا، وقال: الاخر انى اراني احمل فوق راسي خبزا تأكل الطير منه، نبئنا بتأويله انا نراك من المحسنين..) یەکێکیان بەردەبێت دەبێتەوە بە مەیگێڕی فیرعەون، ئەوی تریان هەڵدەواسرێ باڵندە بەدەنوك مێشکی دەخۆن. بەینێکی پێدەچێت فیرعەون، یاخود مەلیك خەوێکی ناخۆش دەبینێت (... وقال الملك اني ارى سبع بقرات سمان يأكلهن سبع عجاف، وسبع سنبلات خضر واخر يابسات، يا ايها الملأ افتوني فى رؤيايى. قالوا اضغاث احلام و مانحن بتأويل الاحلام بعالمين). مەیگێڕە کە یوسفی بیردەکەوێتەوە گورج مەلیك ئاگادار دەکات، دوای ئەوەی کە کەسی تر خەوەکەی بۆ لێك نادرێتەوە یوسف دەهێننە دەرەوە لە بەندیخانەو خەوەکەی فیرعەون، بەمجۆرە لێکدەداتەوە: کەوا حەوت ساڵی ئایندە هەمووی ساڵی هات و وەرزی حاسڵاتە، حەوت ساڵەکەی دوای ئەوە قاتوقڕو گرانی دەبێت، لەبەرئەوە پێویستە لەبەروبووم و بەرهەمی حەوت ساڵی یەکەم مشوری گرانی و نەبوونی حەوت ساڵی دووهەم بخورێت و دەغلودان هەڵبگیرێت. فیرعەون کە ئەمە دەبیێ و دەبینێ یوسفی زۆر دەچێت بە دڵاو یەکسەر دەیکات بە عەزیز، واتا وەزیری میسرو هەموو دەسەڵاتێکی پێدەبەخشێ... خەوەکەش دێتەدی وڵاتی شام و ئەوانی تر تووشی گرانی دێن، هیچ نامێنێ بیخۆن، خەڵکەکە باردەکەن باوك و باوەژنەکەی یوسف و براکانی هەموو ڕوودەکەنە میسر لای یوسف کە لەسەر ئەریتی

ئەو سەردەمە هەموو كرنوش واتا سوجدەی بۆ دەبەن، ئنجا یوسف لەخوا دەپارێتەوەو دەفەرموێ:" رب قد اتیتنی من الملك، و علمتني من تأویل الاحادیث، فاطر السموات و الارض، انت ولي في الدنیا و الاخرة، توفني مسلما و الحقني بالصالحین".

خەوی پێغەمبەری خۆشمان محەمەد. د بەبۆنەی شەڕە گەورەکەی (بدر)و (داگیرکردنی مەکە)ەوە بوو، غەزای بدر دوای پانزە ساڵ لە چەوساندنەوەی ئیسلامەکان ڕوویدا، واتا دوای دان بەخۆدا گرتن و گوێنەدان بە چەوساندنەوە. دوای ئەوە کۆچکردن لە ڕێی خوادا و بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام. ئەوەبوو تەنها (٣٠٠) کەس لە موسڵمانەکان بەسەر (١٠٠٠) کەسدا لە کافرەکان سەرکەوتن ئەمەش خەوەکەی پێغەمبەر پاڵی پێوەنان بەرەو سەرکەوتن.. (اذ یریكم الله في منامك قلیلا... و تنازعتم في الأمر ولكن الله سلم انه علیم بذات الصدور. واذ یریكموهم اذ التقیتم في اعینكم قلیلا ویقللكم في أعینهم لیقض الله أمرا كان مفعولا).. هەروەها لە داگیرکردنی (مەکە)دا خەوەکەی پێغەمبەر. د زۆر کاریگەربوو لەوەدا کە ئیسلامەکان نەگەڕانەوە تەواویانکرد (انا فتحنا لك فتحا مبینا...) ئەمانە بوون خەوەکان کە قورئانی پیرۆز باسیان دەکات.

ئنجا پێش ئەوەی بێینە سەر خەوەکەی لالە سەرحەدی ڕۆغزایی با هەندێك لەو خەوانە بدوێین کە نووسەران یاخود وێژەوانان بەخەیاڵ و بیری خۆیان دروستی دەکەن زیاتریش لەبەرئەوە خەیاڵی تێکەڵاو دەکەن، چونکە ناوێرن بە ئاشکرا لەلایەن ڕاستییەکەی بدوێن لەبەر هەر هۆیەك بێت ئەم جۆرە شتانەش زیاتر لە نووسین و کتێب و هەڵبەستی نووسەرانی سەدەکانی ناوەڕاست. ئەو سەردەمە کاتێکی تاریك بوو تاوەکو ئایەتە ئاینییەکانیش بە چەوتی لێك دەدرانەوەو خەڵکیان لەوەدنیا تۆقاند بوو، بۆیە خەونبینین لەم بابەتە زۆر ڕێکدەخرا، یەکێك لەوانە خەوەکەی (دانتی)ی ئیتاڵیایە (١٢٦٥-١٣٢١) کە (کۆمیدیای خوایی) پێدەڵێن و

بریتیە لە کاروانێك حەوت ڕۆژدەخایەنێ و گەلێك خەوی سەیر سەیری تێدایەو هەمووی بە هەڵبەست واتا شیعر هۆنیوەتەوە.

## کۆمیدیای خوایی – دانتی

لە کۆمیدیاکەیدا دانتی (رمز)ی بەکارهێناوە وەك مامۆستایەك و وەك فەیلەسوفێك دەدوێ، تاکو کاریکاتە سەرخەڵکی. دانتی سەفەرێکی بۆ ئەوە دنیا کردووە، ئەوە دنیاشی کردووە بە سێ بەشەوە. جەهەننەم و ناوەڕاست (مطهر)و بەهەشت. لەم کاروانەیدا دانتی سێ کەسیشی لەگەڵدایە، یەکێکیان (فرجیلیۆس)ە کە هەستیارێکی لاتینی بەناوبانگ بوو. ئەم پیاوە لە سەفەرەکەدا سەرکردەیەو ڕەمزە بۆ (عەقل). دووەمیان بیاتریش ئەمیش (ڕەمزە بۆ عیلمی لاهوت). سێیەم قەشە برناردکە (ڕەمزە بۆ بیرکردنەوە). هەروەها ئەم دیوانی شیعرەی دانتی پەنجە ڕاکێشانێکە بۆ کاروانی مرۆو هەوڵدانی بۆ پاکبوونەوەو ڕزگاربوونی لە گوناهەکانی و پەشیمانبوونەوە تاکو دوای مردن دەگاتە خۆشی ڕاستەقینە لە جەهەنەمدا خەڵکێکی زۆردەبینین کە هەموو لە ئەنجامی کردەوەی ناپەسەندو گوناهیاندا تووشبوون و لە ئازارو چەوساندنەوەدان بێئەوەی هیچ ئومێدێکی ڕزگاربوونیان هەبێت، بەڵام لە ناوەڕاستدا مطهر بەو کەسانە دەگەیت کە خەریکی خۆپاککردنەوەن لە گوناهەکانیان و کەفارەتی دەدەن تاکو دوای ئەوە بچینە بەهەشتەوە. ئەم شوێنە شوێنی ئومێدە، چونکە تەمای ڕزگاربوونی تێدا هەیە، ئەو گیانانەی تێدان هێجگاری نین بەپێچەوانەی (جەهەننەمەوە) کە چەوساندنەوەکەی هەتاهەتایەو هیچ تروسکەی ئومێدێکی تێدا بەدی ناکرێ، هەروەها بەپێچەوانەی (بەهەشتەوە) کەدوای پلەی ئومێدو ڕزگاربوون خۆشی و بەختیارییە.

دانتی لێرەدا بۆیە زۆر گرنگی بە مطهر داوە، چونکە شوبهاندوویەتی بە ژیانی مرۆ لە سەرزەمین بۆ ئەوەی هەرکاتێك بیەوێ دەتوانێ واز لە گوناه و خراپە بهێنێ و

بەوە خۆی ڕزگار بکات، هەر لەبەر ئەمەشە کە دانتی خەوبینینی بەستووە بە مطهرەوە (نەك بە جەهەننەم و بەهەشتەوە)، چونکە لە هەردووکیاندا واتا لە خەوبینین و لە مطهردا (ئومێد) چاوەڕوان دەکرێت کە بێتەدی(٤).

هەندێك (ڕەمز) لە خەودا:

ئاگرقووتدان: ماڵی هەتیوخواردن.

ڕۆژ: مەلیك یاخود دایك و باوك.

باران: خێرو خۆشی.

تریگوشین: خزمەتی شا، یاخود مەلیك.

مانگای ڕەش مانگای قەڵەو: ساڵی هات و خۆشی.

مانگای لەڕ: ساڵی نەهات و قاتوقڕ.

حەوت مانگا: حەوت ساڵ.

دەستی درێژ: پارەی زۆرو بەخشیش.

شێر: ئفتار.

قاژوو: پیاوی فاسق.

مشك: ژنی خراپ (فاسقە).

سەیرکردن لە پەنجەرەوە: دوعاگیرابوون.

بینینی خواو وەزیر: تەمەنی درێژو ژیانی ئاسوودە.

بینینی کورتە بالاّ: تەمەن کورت.

دانیشتن لەژێر سێبەری دارا: ڕزگاربوونە لە ماندوبوون. حەسانەوەیە.

دانیشتن لە بەینی لق و پۆپی دارێکی بەرداردا: ڕزقی زۆر.

سەرکەوتن بۆ سەرچیا: بەرز سەرکەوتنە لە ئیشداو پایەی بڵند.

خواردنەوەی شەراب: قسەی خۆش و جوانکردن.

شیرخواردنەوە: چاکبوونەوەیە لە نەخۆشی و تەندروستی باشە.

دانیشتن لەژێر شەوقی مانگدا: لە گوناه خۆشبوونە.

کەوتنە بیرەوە یان کەوتنە چاڵەوە: چوونە بەندیخانەوە.

جلی سپی لەبەرکردن: ڕزگاربوون لە نەخۆشی خراپ.

جلی پیس و دڕاو لەبەرکردن: تووشبوون بە خراپە یان نەخۆشکەوتن.

سەربڕینی قاز: کوشتنی دوژمن.

جلسووتان: تووشی ناخۆشی بوون.

ڕۆیشتن بەرووتی: ئاوزڕاندن. لای میسریەکانی کۆن (فیرعەونەکان)

سەگت دواکەوێ: هاوڕێیەکی دڵسۆز یارمەتیت دەدا.

بەناو پەڵە گەنمێکی گوڵدارا بڕۆیت: خێرێکی زۆرت دەست گیردەبێ.

بەسەر زەوییەکی وشکدا بڕۆیت: تووشی زیان دەبیت.

ماسی بینین لە ئاوا: هەلهەڵکەوتنە بۆ دەستکەوت.

ماسی لەبەینی هەردوو دەستدا: خێرێکت لەلاوە بۆ دێت.

سیمرخ بینین: زۆرچاکە: چوونە بەهەشت و نەمریی (خلود)

باز: بینینی و نیشتنەوەی بەسەرتاو نزیکت: هەموو خێرن. لای (فیرعەونەکان).

قاز: باش نییە دان بخوات واتا ڕزقت دەبڕێ. بەسەربڕاوی واتا لە دوژمن ڕزگاربوونە.

پەپووسلێمانکە (هدهد): ئەگەر بەسەر پەنجەرەکەتەوە نیشتەوە ئەوە پەیامێکی خۆشی پێیە.

شەمشەمەکوێرە: بە دەورتا بسووڕێتەوە تووش بوونە.

کۆترو مریشك: خۆشی خێزان و گەیشتنی بە خواست و ئاواتە.

سەگ: سپیەکەی هاوڕێی دڵسۆزەو ڕەشەکەی هاوڕێی ناپاکەو مردنی لە کیس چوونی هاوڕێیەو کلك ڕاوەشاندنی خۆشی ناوماڵە.

گا: تووڕەیی و هەڵچوونە.

کلیل دۆزینەوە: نهێنیەکت بۆ دەردەکەوێت.

کلیل لە دەرگادا: کردنەوەی قاپی ڕزقە.

کوێربوون: تووشی تەڵەکە بوونە.

کوێربوونی چاوی ڕاست: سەرنەگرتنی خۆشەویستییە.

خوێن: خێرو چاکبوونەوەیە لە نەخۆشی.

ڕەنگی ڕەش: گوناهت زۆرە.

ڕەنگی سپی: پاکی و ڕاستی و نوری خوایە.

ڕەنگی زەرد: حەسوودی: چاوپیسییە.

ڕەنگی قاوەیی: فێڵ و تەڵەکەیە.

سەوزی تێر: شەڕو خراپەیە.

سەوزی کاڵ: خێرو خۆشییە.

زەردی ئاڵتونی: حیکمەت، بەرزبونەوەیە.

زیوی: بێ بڕوایی بەخۆ، دوودڵییە.

شین: بڕواو یەکبوونە.

ئاسمانیی: ئومێدو بێگەردییە.

سوور: زەبرو خەتاو شەهوەتە.

بنەوشەیی: بڕواو ئایینە.

پزیشك بینین لە خەوا: تووشبوونی نەخۆشییە.

گۆج و ئیفلیج بوون لەخەوا (شلل): چاکبوونەوەیە لە نەخۆشیەکی قورس.

خۆشتن لە حەوزدا: تووشبوونی نەخۆشی جومگەکانە.

خۆشتن لە ئاوی لێڵدا: تاڵی هاتنە.

خۆشتن لە دەریادا: بەری دەدات.

مار لە قاچەوە ئاڵان: (تصلب شرایین).

دووپشك بدا بەدەستی چەپەوە: نەخۆشی دڵە.

تەونی جاڵجاڵۆکە لەسەر سنگ: نەخۆشی سییەکانە.

باڵندە بە سەرسەرا بسووڕێتەوە: گلکردنی چاوە.

تووکی سەر ڕووتاندنەوە: نەخۆشی پێستە.

مێروولە هەڵگەران بە لەشدا: نەخۆشی ئێسقان و (فەقەرات)ە.

کوورەی هەنگ بینین: نەخۆشی گوێیە.

خواردنی بۆڵەترێ: نەخۆشی ڕیخۆڵەیە.

پالکەوتن لە گۆڕدا: چاکبوونەوەیە لە نەخۆشی خراپ و درێژی تەمەنە. (لای میسریە کۆنەکان فیرعەونەکان)

مەلیك: باوك.

مار: نێرینە.

ژوور: مێینە.

بەشی دووەم

پێشەکی:

میللەتی کورد وەك هەموو میللەتێکی تر کە لە ڕیزی خۆیایەتی، بەتایبەتی دانیشتوانی دەرەوەو لادێ و بەشێکی زۆریش لە دانیشتووانی شارەکان ئەمانە هەموو کەموو زۆر بڕوایان بە خەوبینین هەیە. زۆریان ڕەشبینانە لێکی دەدەنەوە، یاخود خەڵك بەو جۆرە بۆیان لێکدەداتەوە، دڵیان دادەچڵەکێنن و دەیان خەنە مەراقێکی زۆرەوە، هەشە ڕوون بینانە تەفسیری دەکەن، هێمن و جۆرە حەسانەوەیەکی نەفسی دەدەن بەخۆیان و دڵیان خۆش دەبێت. لەڕاستیشدا وەنەبێت لێکدانەوەکانی هەردوولا لەسەر بناغەیەك بێت لەسەر ئەو بناغانەی باسمان کردن، هەروەها یەکێك نەبووە خۆی بەمجۆرە شتانەوە خەریك بکات و جۆرە شارەزاییەکی تێدا پەیدا بکات. مەلاکان و کۆلکە خوێندەوارەکان نەبێت کە بە کتێبی کۆن وەك نووسینەکانی خواجە حافزو شێخی سەعدی و هەندێکی تر(گەشبینی-تفاؤل)یان بەخەڵکی پەیدا دەکرد، بێئەوەی ئەو کتێبانە پەیوەندییان بە لێکدانەوەی خەوەوە هەبێت، بەڵام ئەوەی زۆر باوبوو لەناو کوردەواریدا بگرە تاکو ئێستاش، ئەوەبوو کە خەوبینین بە خواو پێغەمبەرو شێخ و مەشایخ و وەلی و پیاوچاکانەوە، ئەو کەسە بەرزەکاتەوەو بێ ئیمان نامرێ و (سلبی) سەرە مەرگ نابێت و لەوانەیە یەکسەر لەودنیا بەرەو بەهەشت بچێت.

من خۆم منداڵبووم هەرچەند ئەمانەم دەبیست و ئەژنەفت هەربیرم لەوە دەکردەوەو خولخوام بوو شەوێك لە خەوما بە خزمەتی خوای گەورە، یاخود پێغەمبەری خۆشەویست بگەم. ئەم بیرو لێکدانەوەیەو شەو بەو خەیاڵەوە نووستنە وای لێکردم شەوێك لە تەمەنی شانزە ساڵیدا خەوم بە پێغەمبەرەوە دی، دەستم ماچکردو ئەویش سەری ماچکردم و کێشای بە پشتما کە تەمەنم درێژ بێت. بۆ

بـەیانی ئەوەنـدە بـە خۆشـییەوە خەوەکـەم گێڕایـەوە وەك لـە تاقیکردنەوەیـەکی گەورەدا بەیەکـەم دەرچـووبم، خـەڵکیش لەڕاسـتیدا بـەخیلیان پـێ دەبـردم کـە ئـەو خەوەم دیوەو بوو بە تەحاتەحا ئیتر خزم و بێگانە بە جۆرێکی تـرو بـە چاوێکی کـە سـەیریان دەکـردم، ئەمـەش بـەپێیێکی بـاش دەوامـی کـرد تـا شـتەکە وردە وردە لەبیرچووەوە، بەڵام لەبیرخۆم هەرنەچۆتەوە.

جا من خەوەکەی لالە سەرحەدیش هەر بەمجۆرە لێك دەدەمەوە، لالـە سـەرحەد لە کۆمـەڵێکی دواکـەوتووی سـەدەی نۆزدەهەمـدا ژیـاوە، ئەوسـا بیروبـاوەڕی ئـاینی گـەلێك بـەهێزترو کاریگـەرتر بـوو لـە ئێـستا، بۆیـە ئـەویش خەوەکـەی بـە خـواو پێغەمبەرەوە دیوەو ڕەنگ هەیە بە خەیاڵیشی کەم و زۆر شـتێکی تێکـەڵاو کردبێـت، بەڵام وەك هەندێك کەس کە لە خۆیانەوە دەڵێن خەوەکە هەڵبەستە من ئەم رایـە بـە ڕاست نازانم هەموو کەسێ خەو دەبینێ و خەو دێنێتـە دی، ئـیتر بۆچـی ئـەم خـەوە درۆبێـت؟ بـەڵێ خـەیاڵ یـاخود هەڵبەستی ڕەنـگ هەیـە تێدا بێت، بەتایبـەتی ئـەو قسانەی کە پەیوەندییان بـە خـۆی و قـەیتول کـوڕی و عەشـرەتەکەیەوە هەیـە. جـا پێش ئەوەی بێینە سەر گێڕانەوەی خەوەکە بابزانین لالە سەرحەد کێیە؟

لالە سەرحەد

لـە ڕەگـەزدا خـەڵکی دێـی دسـکەرەیە سـەر بـە ناحیـەی تانجـەرۆ لـە پارێزگـای سلێمانی. دسکەرە ئـەمڕۆ دێیـەکی گەورەیـە نزیـك چـەمی تانجەرۆیـەو نزیك ڕێگـای ئۆتۆمۆبێلی بەینی سلێمانی و دەربەندیخانە.

لالە سەرحەد لە تیرەی ڕۆغزایی لە عەشرەتی جافە لەکاتی خۆیا (دەستپێکردنی سەدەی نۆزدەهەم) پیاوێکی نانبدەو دیاربووە، ئەوساکە هەر گەرمیان و کوێستانیان کـردووەو ماڵداری ئاژەڵیـان کـردووە، تۆوچـاندن و ئیـشکردنی تریـان بـەلاوە گـرنگ نەبوە، ڕۆژ ڕۆژی (گاڵت وەگوین)(٥)بووە کوڕێکی هەبووە (قەیتول)ی نـاوبووە زۆری

خۆشویستوە، کوڕێکی تری هەبووە (موالی) ناویبووە ئەم (موالی)یە باوکی(٦) (خەلیفە یونسی بەناوبانگە).

ئەم خەوەی لالە سەرحەدی ڕۆغزایی ئەگەر بچیتە قولاییەکەیەوەو ئەگەر هەر بە سەرزاری بەسەریا نەڕۆیت، دەردەکەوێ پیاوێکی زیرەکو بە کارو خەوەکەشی ناوازە(رائعە)یەکی زۆر بەنرخە لە ئەدەبی کوردیداو بە هیمەتی خوالێخۆشبوو عەلادین سجادی لە فەوتان ڕزگاری کردو خستیە سەر لاپەڕەکانی ڕشتەی مرواری(٧).

خەوەکە

لالە سەرحەدی ڕوغزایی ئاشنایەکی سەرڕاجی هەبوو زۆری خۆش دەویست، هەمیشە لە قسەکردنیشا بەربەرەکانی یەکیان دەکرد، شەوێك میوانی لالە سەرحەد بوو، بەیانی هێشتا لە خەوابوو، لالە سەرحەد هەڵی کوتایە سەر جێگاکەی، نووکە شەقێکی تێوەژەند بانگی کرد (ئاکورە ڕاستەوە وە گۆرانە هیزە نیوەڕۆیە)(٨).

کابرا بەدەم خەوەوە وتی:" گەماڵە پیرە بە میوانش ئەگەفی(٩)؟" لالەیش وتی:"ئابرا تۆ دەنگ، ئێم شەو خەوێکم دیگە، کەسی وا نەوو فاڵەکەیم بۆ بگێڕێتەوە، با وەتۆی بێژم" سەرڕاجیش وتی:" تۆ بێژیی، ئەگەر پچرپچریش بێ، بە دەرزی و درەوشە پێکەوە گیرەویەندی ئەکەم(١٠)" ئنجا لالە دەستیکردە خەوگێڕانەوە وتی:" (سەس ساق)(١١)و (بالأنتەران)(١٢) گۆییان پێوە وێ، گوێی دوژمن کەڕوێ و چاوی گشت وردە شاتری و (١٣) گەلایی (١٤) کوێر وێ، لە خەوما گوێلکە میچکەیەکمان گوم بوو بوو، شوێنم هەڵگرتبوو، گەیشتمە ئەو دەشتی (نێرگزە جاڕە)(١٥) ڕوانیم پیاگێکی ڕیش چەرموگی نوورانی لەسەر بەردەکەی (مەحمود گاوانی)(١٦) لێی هەڵیازیاگە، گالۆکێکی وەتەنشت خۆیا ڕاکێشابوو گەنجێکی لاوخاسی لەبەر دەما وێساگە، چست و چالاك مەگەر هەر خۆم لە تافی کوڕێنیما وا وریا بوویێتم. پرسیم برا توکێی و ئەو پیرە کێس؟ وتی: لالە ئەوە بینایی

چاوانەو منیش (حەمەد ڕەسولێ الله)م لە دڵی خۆما وتم پیاو وەخوا خاسبوو ئێستا وەکەرامەت سۆراخی گۆیلکەکەم(١٧) بۆ ئەکات. چوومە بەرەوە سلاوێکم کرد هیچ نەجمیا(١٨)، بەلام وەلالوتێکەوە بوڵەیەکی لێوەهات وەکو جواوی سلاوەکەی دابمەوە واوو، تەمابووم تورەبم بێژم کاورا سلاو سلاوی خوایە تۆ بۆچ خاس جوابم نادەیتەوە وە گالۆکەکەت ئەنازی؟ حەمەد ڕەسول الله خێرا تێگەیشت هاتەبەرەوە وتی: قورووان ئەوە لاڵە سەرحەدە، لاڵە سەرحەد. ئنجا جمیاو چوار مەشقی لێی دانیشت و وتی: لاڵە وەخێرهاتی، مەڕوانە قسور، شەو نەخەوتووم، نیازمان بوو بێینە میوانی، تۆ جارێ ئەم دەشتەم لاخۆشوو وا تۆزێ لێرە حەساینەوە... منیش وتم: قورووان وەخێر بێی فەرو بەرەکەتت هاورد وتم: لەو وەختەدا لام کردەوە پێ کورەیەک لە چەمەوە هات وتم بت بینم چۆن ڕانەکەیت؟ بچۆرە ماڵەوە بێژە وە خازە(١٩) میوانمان تێت، شەکە گێژەکە سەروین، گۆشتی شەکی گێژ فرە خۆشە.

پێ کورە ڕۆی و منیش ڕووانیمە بەرو بەریشتێنی بینایی چاوان، کیسەو سەویلم نەدی سەویلەکەی خۆم دەراورد فرە خۆشەویست وو لەلام، لەو ساڵەوە خازەم هاوردوو چوویوومە تانجەرۆ سلێ بکەم ئەو سەویلەم دۆزیۆ، کیسە توتنیش هەر ئەو کیسە وو کە لە کراسی منالی (قەیتولی)و خویشکەکەی مابوو، هەرچەن ئەولنیش پیاهەلێ ئەمیزان، بەلام خازە گجارێ ئەیشۆرد توتنەکەشی کورگەل لە کاروانی بەغدایان داوو هەنێك تونیان بۆ هاوردوم توتنەکە فرە خۆشوو مەگەرتوتنی بەرلوی (قاینەجە)(٢٠) هاوشانی بکردایە.

سەوێلێ خاسم تێکرد، دامەدەست حەمەد ڕەسولێ الله بوم بگرێ تا ئاگری بوّ ئەکەمەوە ، هەسێ و بەردەکەم دەراورد گازێ پوشوی(٢١) ئاودارم داگیرساند، سەویلم لە دەست سەندەوەو پوشوم خستەسەر قومێکم لێدا تاخاس داگیرسیا دامە دەم بینایی چاوان، مژێکی لێدا فەرمووی: لاڵە ئەم توتنەت لە کوێوو فرەخۆشە؟ بێژە جاخێکم بۆ داگرن لە تەك خۆما ئەیوەم وتم وەچاوان.

لەو دەمەدا تەماشامان کرد وا لە دوورەوە بررە سوارێك دەرکەوتن، کە هاتن من ناسیمن، بینایی چاوان فەرمووی لالە ئەوانە کێن؟ وتم بینایی چاوان کورِگەلی تەرخانین هاتگن بۆ پێشواز، وتی با بچن بەولاوە فرە بێ فەرِن بە شوێن ئەوانا دەستەیەکی تر هاتن پرسی ئەمانە کێن؟ وتم ئەمانە وردە شاترین، دیسان فەرمووی ئەمانەش بێ فەرِن. کاروانێکی ترهاتن پرسی ئەمانە کێن، وتم ئەمانە گەلاَلین، وتی ئەمانە هەر فرە بێ فەرِن با چارەیان نەوینم(٢٢).

ئەوا بینایی چاوان خۆی لەو سەرەوە دانیشتگە، حەمە رەسولَ اللە لەولایەوە منیش لەم لایەوە، هەروا قسەمان ئەکرد کەچی تاقمە سوارێکی فەقیانە شۆرِی سەروپێچ لاری گشت جوانخاس تۆزنەکەن و هاتن بۆرکەوە سوارێك لە پێشیانەوە تەراتێن ئەکات ئەتووت بای غەزەوو، تۆز وە قولیا ناگات بینایی چاوان فەرمووی لالە ئەمانە کێن؟ وتم ئەمانە کورِگەلی رِۆغزایین، ئەو سورکەوە سوارەش لە پێشیانەوە(قەیتول)(٢٣)ی خزمەتکارتە. تومەز ئەمانە هەموو کە کاورای پێ کوررە خەوەری بردبوو گشت هاتگن وەپێشواز. بینایی چاوان فەرموی (ماشا اللە، ماشا اللە لە خێلَی رِۆغزایی، لە قەیتولی سورکەوە سوار، ئاپێ بێژە چکێ نۆما سورکەوە باخێوێ) منیش وتم (قەیتە ئابتوینم خۆماسایی وەجاخی باوکت رِوون کەرێ) قەیتول ئاوزەنگی پیا هاورد، خێروێ و بێروێ، نۆما هات وەخۆیا سەری سوارێوو، کلکی سوارێك(٢٤)، قەیتولیش لەناوەرِاستیا وەك حەمە رەسول سواری بوراق بوویێ وابوو.

لەو سەردەمەدا سەیری قەیتولم ئەکرد. حەمەد رەسول اللە سەری نابووە بناگوێی بینای چاوان، تێگەیشتم کە گەرەکیە بە بینایی چاوان بێژێ دلوای نۆماکەی لە قەیتول بۆ بکات، وتم کاکە قسەی خۆت مەدۆرِێنە قەیتول نەگریس و توورِەو کەللە شەقە، لێت توورِە ئەوێ، میوان ئەوی خواش وی نایدا، بینایی چاوان

فەرمووی: محەمەد ئـەم نوێمایـە هـەر بـۆ قـەیتول خاسـەو هـەر لـەو دێـت، مـن بیـژم وەرەئیسی عەنزە چارەوێیکی(٢٥) عەرەوی فرەخاس بۆ تۆ بنێرێ.

سا ئێمە لەو حەیسەو بەیسەدا بووین تێ فكریم وەك قەتارەی قـولنگ سـەرەیەك بنشن هەر پێ كورەیەك سینییەك، یاسەلەیەك(٢٦) وەسەر سەرەو نان هات، بەڵام چ نانێك؟ پلاو گشت وەك مـەلای سەرچـەرمگ تەشـوە ترشـێ هەسـەن وەگـی لەتـەكا وەقاورمەی شەكە(٢٧) گێـژا دەورە دریاگـە پیـاك ئەشیا بێـژێ هـەر نانـەو بـۆ خـوا دورست كریاگە.

نان دانرا، (خولە)ی ئەلی كەوكوژ وەخۆی و زورنایەوە پەیدابوو بێوەی كەس پێی بێـژێ پیكـی زورنـای لێ خـۆش كـردو فیقانـدی وە زورنـادا ئەوانـەی نانیـان هـاوردوو كەوتنە ژەنن، كاورای دەمولژەنی قلیاسانی وەفرركانێ دەهـوڵی گەیانـد، لـە تەقـەی دەهـوڵ و زورنـا لەگەشـت لایەكـەوە كەنیـشك و شـوێرەژنی جـاف گلێـر بوونـو، بوەرەشوەڵەكێك بۆ حەمە(٢٨) پاشاش ئەو زەماوەنە نەكریاوو. جا براكە بزانە چەن خۆش وو وەدەنگی دەهوڵ و زورناوە ئەو نانە نۆشی گیان كریا.

حەمـە رەسـوڵ اللـە فـەرموی (شـنینە) نـەمزانی چـی بێـژی، بینـایی چـاوان فەرمووی(نو)ی گەرەكە، مەشكەدۆ هات كاسەیان بۆ پركـرد، كەوچـكی نەگـەرەكوو، هەروا كاسەی ناوە سەریەوەو ئۆ خەیچیشی كرد منـیش وتم یـارەووی نۆشـی گیانـت وێ، هەروا لە دەنگی دەهوڵ و زورنا مكایلی و سەدلنی گلێر بوونەوە، بینـایی چـاوان پرسی لالە ئەمانە كێن؟ عەرزم كرد قـوروان مكـایلێن لەتـەك ئێمـا نـاكۆكن فـەرمووی رایانكێشن بۆ جەحانم لە زیرەی ئەوان خەوەرم بوو.

كاتێك لالە سەرحەد ئەم خەوەی گێرایەوە سەراج وتی:" لالە تۆ بێژی ئەم گشت تەحامەیان هاورد، خۆ من هێمان لە ماڵی تۆ چەشكەی بـرنجم نەكردگـە؟ خـازە هـەر بێژی برنج نەكوتیاگە، چـۆن بەودەمودەسـە كوتریـاو لێ نریـا؟ منـیش ئیمـشەو خـوا

وەخێری بنووسیّ خەویّکم دیگە." لاله سەرحەد وتی:" ئابرا بیّژی بزانم تۆ چیت دیگە؟"... سەڕاج وتی:

(له خەوما من زینێکم بۆ چارەویّ فلّقەکەی تۆ دوریوو پارەت نەدلومیّ هاتم وەگژتا تۆش دەستت لیّ دابوومە شیرو سوپاشی حەمە سالّح بەگ قایمقامی(٢٩) هەڵەبجە گرتینی و بردینیە دیوان پرسی ئەریّ گەماڵە پیرە ئەم پیاوە زینی بۆ دووریی پارەت بۆچ نەدلوەتیّ؟ تۆش وتت میرم ها له ماڵما بەخێوی ئەکەم پارەی چی بەمیّ؟ لەسەر ئەوە ئەمری کرد هەردووکمانیان ڕاکێشا. منیان خستە چاڵێك پیسایی ئەدەبخانەوەو تۆشیان هاویشتە چاڵێك هەنگوینەوەو لەشمان تێوە چوو...

لاله سەرحەد هەڵی دایە وتی: دەبیخۆ دەردت بیّ.

سەراج وتی: ئەریّ وەڵڵاتیا قورس بووبووم لاله سەرحەد وەکەیفی بوو کەوتە تیتاڵی وتی: خۆڕایی نییە، بانگێشتنم بۆ بینایی چاوان کرد گە سەراج وتی ئەو ساکەش تۆ پێکەنیت میرقی هەستا ئەمری کرد: مەواشیر بدە لێیان، بێژە ئەشیّ یەکتر بلێسنەوە من دەستم کرد وەلێسانەوەی تۆ فرە خۆشوو تۆش دەستتکرد وەلێسانەوەی من قێزت هاتەوە بەسەریا ڕشایتەوە، ئەویشیان بەزۆر پیّ هەلگرتینەوە.

لاله سەرحەد کە گوێی لەمانە بوو دەستیکرد بە جنێودان و بە دەمیشیەوە هێڵنجی دەدلو دەیوت:" دەویت باوکە ئەوە خەوە تۆ دیوتە؟" سەراجیش وتی:" ئەی گەماڵە پیرەی بیّ کەڵبە، ئەوە خەوە تۆ دیتگە فلیانت بۆ خوا لە کیسەی توتنی میزاویدا تێکردووەو بۆ چارەویّ فلّقێك کە بەدزیەتی چنگتان کەوتووە قسەی خودلو دڵی پێغەمبەرت شکاندوە؟..." خەوەکە تەواو بوو.

دوا تێبینم بەرامبەر بەم خەوە ئەوەیە: کە لاله سەرحەد گەلێك شانازی بە خۆی و قەیتولی کوڕی و چارەویّ سورکەوەکەی لە هەموو زیاتر بە تیرەی ڕۆغزاییەوە دەکات کە خۆیانن و تیرەکانی تری لا هیچە (هەرچەندە هەمووشیان دەچنەوە سەر

عەشرەتی جاف) هەروەها دەیەوێت (نانبدەیی) خۆی دەربخات وەك زۆربەی خێڵەکانی تر واتا عەشایەر کە ئەو دەست و دڵە فراوانەیان هەیە جگەلەوە هەرچەندە خەوەکەی بەو جۆرە بووە، یاخود بەو شێوەیەی گێڕاوەتەوە، بەلاّم هێزی ئاینی و بڕوای ئەو پیاوە دەردەخات بەرامبەر بە یەزدانی مەزن و بە پێغەمبەری خۆشەویست بەو شێوەیەی کە خۆی تێی گەیشتووەو چۆتە دڵیەوە. هەندێ کەس ڕەنگ هەیە ئەم خەوە یاخود قسەکانی لالە بە (کفر)و (بێ دینی) بزانن دەسا ئەوەندەی من تێگەیشتبم ئەو بەوپەڕی بڕواو ئاینەوە ئەو قسانەی گێڕاوەتەوە، بەلاّم لە چمکی سەیرکردنی خۆیەوە وەك ئیسلامێکی ساکارو ڕۆڵەیەکی عەشایەری نەخوێندەوار.

دواقسەم ئەوەیە دەڵێم: هەندێك هەڵبەست بە خەوەکەوە دیارە، سا لە گێڕانەوەی ئەم دەم بۆ ئەو دەم و لەمەوە بۆ ئەو، یاخود لالە سەرحەد خۆی خەوەکەی دیوەو چکێکیشی پێوە ناوە، بەلاّم لە ئەنجامدا ئەمانە هیچ لە (ئەسڵ)ی خەوەکەو لە نرخەکەی کەم ناکەنەوە.

## پەراوێزەکان:

١ـ سەیری گۆڤاری (الهلال) تۆکتۆبەری (١٩٧٥) بکە ژمارەی تایبەتی کە بۆ خەوبینین تەرخانکراوە. ل٦٥.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو ل٦٢.

٣ـ لە زۆر شوێندا وشەی (خود) شوێنی خەوبینن دەگرێتەوە، ئەمیش بەگوێرەی ڕست و ئەو شوێنە دەگۆڕێت کە تێدا بەکار دەهێنرێت. لەڕاستیشدا لە قسەکردنی ڕۆژانەماندا ئەمە شتێکی ئاساییە.

٤ـ ئەم کۆمیدیای خوایە زۆرەو دووروودرێژە. ئێمە لێرەدا لەمە زیاترمان نەتوانی دەربخەین.

٥ـ ئەوسا کە هێشتا کۆمەڵی کوردەداری لە گەرمیان و کوێستان کرندا بوون بە دوای ئاژەڵدا هەندێکیان تازە نیشتەجێ بووبوون (گۆران)یان پێ دەوتن کە بەلای کۆمەڵی یەکەمەوە (کە کوردیان پێ دەوتن) سووك بوون بەجۆرێك کە (گاڵ) یاخود هەرزنیان بچاندایەو کوردەکە ڕانەکەی بەشوێنکدا لێ خوڕیایە کە پەڵە هەرزنەکە یاخود گاڵەکەی لەسەر ڕێگادا بووایە بێزی نەدەهات ڕانەکەی لابدا بە گۆرانەکەی ئەوت گاڵت وەگوێزە.

٦ـ بە خەلیفە یونسی دسکەرە ناوبانگی دەرکردبوو من خۆم دیومە.

٧ـ (ڕشتەی مرواری) هەشت بەرگە. بەنرخترین کلتووری کوردە کە خوالێخۆشبوو عەلائەدین سجادی کۆیکردۆتەوە.

٨ـ گۆرانە هیزە بەواتای (شاری) دێ، شاری بە تەمەڵ و بێکارە دەدرانە قەڵەم لەلایەن کوردی گەرمیان و کوێستان و کوێستانکەرانەوە.

٩ـ دەگەفی: دەوەڕی.

١٠ـ سەراج: واتا ئەو کەسەی کە (سرج – زین)ی وڵاخی دروست دەکرد. ئامێرەکانی کە بەکاری دەهێنا سوژن و درەوشەو دەرزی و دەزوو بوو.

١١ـ سەس ساق: سەی صادق کە لەو ڕۆژانەدا تەنها شەخس بووە لەو شوێنە نێژراوە. یەکێکە لە دوانزە کوڕەکانی شێخ عیسای بەرزنجە. ئێستا سەی صادق شارێکە بۆ خۆی.

١٢ـ باڵانتەران: شەخسێکە گۆڕی پیرۆزی لە شارەزوورە، نزیک دسکەرە.

١٣ و ١٤ـ شاتری و گەڵاڵی هەریەکە بەشێکن لە ئێلی جاف و لەو ڕۆژگارەدا ناحەزی ڕۆغزایی بوون.

١٥ـ دەشتی نێرگزەجار: دەشتێکە لە شارەزوور نزیک دسکەرە.

١٦ـ مەحمود گاوانی: ئەویش شەخسێکی پیرۆزە نزیک دسکەرە.

١٧ـ گوێلک: گوێرەکەیە، والدیارە ئەو گوێرەکەیە ون بووەو لالە سەرحەد لەو دەشتەدا بەدوایا گەڕاوە.

١٨ـ نەجمیا: واتا هیچ نەجولا. کالۆك: گۆچان.

١٩ـ خازە: خێزانەکەی لالە سەرحەد بووە.

٢٠ـ قاینەجە: دێیەکە وەختی خۆی مولکی عیزەت بەگی حەمە صالح بەگی جاف بوو، هەر لە ناوچەی شارەزووردایەو سەر بە ناحیەی خورماڵە.

٢١ـ بەردە ئەستێ و پوشو: کاتی خۆی ئاگر بە بەردەئەستێ دەکرایەوە. پوشو ناوجەرگی داری گەندەڵە کە وەك ئیسفنجی لێ دێ و تۆزێکی دەخرایە سەر بەردێکی تایبەتی و بە ئاسنەکە (ئەستێ)کە لێ دەدرا، گڕی لێهەڵدەستاو پوشوەکە ئاگری دەگرت و بەکاردەهێنرا بۆ جگەرە داگیرساندن.

٢٢ـ وەك وتمان وردە شاتری و گەڵاڵی لەو ڕۆژگارەدا ناحەزی ڕۆغزایی بوون.

٢٣ـ قەیتول: کوڕی لالە سەرحەد بوو و شانازی پێوە دەکرد.

٢٤ـ جاران ئەو وڵاخەی کە مل و کلکی لەکاتی غاردا بەرز بکردایەوە ئەوە جێی شانازی سوارەکە بوو.

٢٥ـ چارەوێ: وڵاخ: ئەسپ. ئەسپی عوبێدی و عەنزە بەناوبانگ بوون لە کوردستانا.

٢٦ـ سینی و سەللە: ئەوسا خواردن لەسەر سینی، یاخود سەبەتەی پلاوپاڵێو دادەنرا.

٢٧ـ گوایە شەکیگێژ (مەڕ) گۆشتەکەی زۆر خۆش بووە.

٢٨ـ مەبەستی لە حەمە پاشای جافە کە سەرۆکی ئێلی جاف بوو.

٢٩ـ حەمە صالح بەگی قایمقامی هەڵەبجە– حەمە صالح بەگی بابان کە پیاوێکی ناودارو باخی میر لە هەڵەبجە بەناوی ئەوەوە بوو.

# بنەماڵەی عەلەکە لە سلێمانی

## بە قەڵەمی ئیسحاق عەلەکە(١)

پێشەکی: لە کۆتایی ساڵەکانی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا و پێش ئەوەی (ئیسحاقە فەنی عەلەکە) فەرمانی یەزدان بەجێبێنێ ئەم زانیاریانەی لە بابەت بنەماڵەی عەلەکەوە بەدەستخەتی خۆی بۆ نووسیەوە(٢) کە تا ئێستا هەڵمگرتووە، جابۆ ئەوەی نەفەوتێ و خوێندەواری ئازیزانیش چاوێکی پیا بخشێنن بلاوم کردەوە، تەنها بەتۆزێك دەستکاری هەندێك لە وشەکانی کە زۆر (تقدیر)ی خوالێخۆشبوو ئیسحاقە فەنی دەکرێت کەوا توانیوەیەتی ئەو شتانە بەکوردی بنووسێت، چونکە نووسین و خوێندنەوەی ئەوان زیاتر بە کلدانی بوو جگەلە عەرەبی و ئینگلیزی.. فەرموون بۆ نووسینەکەی ئیسحاق عەلەکە:

عائیلەی عەلەکە(٣)

باوکی عەلەکە ناوی پولص کوڕی ئیبراهیمەو لە دێی (ئەرموتە)(٤) کە نزیك کوێسنجاقە هاتووە بۆ سلێمانی.

عەلەکە کوڕی پولص لەساڵی (١٨١٥)لە دایك بووە، باوکی سنعی جاو(٥) فرۆش و جاوکڕین بووە. عەلەکە لەپاش باوکی ئەویش سنعەتی باوکی گرتووە جاوفرۆش و پێچاڵی(٦) جاوکردنی هەبووە بەواستەی شاگردانەوە جاوی کردوەو فرۆشتویەتی چەند دەفعەیەك لە سلێمانییەوە چووە بۆ هەمەدان بۆ فرۆشتن، چونکە لەو وەقتەدا جاوی سلێمانی مەشهور بووە لە هەمەدان.

عەلەکە چوار کوڕو دوو کچی هەبووە، کوڕی گەورەیان عەبدولکەریم و لەپاشان (رزق اللەو عەبدلرحیم و فرانسیس). عەلەکە تا کوڕەکانی گەورەبوون هەر خەریکی جاوفرۆشتن و لۆکەفرۆشتن و جاوکردن بوو، موفق بوو دەستیکرد بە تیجارەت(٧)

عەبدولکەریمی نـاردە شـاری (سـنە) بـۆ تجـارەت و بـۆ کڕینـی کـەتیرە(٨). ئـەوەڵ شەخس بوو عەبدولکەریم عەلەکە بە گرتنی کەتیرەو تجارەتی کـەتیرە لـە سـلێمانی ئیجاد بوو، هەروەها کوڕە بچووکەکەی فرنسیسی نـارد بـۆ شـاری (بانـە) بـۆ کڕینـی کەتیرەو مازوو(٩) لـە سـلێمانییەوە ئـەموالی دەنـارد بـۆ سـنەو بانـە. لـە پاشـان کـە تجارەتی سلێمانی ڕەبت بوو بـە بەغداوە، عەبدولکـەریم دەسـتیکرد بـە تجـارەت لـە سلێمانییەوە کەتیرەو خوری و مازوو و پێستەی دەنارد بۆ بەغدا، لە بەغداوە ئەموالی قاتور(١٠)و شخاطة ئەنواعی عتاری و ئاسنی دەهێنا بۆ سلێمانی.

مەشهورە ئەوەڵ شەکری کەللە هات بۆ سلێمانی، عەبدولکەریم عەلەکە ناردی لـە بەغداوە هێنای بۆ سلێمانی، ئەو وەختە شەکری کەللە بەسندوقی تەختە دەهـات بـۆ سلێمانی، لە پاشا عەبدولکەرم هاتەوە بـۆ سـلێمانی و ڕزق ئـەللا عەلەکـەی نـارد بـۆ بەغداد. عەلەکە ئەو خانووە گەورەیەی کرد کە لەوەختی خۆیدا قەسرێکی عەزیم بوو کە ئێستا ماوە(١١).

لەسـاڵی (١٨٩١) ڕزق ئـەللا گەڕایـەوە بـۆ سـلێمانی، عەبدولکـەریم و فـەرنسیـسی برای چوونە بەغداد. هەروەها عەلەکە لەگەڵ کوڕەکانی ڕزق ئـەللاو عەبـدولڕەحیم لـە سلێمانی و عەبدولکەریم و فرنسیس لە بەغداد خەریکی تجارەت بوون. سـاڵی (١٩٠٠) ڕزق ئەللا چوو بۆ (ئاڵتون کۆپری) بۆ شتنی خـوری و ناردنی خـوری بـۆ بەغـداد بـە واستەی(١٢) کەڵەکەوە، لەوێ لە ئاڵتون کۆپری وەفاتیکردو لە کڵێسای کەرکوك دفن کـرا. ڕزق ئـەللا عەلەکـە لـەپاش وەفـاتی دوو کـوڕی بـوو، کـە یـەکێکیان نـاوی مەجیدە(١٣) ئێستا لە بەغدا خەریکی تجارەتە، کوڕەکەی تری ناوی (نعومی) بوو لە ئینگلتەرا وەفاتی کرد. چـوو بـۆ مکتبـی (طـب) لـە (اونبـورغ) وەفـاتی کـرد لەسـاڵی (١٩٠١)عەبدولکەریم گەڕایەوە بۆ سلێمانی و فرنسیس لە بەغداد مایەوە.

عەلەکە لەساڵی (١٩٠٥)وەفـاتی کـردو لەکڵێسای سـلێمانی دفـن کـرا، هـەروەها فرنسیس ساڵی (١٩١٧) لە سلێمانی وەفاتی کردو لە کڵێسای سلێمانی دفن کـرا. دوو

کوڕی هەبوو یەکێکیان ناوی (بەشیر فرنسیس) لە زانکۆی (ئەمریکا)یە لە بەیروت تەحسیلی تەواوکردو ئەلئان ئوستازە لە کولیەی تجارە. ئەوی تریان کە ناوی (شەوکەت)ە لە کۆلێژی یاسا لە عێراق دەرچوو. ئەلئان رەئیس ملاحزینە لە دائرەی (ئینحسار ئەلتبغ عام).

عەبدولرەحیم عەلەکە ساڵی (١٩٣٦)لە بەغداد وەفاتی کرد، سێ کوڕی هەیە: دکتۆر (لەتیف عەلەکە)، ئەوی تریان (فکتۆر) کە تەیاربوو لە وەختی تەدریبی عەسکەری لە ئاسمان قەزاو قەدەر وەفاتی کرد. کوڕەکەی تری ناوی میخائیل عەلەکەیە، عەبدولکەریم عەلەکە عەمیدی عائلەی عەلەکەیە خزمەتێکی(١٤) زۆر گەورەی هەیە بۆ سلێمانی لە زەمانی عوسمانیەکانا ئەعزای مەحکەمەی جزابوو و لەتەرەف مەحکەمەوە تەعین کرابوو دووبارە کرابوو بە عضو، ئەگەر لەبەینی دوو تاجرا منازەعەیەك بوویێ مەحکەمە بە سورەتی رەسمی دەیناردن بۆ لای عەبدولکەریم بۆ (حەل و فەسل) لە بەینی ئەو دوو تاجرە، ئەویش هەر دوو تەرەفی رازی دەکردو قەزیەکەی دەناردەوە بۆ مەحکەمە، مەحکەمەش تەسدیقی دەکردن. ئەم خدەماتەی کە دەیکرد هەموو مەجان بوو.

لەساڵی (١٩١٣) قونسولێکی ڕووس هاتە سلێمانی، هاتە کلێساو تەڵەبی لە قەشە کرد کە رەئیس و پیاوێکی گەورەو تێگەیشتووە، دەمەوێ چاوم پێبکەوێ، قەشە گوتی ئەو پیاوە عەبدولکەریم عەلەکەیە. بلفعل ناردی بەشوێن عەبدولکەریم بێ بۆ کلێسە چاوی بە قونسولێ بکەوێ، عەبدالکریم رازی نەبوو. قونسولێ تەڵەبی کرد کە خۆی بچێتە لای عەبدولکەریم بۆ ماڵەوە، عەبدولکەریم ئەوەشی قبوولێ نەکردو خەبەری بۆ نارد کە من بە سورەتی قەتعی ئیشم بە قونسوڵی ڕووس نیە، رەئیسی من متسرف و حکومەتی عوسمانیەو نامەوێ چاوم بە قونسولێ بکەوێ، هەرچەند محاوەلەی کرد فائدەی نەبوو، قونسولێ مەئیوس بوو، ئەو وەختە متەسەریفی سلێمانی (بیرام فەهمی) بوو، کە زانی عەبدولکەریم قبوڵی نەکردووە کە قونسولێ

بچێتە ماڵەکەی و خۆیشی نەچووە بەلایا، زۆر مەمنون بوو و فوق ئەلعادە تەقدیری وەتەنیەتی کردە عەبدولکەریم مقدارێکی گەورە خورمای کڕی ناردی بۆ پێنجوین بۆ عەسکەر کە ئەمە خارجی ئیعانەکە بوو. لە پاشا لە ئەواخری ساڵی (١٩١٦)و ئەوائیلی ساڵی (١٩١٧) قحتی فەوق ئەلعادە ڕوویدا لە شاری سلێمانی.

ساڵی (١٩١٤) کە حەربی عالەمی ئەوەڵ دەستی پێکردو لەبەر داخڵبوونی حکومەتی عوسمانلی بە حەربەکە، عەبدولکەریم عەلەکە لە تەرەف حکومەتەوە تەعین بوو ، بوویە عزوو بۆ جمعی ئیعانەو لزومیەتی عەسکەری. بلتەبع هیچ قسوری نەکرد بە ئیعانەدان بۆ حکومەت لەپێش هەموو کەس ئامادەبوو بۆ ئیعانەدان و هەتاوەکو وەختێك کە عەسکەری ڕووس گەیشتنە (سەقزو بانە) خارجی عقلە حەتا بە سورەتێك لەسەر (گۆشتی کەر) شەڕ دەکرا، هەر کەسێك خەریکی ئەوەبوو کە سکی خۆی بەهەر نەوعێك بێ تێر بکات، چونکە حکومەتی عوسمانی هەرچی زەخیرە هەبوو هەمووی لە شاری سلێمانی دەرکرد، خەڵك بێ نان و خواردن مانەوە.

ئەمجا عەبدولکەریم دەرگای خێری کردەوە خوا بەوە ڕەحمی کرد کە (ئاشی گاوران) لە تەنیشت ماڵی خۆیان بوو و ئاشەکەش هی خۆی بوو، ئەو لەگەڵ پیاوی مسەلەح گەنمی دەنارد بۆ هاڕین، دەکرا بەنان. یومیاً بە ئاشکراو بە سورەتی خەفی، پارەی دەنارد بۆ ئەو پیاوانەی کە ڕوویان نەدەهات بێن بۆ نان یان پارە، بە سورەتی خەفی بۆ ئەو کەسانەی دەنارد، یومیاً دوو سێ مەنجەڵی گەورە لێ دەنرا بەشۆربای برنج لەگەڵ گۆشت، ئەوە تەقسیم دەکرا بەسەر ئەو فەقیرانە کە دەهاتن و دەیان بردو قسمێکیان لەوێ نانیان دەخوارد، ماعدا پارەی کفن و قەبر هەڵکەن، هەموو وەختێك حازربوو بۆ هەموو مساعەدەیەك. ئەم حاڵە دەوامی کرد تا ئەواخری ساڵی (١٩١٧) ئەوسا ڕەفاهیەت کەوتە شاری سلێمانی.

حەقیقەتەن ئینکار ناکرێ عەبدولکەریم عەلەکە زۆر زۆر هیمەتی کرد بە صەدان کەسی لە مردن و فەلاکەت ڕزگارکرد بەواستەی ئەو دەرگای خێرە کە کردبوویەوەو بەواستەی ئەو چێشتخانەیەی کە دایناوبو بۆ فەقیر(١٥).

لە حکومەتی شێخ مەحمود عەبدلکەریم عەلەکە بوویە وەزیری مالیە، کە ئینگلیز شێخ مەحمودیان ئەسیر کردو بردیان بۆ هندستان، حالەن ماڵەکەی عەبدولکەریم و (خان)ەکەی و دەفاتری لەلایەن حکومەتی عەسکەرییەی ئینگلیزەوە تحری و حجزکراوەو دوای تەتقیق نجاتی بوو، گوایە خەبەریان دابوو کە شێخ مەحمود هەرچی پارەی هەیە لای عەبدولکەریم دایناوە لەدوای تەحقیق و تەدقیق دەفاترو تحری معلوم بوو کە درۆ بوو ئەسڵ و ئەساسی نەبوو.

لەپاش گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی (وا بزانم لەساڵی (١٩٢٢) (١٦)بوو)، حکومەتی ئینگلیز ئەمریدا کە شێخ مەحمود حالەن دەبێ لە سلێمانی نەمێنێ(١٧) سلێمانی تەرك بکات و ئەگەر بمێنێتەوە لە شارەکەدا سلێمانی بۆردومان دەکرێ. لەسەر ئەمە لەسلێمانی ئەهالی تەجمعی کرد کە هەیئەتێك بنێرن بۆ کەرکوك لەوێ لەگەڵ معاون قسە بکەن و لەوێشەوە بچن بۆ بەغداد بۆ مواجەهەی مەندوبی سامی. قرار درا ئەو هەیئەتە عبارەت بێ لەمانە:

١ـ عبدولکەریم عەلەکە. ٢ـ ئەحمەد بەگ فەتاح بەگ(١٨).٣ـ حاجی مستەفا پاشا. ٤ـ شێخ قادری حەفید. ٥ـ شێخ عەبدولکەریم قادر کەرەم(١٩). ئەم هەیئەتە لە سلێمانییەوە حەرەکەتیان کرد بۆ کەرکوك و مراجعەتیان کرد، وەلاکن مستەفا پاشا خۆی بلزات چوو بۆ تەلگرافخانە، دانیشت لەسەر تەلگراف لەگەڵ مەندوبی ئەلسامی بە بەرقیە وازی نەهێنا نیوەشەو خەبەری لێ وەرگرت کە سلێمانی بۆردومان ناکرێ(٢٠) لەپاشان ئەو هەیئەتە چوون بۆ بەغداد، چاویان بە مەندوبی ئەلسامی کەوت، هەتاوەکو عەبدولکەریم عەلەکە چاوی بە فەیسەڵ ئەول کەوت و پێی وت:" بۆچی قەزای چەمچەماڵ لە سلێمانی وەرئەگرن و ئەیدەن بە کەرکوك؟ (٢١)"

فەیسەڵ جوابی دایەوە وتی:" مەسڵەحەت وەها ئیجاب دەکا." عەبدولکەریم عەلەکە لە بەغدا مایەوەو ساڵی (١٩٢٣)(٢٢) کە سلێمانی تخلیە کرا عائلەی عەلەکە هاتنە کەرکوک و عەبدولکەریمیش هاتەوە کەرکوك لەوێ خزمەتێکی زۆری کوردەکانی کرد. بۆ نموونە (سەید نوری نەقیب)یان هێنا بۆ کەرکوك(٢٣) ئەو بوویە کەفیلی... لە پاشان عائلەی عەلەکە چوون بۆ بەغدا.

عەبدولکەریم ساڵی (١٩٤٨) لە بەغداد وەفاتی کرد، دوو کوڕی لەپاش خۆی مانەوە، یەکێکیان (شکوری عەبدولکەریم عەلەکە)یە کە لەدائیرەی مدیریتی ئەلڕەی ئەلعامە ملاحزە(٢٤) ئەوی تریان دکتۆر (نصوری عەلەکە)یە کە دکتۆرەو لە فەڕەنسا دەرچووەو ئێستا لە بەغدایە.

تێبینی: هەموو (دیان)ەکانی سلێمانی (کلدانی)و (کاسۆلیکی)ن و سەریە پاپان لە ڤاتیکان. بەزمانی کلدانی قسە دەکەن، نووسینیان بەپیتی تایبەتی کلدانییە، بەڵام خوێندیان لە قوتابخانەکانی سلێمانییە وەك خوێندن و نووسینی دانیشتوانی شارەکە بەکوردی و عەرەبی. ئەم برایانەمان هەندێکیان لە(ئەرموتە)ی لای کۆیەو هەندێکیان لە عەینکاوەی لای هەولێرو باقیە لە کەرکوکەوە هاتوونەتە سلێمانی.

ئێستا ماشائەڵڵا زۆرن و خوا زیاتریان کات و لەگەڵ خەڵکی سلێمانی وەك برا دەژین و لەهەموو هات و نەهات و ساردی و گەرمی و خۆشی و ناخۆشی دانیشتوانی سلێمانیدا. هاوبەشن هەندێکیان مووچەخۆری میرین و هەندێکیان کاسبی و بازرگانی دەکەن. (مەتران)ی کلدان لە کەرکوك دادەنیشێت کە دەبێ بە سەرۆکی ئەساقفە بۆ سەر کەرکوك و سلێمانی و هەولێر. مەتران قەشەی سلێمانی دادەنێت. کە مەترانیش سەر بە(بتریرك)ە کە لە بەغدا دادەنیشێت. بتریرکیش سەریە پاپای ڤاتیکانە لەمەوپێش واتا کاتێك من ئەم زانیاریانەم لە خوالێخۆشبوو ئیسحاق عەلەکە وەرگرت، بەمجۆرە بوو، جا نازانم ئاخۆ ئێستا گۆڕینی تیا بووبێت یان نا؟

ئەم برایانەمان لە گەڕەکێکی تایبەتی دادەنیشن لە سلێمانی کە (گەڕەکی گاوران)ی پێ دەڵێن کە تا ساڵەکانی پەنجاو شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، دەکەوتە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی و خانووی تر لەولاترەوە نەبوو، ئێستا دەتوانم بڵێم ئەم گەڕەکە کەوتۆتە ناوەڕاستی شارەوە.

ئەوی دەیەوێ زیاتر لە بنەماڵەی عەلەکەو لە برادیانەکانی سلێمانی بزانێ سەیری لاپەڕە(٧٦–٧٧)و (١٠٥–١٠٧) لە کتێبی (سلێمانی: شارە گەشاوەکەم) بەرگی سێیەم نووسینی جەمال بابان بکات.

پەراوێز:

١ـ ئیسحاق عەلەکە پیاوێکی هەڵکەوتووی دیانەکانی سلێمانی بوو، پیاوێکی وریاو قسەزان و تێکەڵی لەگەڵ هەموو دانیشتووانی ئەو دەمەی شارا هەبوو. ئەویش زیاتر لە نزیکەوە پەیوەندی بەبنەماڵەی عەلەکەوە هەبوو. (نوال ئسحاق عەلەکە) کە (سەیدەلانیە) کچی ئەم زاتەیە.

٢ـ واتا لەسەر داوای خۆم بوو، کە لەپاشا خستمە کتێبەوە.

٣ـ سەیری شەجەرە (درەختە)کەیان لە کتێبی (سلێمانی شارە گەشاوەکەم) بکە کە لەسەرەوە ئاماژەی بۆکراوە.

٤ـ (ئەرموتە) (دیان نشین) بووە لە زەوووەوە، ئەم دێیە نزیک کۆیەیە.

٥ـ جاو: جۆرە قوماشێکی دەستکردی خۆیی بوو، لەلۆکە دروست دەکراو لە کۆندا بەزۆری ئەم جاوە بۆ پۆشین و لەبەرکردنی ژن و پیاو بەکاردەهات.

٦ـ پێچاڵ: چاڵێکی نزیکەی مەترێک قووڵ و لەشێوەی (موستەتیل)دا کە ئامێرو باقی هەیتوهووتی جاوچنینی لەسەر دادەمەزرا.

٧ـ ئەوساکە واتا لە سەردەمی عوسمانیەکانا بازرەگانەکانی سلێمانی زیاتر هاتوچۆی ئێران و لەوێوە دەگەیشتنە هەشتەرخان و وارشۆ لەم لاشەوە لەگەڵ موسڵ و تورکیا لەگەڵ بەغداد دەستی پێکرد.

٨ـ کەتیرە: صمغ. جگە لە کەتیرە جۆرێکیش هەیە (جەوی) پێ دەڵێن.

٩ـ مازوو: بۆ ڕەنگ و بۆ خۆشکردن بەکار دەهێنرێت.

١٠ـ لەمە نەگەیشتم، ئیسحاقە فەنی مەبەستی چییە، ئایا مەبەستی گواستنەوەی شتومەکە بە(قیتار) کە ئەو وەختە تا کەرکوك بوو؟

١١ـ مەبەسی لەو خانووەی ماڵی عەلەکەیە لە گەڕەکی دیانەکان.

١٢ـ ئاڵتون کۆپری لەسەر زێی بچووکە (زێی کۆیە، زابی خواروو، ئەلزاب ئەلصەغیر) لەوێوە وەختی خۆی شتومەکی زۆر لەجیاتی کاروانی ولاّخ، بە کەڵەك دەگوێزرایەوە بۆ بەغداد، هەرچەندە ئەم ڕێگایەش مەترسی نقوومبوون و ڕێگری ناو ئاوی هەبوو، بەڵام هێشتا لە کاروانی ولاّخ ئاسان تر دەگەیشت(١٣) واتا لەم کاتەدا ئاڵوگۆڕی شتومەکی بازرگانی لەگەڵ بەغدا دەستی پێکرد.

١٤ـ خزمەتی ئەم پیاوە زۆری لەسەر نووسراوەو زۆر وتراوەو دوویات بۆتەوە. کە ئەمە بریتییە لە پێزانین و بەرزبپاوانینی خەڵکی سلێمانی بەرامبەر بەم پیاوچاکە هەر لەسەر ئەو بیروبڕوایەش کاتێك کە (جەمال بابان) لە سلێمانی سەرۆکی شارەوانی بوو شەقامەکەی لای گەڕەکی دیانەکانی ناونا شەقامی کەریمی عەلەکەو (قەشە یوسف پەری) کرد بە ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی.

١٥ـ ئەمەیە خزمەتی مرۆڤایەتی، لەکاتێکی واقات وقڕیدا بەبێ چاوەڕێی هیچ سوودو پاداشتێك ئەم خزمەتە کەم کەس کردوویەتی، بۆیە پێویستە هەیکەلێك بۆ خواجە کەریمی عەلەکە لەلایەن دانیشتووانی شاری سلێمانی و لەلایەن شارەوانییەوە پێکەوە دروست بکەن.

١٦ـ کە شێخ مەحمود لە هندستانەوە هێنرایەوە بۆ سلێمانی بۆ جاری دووەم، لە (١٩٢٢/٩/٣٠)گەیشتە ناوشارو تۆپ ئاگردرا کە ئەوە بە دەستپێکردنی حوکمی دووەم جاری شێخ دادەنرێت.

١٧ـ ئەم هەڕەشەیە بە بەیاننامە بوو کە بە فڕۆکە بەسەر شارا فڕێ درایە خوارەوە، لە (٢٦ شوباتی ١٩٢٣)دا داوایان لە شێخ و دانیشتوانی شارکرد کە سلێمانی چۆڵ کەن دەگینا بۆمبارددومان دەکرێ، پێش ئەوەش سمایل خانی سمکۆ بە ئاگاداریی و ڕازیبوونی شێخ مەحمود بەناوی زیارەتی مەرقەدی کاک ئەحمەدی شێخەوە هاتبووە سلێمانی، کە ئەمانە هەمووی ئەنجامی تێکچوونەوەی شێخ مەحمود بوون لەگەڵ ئنگلیزا. سمایل خانی سمکۆ سلێمانی چۆلکردو شێخ و دەستەودایەرەی خۆیان گەیاندە ئەشکەوتی جاسەنە.

لە ئەنجامداو لە ڕۆژی (٤ مانگی مارتی ١٩٢٣)دا دەستکرا بە بۆمبارانی سلێمانی. لەوەدابوو کە ماڵی (حاجی عارف بەگی عەلاف) بەرکەوت و دوای ئەوە لەشکری ئینگلیز هاتنەوە سلێمانی و دەستیانکرد بە تۆڵەسەندنەوە. دوای ئەوە لەشکری شێخ و عەشایەر لە ڕۆژی (یانزەی تەموزی ١٩٢٣)دا دایانەوە بەسەر سلێمانیاو ئینگلیزەکانیان دەرپەڕانەوە، بەمجۆرە حوکمی شێخ نزیکەی ساڵێك دەوامی کردەوە.

١٨. مەبەسی لە ئەحمەد (حەمدی) ساحیبقرانی شاعیری بەناوبانگە.

١٩ـ مەبەسی لە شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی باوکی خوالێخۆشبوو مارف بەرزنجی پارێزەرە.

٢٠ـ بۆردومانەکە هەرکرا. سەیری پەروێزی(١٧) بکە.

٢١ــ چەمچەماڵ لەپێشدا (لەسەردەمی عوسمانیا) لەسەر سلێمانی بوو لە دامەزراندنی حوکمی نیشتمانی مەلیکی خرایە سەر کەرکوك، لەم دواییەدا خرایەوە سەر سلێمانی و تا ئێستاش هەروایە.

٢٢ـ سەیری پەراوێزی(١٧) بکە.

٢٣ـ دەبێ بە تۆمەتی سیاسی برابێ بۆ کەرکوك و لەدواییدا بە کەفالەتی خواجە کەریم بەربوو‌بێت.

٢٤ـ سەیری (تێبینی) سەرەوە بکە.

٢٥ـ لەڕاستیدا ئەو برایانەمان وشەی (گاور) یاخود گەرەکی گاورانیان لاخۆش نییەو بەلای ئەوانەوە ئەو واتایە نابەخشێ کە ئێمە مەبەستمانە، واتا برا (مەسیحییەکان) هەرچەند ئەم شتە بلاویۆتەوەو ڕۆیشتووە، بەلام پێویستە ئێمە ڕێزی هەستی ئەو برایانەمان بگرین، ئەوەی ئەوان پێیان ناخۆشە لێی دوور کەوینەوەو بەکاری نەهێنین و لە هەمووی گونجاوتر (دیان)ە کە لە هەولێرو کۆیەو بەرەوژووورتر هەموو ئەم وشەیە بەکاردەهێنن. ئەی ئێمە بۆچی وەک ئەوان نەکەین؟

# نموونه‌ی ئافره‌تی ڕه‌نجكێشی كورد

**ئامه‌ی چه‌قاله**

قه‌زوانی سوێر، چه‌قاله‌ی سوێر، گوێزی سوێر. به‌ كۆلانه‌كانی سلێمانیدا ده‌گه‌ڕا، گۆچانه‌كه‌ی به‌ده‌سته‌وه‌، له‌دارو دیواری ده‌پاراست. شته‌ سوێره‌كانیشی یه‌كه‌ یه‌كه‌ ده‌كرده‌ توره‌كه‌ی جیاجیاوه‌و هه‌مووی ده‌كردنه‌ چاروكه‌یه‌كه‌وه‌و ڕاست و چه‌پ له‌شانی قایم ده‌كرد، ئه‌گه‌ر منداڵێك دوای بكه‌وتایه‌ بۆ بایی پولێك قه‌زوان به‌زه‌بری گۆچانه‌كه‌ی ده‌ستی خۆی ده‌دایه‌ به‌ر به‌رۆچكه‌یه‌ك یا ناو ده‌رگای ماڵێك كۆڵه‌كه‌ی داده‌گرت پیاڵه‌یه‌كی له‌ توره‌كه‌ قه‌زوانه‌كه‌ی ناو شاڵینه‌كه‌ وه‌رده‌دلو په‌لی ده‌كوتا بۆ گیرفان یان كۆشی منداڵه‌كه‌و تێی ده‌كرد. ئنجا به‌ده‌ستیشی چه‌ند ده‌نكێكی تری ده‌كرده‌ سه‌ری و ده‌یوت: ئه‌مه‌ش خاترانه‌كه‌ی.

جارجار كه‌ هه‌ندێك منداڵی چوختی ده‌یانویست دزی له‌ توره‌كه‌كانی بكه‌ن، گورج هه‌ستی پێده‌كرد، ئیتر ئه‌و منداڵه‌ی له‌به‌رچاو ڕه‌ش ده‌بوو، له‌ دوای ساڵێك تووشی بووایه‌وه‌ به‌ ده‌نگیدا ده‌یناسییه‌وه‌ پیاڵه‌یه‌ك قه‌زوانی به‌ ڕوپێیه‌كیش پێ نه‌ده‌فرۆشت.

باجی ئامینه‌ پێش شه‌ڕی گه‌وره‌ی دووهه‌م، كه‌ منیش یه‌كێكبووم له‌وانه‌ی شتمان لێده‌كڕی، ته‌مه‌نی شه‌ست ساڵ ده‌بوو، سه‌ری سپی بووبوو، هه‌رچه‌نده‌ جارجار خه‌نه‌شی تێده‌گرت، ده‌یوت: "بۆ چاوم باشه‌." چاویشی كوێربوو، به‌ڵام پووچ نه‌بوو ده‌یوت: جارجار گڵ ده‌كات به‌ گڵه‌سه‌ر له‌ حه‌مام و به‌خه‌نه‌ ژانه‌كه‌ی ده‌شكێ.

لەساڵێکدا شەش مانگی زیاتر بەڕۆژو دەبوو، سەریشی بچووایە نوێژی نەدەچوو، خەڵك لەویان دەپرسی.. "ئەری باجی ئامینە نوێژی نیوەرۆ بەسەرچووەو نوێژی عەسر بووە؟"

ئەویش لە وەڵامدا دەیوت:" ئەوەندەی نەماوە، ئەگەر دەستنوێژت نییە بیشۆ تا ئەوسا کاتی نوێژ دێت." ڕاستیشی دەکرد ئەوەندەی نەدەبرد لە مزگەوتەکەی نزیکمانەوە مەلا دەنگی لێ بەرز دەکردەوەو بانگی عەسری دەفەرموو. باجی ئامینە وەك کوێر بوو لوتیشی شکابوو، بۆیە لەقسەکردندا (گن) بوو واتا لووتی گیرابوو، خەڵك وایان دەزانی چڵمن و پیس و پۆخڵە، بەلام لەڕاستیدا وانەبوو، بەڵکو ژنێکی پاکوتەمیزو ڕێکوپێك و نورانی بوو. جگەلەوەی ئافرەتێکی بێ تەماح و چاوی لەماڵی کەسەوە نەبوو. ئەوەی بە ڕەنجی شانی خۆی بەو کوتەکوت و سوڕانەوەیە بە کوڵانەکاندا پەیدای نەکردایە دەستی بۆ کەس درێژ نەدەکردو داوای یارمەتی لە کەس نەدەکرد. هەر شتەی لەوەرزی خۆیدا دەفرۆشت، جاری واهەبوو گوێزی دەفرۆشت:

های گوێز.. گوێزی دارەقیتەڵەیە ئەمڕۆ.. تامی شەکرە سێونەدا... جارویار مزرە سێوی خۆمانی دەفرۆشت، هەروەها ترۆزی دێم کە لە عەربەت و دەشتی شارەزوورەوە دەیانهێناو فەریکە نۆك، ئەم شتانەی هەر بەپارە نەدەفرۆشت، بەڵکو بەنان و ساوەرو برنج و نیسك و نۆکیشی... دەدان.

لەکاتی زستاندا ئامەی چەقالە سەغڵەت دەبوو، نەیدەتوانی بەو سەرمایە کە کوڵانەکانیش هەموویان قوڕو چڵپاو بوون بسوڕێتەوە، هەرگیز بەبیریشیدا نەدەهات سواڵ بکات، یاخود دەست بۆ ئەم و ئەو پان بکاتەوە، لەبەرئەوە دەچوو لەبەر دەرگای حەمامێکدا، یاخود ماڵێکی باشدا کە قسەنەکەن دادەنیشت و شتی دەفرۆشت ئەوەی باش بوو تەنها باڵبوو کەسی بەملەوە نەبوو، واتا هەر خۆی بوو،

خێرەومەندێك لەژێر خانێکی ماڵەکەیاندا داڵدەی دابوو، بەو ڕۆژگارە دوعای خێری بۆ دەکردو ناوی بەباشی دەبرد، لە خوا دەپاڕایەوە کە وێنەی زیادکات.

لەبیرمە هەرچەند لێیان دەپرسی.." باجی ئامینە تۆ خەڵکی کوێیت و کەسوکارت کێن؟ یاخود لە چیەوە وات لێهاتووە؟ دەیوت:" سەجەرە خوێندنەوە پولێك ناهێنێ، نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لەخوانە." ئنجا دەیوت:"هەر خوا لە دەست و قاچدا زەلیل و کەفتەکارم نەکات تاکو هەناسە لە قەفەسی سنگمدا بێت سەر بۆ کەس شۆڕناکەم." هەر بەم جۆرە لەکاتی ژیانی خۆیدا مشوری گۆڕو کفن و سابون و کلاّفە دەزووشی خواردبوو، هەموویانی ئامادەکردبوو، بۆئەوەی کە مرد ئەوساش نەبێت بە ئەرك بەسەر خەڵکەکەوەو منەتی کەس هەڵنەگرێت. دەك هەزار ڕەحمەت لە گۆڕت باجی ئامینە بۆ خۆت و غیرەتت.

# ئاڵوگۆڕی نامە لەگەڵ (شێخی خاڵ)دا

بنەماڵەی خاڵ، ڕەوت و ژیانی شێخ محەمەد خاڵ و نووسین و کتێبەکانی. کتێبخانەکانی سلێمانی و کتێبخانەی بابانەکان.. (وقد اصبحت الان كباز تسقط ريشه له حسرات كلما طار طائر).

شێخی خاڵ لە دوورەوە:

ساڵەکانی (١٩٤٧-١٩٥٠) قوتابی کۆلێجی ماف بووم لە بەغدا. ئەوسا ئێستگەی ڕادیۆی کوردی گەنجی وەك ئێمەومانانیان ڕادەکێشا بۆ هاتوچۆی ئێستگە تا شتیان بۆ بخوێنینەوە. منیش کە لە ئێستگە دەستم پێکرد کە ئەوسا (دار الاذاعة)یان پێدەوت. وتارێکی خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی خاڵم خوێندەوە کە لە (گەلاوێژ)دا نووسیبووی بەناوی (کۆشی دایك)ەوە کە زۆرم لا جوان بوو، دوای هەندێك دەستکاری لەلایەن خۆمەوە، هەروەها کاربەدەستانی ئەوسای ئێستگەش زۆریان پەسەند کرد. ئیتر بەوە زیاتر شوێنم خۆشکردو پێم لێنەبڕین تا (حقوق)م تەواوکرد. لە بریتی هەر وتارێك سێ دیناریان دەدا، کە بۆ ئەو ڕۆژە کەلێنێکی باشی دەگرت لە کەموکوڕی ژیانی قوتابییەکی دەرەوە کە لەسەر حسابی خۆی بخوێنێ و لە (بەشی داخلی)دا نەبێت وەك قوتابی دانشگاکانی تر.

هەر لەو ڕۆژەوە ڕێزو خۆشەویستی شێخی خاڵ لە دوورەوە لە دڵ و مێشکما چەکەرەی کرد... تا وردە وردە دوای دەرچوونم لە دانشگاو دامەزرانم بە فەرمانبەر لە ناحیەکانی سلێمانیاو لە ڕێگای نووسینەکانمەوە لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ئەوسادا، لەگەڵ شێخی خاڵدا لەیەك نزیك کەوتینەوە.

شێخی خالّ لە نزیکەوە:

کە هاتمە بەغداو هێجگار لە حەفتاکاندا کە ئەمینداری کۆڕی زانیاری کوردبووم و شێخی خالّ هاتوچۆی دەکردین بەبۆنەی ئەندامیەتییەوە لە کۆڕداو بەبۆنەی نووسینەکانی و چاپکردنی بەرهەمەکانی، ئیتر کەوتینە ئەوەی دەستی یارمەتی ئەدەبی و زانستی بۆ یەك دریژکەین، بەلاّم ماوەی دەستی ئەوی بەرێزو ماوەی دەستی کورتی بەندە وەك ئاسمان وریسمان بوو.

کە من بکەوتمایە سەر فاکوفیکی کتێب نووسین و باس و وتارئامادەکردن، شتێکم نەزانیایە هانام بۆ دەبرد، ئەگەر لە بەغدا بووایە زۆر بە دەنگمەوە دەهات و لە سلێمانی بووایە نامەم بۆ دەنارد، ئەویش هەربەو تێکۆشان و سووربوونەی خۆی بەبێ دواکەوتن یارمەتی دەدام وچیم داوا لێبکردایە بۆی دەنووسیم و بۆی روون دەکردمەوە.

ئەو نامەیەی لێرەدا بلاّوم کردۆتەوە ئەوەیە کە هەڵمگرتووەو بەداخەوە چەند نامەیەکیشی فەوتان ئەگینا هەشت نۆ نامەی بۆ ناردم، هەتا دوا نامەی کە چاوی کزبوو، دەستی بە قەڵەمەکەوە دەلەرزی هەر زۆری لە خۆی دەکردو ئەگەر نەیتوانیبێ ئەو باسانەی داوام لێکردبوو بۆم بنێری بەدەستی لەرزۆك و چاوی کزەوە وەلاّمی دوانامەی داومەتەوە دەفەرموێ: "وقد اصبحت الان کباز تساقط ریشە لە حسرات کلما طار طائر." هەزار فاتیحاو رەحمەت و هەزار ئەوەندەش چەپکە گوڵی جوان و رازاوە بۆ گیانی خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی خالّ و بۆسەر گۆڕی پیرۆزی.

کورتەی ژیانی شێخی خالّ و نووسینەکانی:

لە هاوینی (١٣٣٢ ك) بەرامبەر(١٩١٤ ز) باوکی بەگەنجی کۆچی دوایی کردووە، بۆیە لای باپیری دەستی کردووە بە خوێندنی کتێبە سەرەتاییەکان لە عەرەبیدا وەك (عواملی جورجانی لە نحوا، تصریفی زەنجانی و سعدینی لە صرفا). لە پاشا لای (شێخ جەلالی قەرەداخی) ئەم کتێبانەی خوێندووە:

(اظهار لە نحو)دا، وضوح و استعارەی ملا ابو بەکری میر ڕۆستەمی، ئنجا دەست دەکات بە خوێندنی (جامی) دوای ئەو بە (سیوطی) لە نحوا، ئنجا ئیساغۆجی و فناری لە منطقدا، کفایەی مەلا عبداللەی بێتوشی لە شرحی منهج لە فقەدا.

لەم ماوەیەدا لەگەڵ خوێندنی ئەم کتێبانەدا زۆریشی لە گوڵستان و بوستانی شێخی سەعدی و مەسنەوی جەلال ئەلدینی ڕۆمی و دیوانی کلیمی هەمەدانی خوێندووە، هەروەك لە شەرعدا مەنهەجی نەوەوی لای باپیری خوێندووە. دوای ئەمانە هەموو ڕۆژێك چووە بۆ خانەقای حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی و لەکۆڕی زانین و زانیاری شێخ عومەری قەرەداخیدا دادەنیشێت، یا دەرسی دەخوێند، یا گوێی لە دەرسی فەقێکانی تر دەگرت تا نیوەڕۆ ئنجا دەهاتەوە بۆ مزگەوتی خۆیان، دەرسی دەوتەوە بە فەقێکانی خۆی تا ئێوارە.

حەوت ساڵ لە خزمەت شێخ عومەری قەرەداخیدا خوێندوویەتی و لەم ماوەیەدا ئەم کتێبانەی خوارەوەی خوێندووە: (گلنبوی ئاداب) بە حاشیەی پێنجوینی و وابن ئەلقەرەداخییەوە. لە (علمی ئاداب و اصول الفقە)دا. عەبدوڵلا یزدی بە حاشیەی پێنجوینی و گلنبوی برهان بە حاشیەی پێنجوینی و ئبن ئەلقەردلخییەوە لە عیلمی مەنتیقدا. (رسالەی لزومیە) بە حاشیەی پێنجوینی و ئبن ئەلقەردلخییەوە. (شەرحی عەقائد) بە حاشیەی خیالی شەرحی مەولانا خالدی نەقشبەندییەوە لەسەر خیالی لە عەقائدا. (جمع ئەلجوامع) بە حاشیەی پێنجوینی و ئبن القرەدلخیەوە لە اصول الفقەدا. (شرح تەهذیب ئەلکەلام) بە حاشیەی پێنجوینی و ئبن ئەلقەرەداخیەوە لە عیلمی کەلامدا. (فرائض شەرح مەنهج) لە تەقسیمی میراتدا.

لەدوای خوێندنی ئەم عیلمانە ئنجا چوتە خزمەت (مەلا حسێنی پیسکەندی) دوو ساڵ لە خزمەتیا ئەم کتێبانەی خوێندووە: (تحفە)ی (ئبن حجر) لە فقهی شافعیدا زۆر بەوردی ئنجا (تەشریح)ی بەهائەدین عاملی خوێندووە. لەساڵی (١٩٢٨)دا ئیمتیحانی تەدریسی داوە لە مەجلسی عیلمی ئەوقافدا و بووە بە مودەریسی ڕەسمی

مزگەوتی خۆیان (کە مەشهورە بە مزگەوتی حاجی شێخ ئەمینی خاڵ). لەو ساڵەوە ئەم زانایە هەر خەریکی دەرسوتنەوەو نووسین و تەئلیفە تا ئەمرۆ.

لە رۆژی (٢٩/١٢/١٩٣٩)و بووە بە قازی لە دادگاکانی عێراقاو قازێتی لە چەمچەماڵ و هەڵەبجەو سلێمانی و کەرکوك و موسڵدا تا ئەیلولی (١٩٦٢) ئنجا بووەبە ئەندامی تەمیزی شەرعی سنی لە بەغدا.

دوای هەڵگرتنی تەمیزی شەرعی بوتەوە بە قازی سلێمانی تا لە (تەمووزی ١٩٦٧)دا نیشتەجێ کراوە.

ئەم زانایە هەر لەگەنجییەوە گیانێکی کوردایەتی بووەو لەگەڵ کوردی نووسینا خەریکبووەو کەس نەبووە بچێتە لای و بانگێکی کوردایەتی بە گوێچکەیا نەدلبێ.

لەم ماوەیەدا ئەم تەئلیفانەی کردووە ئەم کتێبانەی نووسیوە وا یەك بەیەك ناویان دەبەین بەپێی مێژووی نووسینیان.

١ـ تەفسیرێکی کورت، بەکوردی لە جزمی(عم)و لەساڵی (١٩٥٣)دا لە چاپخانەی ژیان لە سلێمانی بەسەد لاپەڕەی گەورە لەچاپ دراوە.

٢ـ مەولوودنامەی نەوئەسەر یا تأریخی پێغەمبەر بەکوردی لەساڵی (١٩٣٧) بە (٤٢)لاپەڕە لە چاپخانەی ژیان لە سلێمانی لەچاپ دراوە.

٣ـ فەلسەفەی ئاینی ئیسلام بەکوردی لەساڵی (١٩٣٨) بە (٦١)لاپەڕە لە چاپخانەی ژیان لە سلێمانی لەچاپ دراوە.

٤ـ ژیانی موفتی زەهاوی بە کوردیی لەساڵی (١٩٥٣)بە (١٤٤) لاپەڕە لە چاپخانەی (معارف) لە بەغدا لەچاپ دراوە.

٥ـ تەفسیرێکی نەختێ دوورودرێژ لە سورەی(فاتحە) بە کوردی لەساڵی (١٩٥٥) بە(٣٤) لاپەڕە لە چاپخانەی معارف لە بەغدا لەچاپ دراوە.

٦ـ پەندی پێشینان. کۆکردنەوەو ڕاستکردنەوەو ڕیزکردن و مەبەستلێدانەوەو چیرۆک بۆ نووسین یان بەکوردی (١٣١١) پەند بە (١٨٨) لاپەڕە لەساڵی (١٩٥٧) لە چاپخانەی معارف لە بەغدا لەچاپ دراوە.

لەساڵی (١٩٧١)دا دووبارە پەندی پێشینان لەچاپ درایەوە، بەڵام ئەم جارە بوو بە (٣٨٩٣) پەندو بە (٥٠٦) لاپەڕە کە بەڕاستی ئەمجارە گەورەترین کەلەپوری وێژەیی کوردی دەرچوو.

٧ـ ژیانی شێخ عەبدوللای بێتوشی بەعەرەبی بە (٣٠٤) لاپەڕە ساڵی (١٩٥٧) لە چاپخانەی معارف لە بەغدا لەچاپ دراوە.

٨ـ فەرهەنگی خاڵ کە چوار بەرگە.

أـ جزمی یەکەمی ساڵی (١٩٦٠) لە چاپخانەی کامەرانی لە سلێمانی لەچاپ دراوە.

بـ جزمی دووهەمی ساڵی (١٩٦٤) لە چاپخانەی کامەرانی لە سلێمانی لەچاپ دراوە.

جـ جزمی سێهەم.

دـ جزمی چوارەم.

ئەم دوو جزمە لەم دواییەدا لەچاپ دران.

٩ـ مێژووی ئەفراسیاب پاشای کوڕی عەلی پاشای والی بەسرە، کە بەعەرەبی نووسراوە ساڵی (١٩٦١) کۆڕی زانیاری عێراق لەچاپی داوە.

١٠ـ ژیانی (شێخ مەعروفی نۆدێ) کە بەعەرەبی نووسراوە بە (٢٠٠) لاپەڕە لەساڵی (١٩٦٣)دا لە چاپخانەی (تمدن) لە بەغدا لەچاپ دراوە لەژێر ناوی(الشیخ معروف النودهی البرزنجی).

١١ـ المؤنثات السماعیە، کە بەعەرەبی نووسراوە بە(٥٩) لاپەڕە کۆڕی زانیاری عێراق ساڵی (١٩٦٧) لەچاپی داوە.

١٢ـ جزمی یەکەم لە تەفسیری خاڵ بەکوردی، ساڵی (١٩٧٠) لە چاپخانەی (ئەسعەد) لە بەغدا لەچاپ دراوە.

١٣ـ جزمی دووهەم لە تەفسیری خاڵ بەکوردی بە(٢٠٠) لاپەڕە ساڵی (١٩٧٢) لە چاپخانەی کامەرانی لە سلێمانی لەچاپ دراوە.

١٤ـ جزمی (٢٨، ٣٠)لە تەفسیری خاڵ، ئامادەی چاپن.

١٥ـ ناڵەی دەروون کە چوار جەلدە سیانیان بەکوردی و چوارەمیان بەعەرەبی، هەموو وتاری ویژەیی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئاینی کە زۆریان بڵاوکراونەتەوە، لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراقداو زۆریشیان هێشتا بڵاونەکراونەتەوە.

١٦ـ حاشیەو پەراوێزی بەعەرەبی بەسەر حاشیەی مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوینی لەسەر گلنبوی برهان لە مەنتیقدا کە چاپ نەکراوە.

١٧ـ حاشیەو پەراوێزی بەعەرەبی بەسەر پێنجوینی بەسەر گلنبوی ئادابەوە کە چاپ نەکراوە.

١٨ـ البیتوشی: باسی ژیان و خوێندن و نووسینەکان و شیعرەکانی (مەلا عەبدوڵلای بێتوشی)یە بەعەرەبی. ساڵی (١٩٥٨) لەچاپخانەی (المعارف) لە بەغدا لەچاپ دراوە.

١٩ـ موفتی زەهاوی. ژیانی (محەمەد فەیزی زەهاوی) (باوکی جەمیل صدقی زەهاوی) موفتی گەورەی عێراق. ساڵی (١٩٥٣)لە چاپخانەی (المعارف) لە بەغدا لەچاپ دراوە.

٢٠ـ پێشکەشکردن و ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی کتێبی (کنز اللسن المکنوز فیە ستە السن) دانانی زانای بەناوبانگ (شێخ ئەحمەد فائزی بەرزنجی)، (ئەم کتێبە شتێکی گەلێك نایاب و وردو جوان و پڕ لە هونەری زمان و ئەدەب و زانستە). ساڵی (١٩٨٠) لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد لەچاپ دراوە.

٢١ـ مقالات– واتا نووسینەکانی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانا بەکوردی و بەعەرەبی.

ئەوی دەیەوێ زیاتر لە بابەت ئەم پیاوە بەڕێزەوە بزانێ سەیری کتێبی (الشیخ محمد الخال– مفسراً) کە لەلایەن مامۆستا (عومەر عەلی محەمەد)ەوە نووسراوەو ساڵی (٢٠٠٥) لەلایەن چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە لەچاپ دراوە.

خاوەنی تەرجمە لە (١٩٥٤/٢/٦)وە ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراقی و هەروەك لە کۆڕی زانیاری کوردا ئەندام بوو.

## کتێبخانەکانی سلێمانی و ناوچەکەی

سلێمانی لە زۆرکۆنەوە بگرە لەسەرەتای ئیسلامیەتییەوە پایتەختی زانین و زانیاریی و زانستی و کانگای زاناو داناو پێشەوایانی ئاین بووە. یەکێك تەماشای (معجم البلدان)ی (یاقوتی حەمەوی) بکا دەزانێ کە گەلێك خوێندەوارو بزان و شاعیرو بنووسی تیا هەڵکەوتووە، هەر زانایەك کتێبخانەیەکی دەستنووسی بووە. ئنجا زۆر یا کەم، بەڵام لەناو ئەم کتێبخانانەدا کتێبخانەی وای تیابووە کە لە خانەوادەی گەورەوە ماوەتەوە، بە دەیەها جەڵد کتێبی دەستنووسی تیابووە کە هەر کتێبێك لەو کتێبانە ئەگەر بکەوتایەتە مەکتەبەیەك لە مەکتەبەکانی ڕۆژهەڵات یا ڕۆژئاوا لە زێڕو زیو دەگیران و بە زنجیر دەبەسترایەوە نەك بدزرێ یا پەڕەیەکی لێبکرێتەوە.

یەکێك لەو کتێبخانانە (کتێبخانەی حاکمانی بەبە)بوو لە قەلاچوالان کە دواتر هێناویانەتە سلێمانی و لەمزگەوتی گەورە دایاننناوە، ئەم کتێبخانەیە بگرە پێنج تا شەش هەزار جلد کتێبی دەستنووس بووە، کتێبی وایان تیابووە بۆیە کارو زەڕکفتکارییەك بووە کە مەردوم لە چاوپێکەوتنی سەرسام و سەراسیمە بووە !. ئەم کتێبانە بەشی زۆریان دەستنووسی کۆن بوون. واتە لە سەدەی پێنجەم، شەشەم حەوتەم، هەشتەم، نۆیەم یا دەهەمی کۆچییەوە نووسراونەتەوە. هەندێکیشیان دەستنووسی موئەلیف بوون وەك (منهاج) کە بەدەستوخەتی ئیمامی نەوەوی و لەو مەکتەبەیەدا بووە.

ئەم کتێبانە لە عیلمی (تەفسیر، ئسوڵی تەفسیر، حدیث، ئسوڵی حەدیث، فقە-ئسوڵی فیقە، کەلام، عقائد، حکمەتی منتیق، معانی، بیان، بدیع، نحو، سرف، عروز، حساب، هەندەسە، عیلمی فەلەك و تەئریخ) جگەلە دیوانی شیعرو شەرحی هەموو جۆرە دیوانێك.

ئەم کتێبانە زۆربیان تەئریخی و لە پێستی ئاسک نووسرابوون. ئەم کتێبانە تا کۆچی دوایی کاك ئەحمەدی شێخ لە مزگەوتی گەورەدا. مابوون دوای کۆچی ئەو، هەریەکێك لە کورەزاکانی وەك (شێخ سەعیدو سەید عومەرو سەید حەسەن و سەید ئەحمەد نەقیب و شێخ مستەفا مفتی)و گەلێکی تریان، هەریەکێك چوارسەد تا پێنج سەد جلد کتێبیان بردووە کە بۆ جوانی لە دیوەخانی خۆیانا دایانناوە تا هاتنی ئینگلیزو گرتنی شێخ مەحمود ئەو حەلە کە مالی شێخەکان تالان کرا، هەرچی کتێبی مالە شێخەکان بوو هەمووی کۆمەل دەکراو ئاگری تێبەردەدرا، ئێستا دوو سەد جلدێك کتێبی دەستنووس لە مزگەوتی گەورە ماوە، هەرچی بیبینیّ تێدەگا کە ئەو کتێبخانەیە لە وەختی خۆی گەورەترین کتێبخانە بووە نەك لە سلێمانی، بەلکو لە رۆژهەلاتی ناوەراستا.

لەپاش کتێبخانەی بابانەکان ئنجا کتێبخانەی تەوێلەو بیارەو قەرەداغ و شێخ محەمەدی خال و مەحوی و حاجی مەلا عەلی مەلا عوسمان و حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکلی زادەو سەید ئەحمەد فائزی بەرزنجی دێن.

لەدوای کۆچی شێخ حسام ئەلدین کتێبخانەکەی تەوێلە فەرهود کرا، هەر یەکێك باوەشێکی لیّ برد تاهیچی نەما. کتێبخانەی قەرەدلخیش سوتا، بەلام کتێبخانەی بیارەو شێخ محەمەدی خال و شێخ قەرەدلخی و حاجی مەلا سەعیدو هەندیّ لە کتێبخانەکەی (مەحوی و حاجی مەلا عەلی و ئەحمەد فائز) زیانی زۆریان پێنەگەیشت.

# دوو سەعات لەگەڵ (عەلی سیدۆ گەورانی)دا (فەرهەنگی نوێ)و (لە عەممانەوە بۆ عەممادییە)و کۆمەڵەی سەلاحەدینی خێرخواز لە عەممان

١

کە قوتابی بووم لە قوتابخانەی سلێمانی، جار جار دەچووم هەندێ کتێبم لە کتێبخانەکەی ماڵی باپیرم دەردەهێنا. لەوانەی کە سەرنجیان ڕادەکێشام، هەندێکیانم تا دوایی دەخوێندەوەو ئەوانی تریش نیوەناچڵ. ئەو کتێبانەی کە سەرنجیان ڕادەکێشام و لە دوایشدا دەستم بەسەرا گرتن و ئێستا لە کتێبخانەکەمدان، زنجیرە نووسینەکانی خوالێخۆشبوو حوزنی موکریانی، (ئاوڕێکی پاشەوە)و کتێبەکانی ئەمین زەکی بەگ و کتێبەکەی (عەلی سیدۆ گەورانی) (من عمان الی عمادیە)و هەندێکی تر.

هەر ئەوسا بیرم لەوە دەکردەوە تۆ بڵێی ڕۆژێك لە ڕۆژان نووسەری ئەم کتێبانە ببینم و بە خزمەتیان بگەم؟

خوای من و تۆ کردی ساڵی (١٩٤٥) قوتابی چواری سانەوی بووم، لە نیوەی ساڵدا (١٥) قوتابیان لە یەکەم و دووهەمی هەر پۆلێك و باقیەکەی لە قوتابییە وەرزشەوانەکان و هونەرمەندەکان لەگەڵ (١٥)ی کەرکووك و (١٥) هەولێر بەمیوانی و لەسەر حسابی میری هێنایانین بۆ بەغدا، ئەوە یەکەم جارم بوو بەغدا ببینم لە (مەعهەدی فنون جەمیلە) دایان بەزانین و هەر ڕۆژە لە لایەکەوە دەعوەت دەکراین تاکو جارێکیش خوالێخۆشبووان (وەصی)و (مەلیکی بچکۆلە فەیسەڵی دووەم) بانگیان کردین بۆ (قەسر الرحاب)، کە ئەمەم دووروودرێژ لە شوێنێکی تردا لەمەوپێش بڵاوکردۆتەوە.

مەبەستم ئەوەیە ڕۆژێکیش خوالێخۆشبوو (تۆفیق وەهبی بەگ) بانگی کردین، هەر بە بۆنەی ئێمەوە، گەلێك لە وەزیرەکان و نوێنەرەکان و پیاوە گەورەکانی کوردی بانگ کردبوو، تاکو دەهۆڵ و زوڕناشی هێنابوو بۆ هەڵپەرکێ لە باخە گەورەکەی خانووەکەیدا لە (وەزیریە) کە جەمەی دەهات، لەوانەی کە لەو بانگهێشتنەدا دیمن خوالێخۆشبووان (حسێن حوزنی موکریانی) بە گۆچانەکەی دەستی و پەستەکەکەی بەری و ریشە ماشوبرنجەکەی و مشکییە ریشوەدارەکەیەوە. لەولاوە (ئەمین زەکی بەگ)، بەلام بەداخەوە نیوەی ئەندامی سست بووبوو تووشی (شەلەل) بووبوو، چونکە بۆنەی بانگهێشتنەکەی پێخوشبوو بە کورسیەکەوە هێنابوویان و بەتانییەکیان دابوو بەسەر ڕانیاو گەلێکی تر لە گەورە پیاوانی ئەو سەردەمەی کورد ئامادەبوون کە لەگەڵ زۆربەیاندا وێنەمان گرت.

دوای ئەوە ساڵ هات و ڕۆژگار تێپەڕی، تا مانگی شوباتی ڕابردوو بە ئیشی کچەکەم لەگەڵیا چووم بۆ (عەمان)، لەوێ چوومە خزمەت عەلی سیدۆ گەورانی، کە لەوەپێش ناونیشانیم وەرگرتبوو، ئەمە لە کاتێکدا کە هاوینی ڕابردوو مانگێك لە عەمان مامەوە، لە (شوقە)یەکدا بووین تومەز ماڵی ئەو پیاوە لە تەنیشتمانەوەیەو من پێم نەزانیوە، بۆیە ئەمجارە یەکسەر ماڵەکەم دۆزییەوەو پێش چوونم تەلەفونم بۆ کرد.. یەکسەر خۆی وەڵامی دامەوە، کە خۆم پێناسی لە تەلەفونەکەدا لە وەڵامدا وتی: "من ئێستا نەخۆشم و لەناو جێگادا کەوتووم، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بە هاتنت چاوم ڕوون ئەبێتەوە.." کەچووم بە خۆم و (کارتۆنێکی پڕ لە کتێب، لە نووسینەکانی خۆم و دیوانی هەندێك لە شاعیرەکانمان و بەرهەمەکانی کۆڕی زانیاری کوردو دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی...)، بەلام کە چوومە خزمەتی سەیرم کرد بەداخەوە پیاوێکی نەخۆش و پیر لەناو جێگادا کەوتبوو، تەنها ژنێکی هندی لەلابوو خزمەتی دەکرد، ماڵەکەی لە شوێنێکی خۆشدابوو لە عەمان کە (دوار الخامس)ی پێ دەڵێن نزیك بە (ئوتێل جندول)و (دەرمانخانەی البکر) بانتایی

حەوشەکەیان دوو دۆنم واتا پێنج هەزار مەتری چوارگۆشە دەبوو، بەلأم لەو ژنە هندییە زیاتر کەسی تری لەگەڵدا ناژی و لەدواییدا دێینەوە سەر ئەم رووەی ژیانی.

دوای سلاّو (دەست و مۆچ) کە دانیشتم، بەدەنگێکی نزمی لەسەرخۆ دەنگی مرۆیەکی پیرو ماندوو، یەکسەر خۆی پێشکەش کردم بەوەی سەر گوزوشتەی بنەماڵەو ژیان و پێگەیشتنی خۆی بۆ گێرامەوە، کە ئەمە نزیکەی نیو سەعاتی خایاند، منیش پێنووس و کاغەزم ئامادەکردبوو دەمنووسی، جارجار ژنە هندییەکەی بە (زەنگلێدان) بانگ دەکرد، ئەویش پەیتا پەیتا چاو قاوەو شەربەتی بۆ دەهێنام و زوو زوو دەیوت:" سەرم یەشانی." قسەکانی هەموو بەعەرەبی بوو، بەلاّم کوردی کرمانجی و کەمتریش کوردی ئێمەی جارجار بەکاردەهێنا. فەرمووی لەمەوپێش یەکێك لە کوردەکانی عەقرە هاتوونەتە لام، بەلأم ناوەکەی لەبیرچوویۆوە، کە وتم (دکتۆر نافع عەقراوی) یەکسەر وتی:" خۆیەتی دەم خۆش."

دوای ئەوەی لە باسی خۆی بۆوە وتی:" هەرچەندە سەریشم یەشاندی، بەلأم بۆیە ئەمەم کرد بۆئەوەی لە هەموو سەرێکەوە من بناسیت و فەرموو ئنجا نۆرەی تۆیە." منیش دوای ئەوەی بەکورتی هەندێ شتم لە بابەتی خۆمەوە عەرزکرد، ئەنجا کەوتمە کتێب دەرهێنان لە کارتۆن، هەر شتێکم پێشکەش دەکرد چاوی روون دەبۆوە، دەمان خستەلاوە تا کتێب لە سەریەك کەڵەکە بوون، باشبوو لەو کاتەدا یەکێك لە کوڕەزاکانی هاتن ئیتر ئەو یارمەتی دەداین، لەدواییدا کوڕەزاکەی ناردە کتێبخانەکەی وتی برۆ دوو دانە لە فەرهەنگەکەمی بۆ بهێنە، منیش داوای دانەیەك لە کتێبەکەی پێشووی (من عمان الی عمادیە)م لێکرد، حەزمکرد دانەیەکیشم لەوە لابێت کە بەقەڵەمی خۆی پێشکەشم بکات، بەلأم بەدلخەوە خۆی هەر وشەی (اهداء) لە سەرەوەو لەژێریشەوە ئیمزاو رۆژەکەی بۆ نووسرا، باقیەکەی بە کوڕەزاکەی وت کەپڕی بکاتەوە.. دوای ئەمانە سەیرم کرد ماندوو بووە، دووجار داوام لێکرد کە سەرفرازم بکات لە خزمەتی مەرەخەس ببم، هەر دەیوت جارێ دانیشە، دوای دوو

سەعات سەیرمکرد زۆر ماندوو بووە، ئیتر هەستام و قسەم پێدا کە ئەگەر تەنی دروست بوو و بچمەوە لای، بەلام بۆ دوای دوو ڕۆژ کە تەلەفونم بۆ کردەوە خۆی وەلامی دایەوە، بەحاڵ دەنگی دەردەهات، منیش هەر لەدوورەوە مالاواییم لێکرد، دوای ئەوەی قسەم پێدا کە ئەگەر جارێکی تر هاتمەوە بۆ عەمان بچمەوە خزمەتی، بەلام بەداخەوە دوای ئەوە بە چەند هەفتەیەك جیهانی بەجێ هێشت.

٢

## عەلی سیدۆ گەورانی کێیە؟

عەلی سیدۆ ئەو کەسەیە کە لەم دواییەدا، واتا لەساڵی (١٩٨٥)دا (فەرهەنگی کوردی نوێ- القاموس الكردي الحديث) (کوردی- عەرەبی) دانا کوردییەکەی لاتینییە پێش ئەویش بە (٤٧) ساڵ کتێبە هەرە بەنرخەکەی (من عمان الى عمادیه)ی دانا کە گەشتێکی وردو بەنرخە لە پشکنینی مێژووی کورددا، بۆ ئەم دوو کتێبە بەنرخانە دەگەڕێینەوە، بە درێژی و تەسەلی، بەلام جارێ باسی دانەری ئەم دوو کتێبە دەکەم، باسی ڕەگەزی و پێگەیشتنی... تاکو ئێستای.

ناوی تەواوەتی ئەم پیاوە (عەلی سیدۆ گەورانی کوردی)یە ساڵی (١٩٠٨)لە شاری (عەمان)ی پایتەختی ئوردون هاتۆتە دنیاوە. خۆی لە ڕەگەزدا لە عەشرەتی (دودکان Dodkan)ی کوردییە لەو لقەی کە لە دەشتی (گەوەران Desta Gewran)دایە لە بەینی شاری (دیاربەکر)و (ئەرغەنی) لە کوردستانی تورکیا، ناوی گوندەکەشیان (لغری) یە.

باپیری لەگەڵ هێزەکانی عوسمانیەکاندا لەساڵی (١٨٨٠)دا هاتۆتە شاری (سلط) لە ئوردون. ئەو شارەی کە عوسمانیەکان یەکەم مەرکەزی میرییان تێدا دامەزراند وەك قەزایەك کردیان بە قائمقامنشین، بەلام هەموو پیاوەکانی ئاسایش لە کوردەکان

پێکهاتن. باپیری لە سلط فەرمانی یەزدانی بەجێهێناو لەو کاتەوە بنەماڵەکەی لە ئوردون نیشتەجێن.

عەلی سەیدۆ ساڵی (١٩١٦) لە عەمان لەو قوتابخانەیە خوێندویەتی کە عوسمانیەکان ساڵێك لەوەپێش کردبوویانەوەو خوێندن تێدا بەتورکی بوو. ساڵی (١٩٢٠)چۆتە قوتابخانەیەکی ئنگلیزەکان کە لە شاری (قدس) کردبوویانەوەو بەئینگلیزی تێدا دەخوێنرلو ناوی بە قوتابخانەی (مەتران جوبت) دەرکردبوو کە یەکسەر لەدوابینی چیای (صهیون)دا بوو. بەکورتی قوتابخانەی ئامادەیی لە قدس تەواو دەکات و ساڵی (١٩٢٤ – ١٩٢٥) دەچێتە زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت، تا لەساڵی (١٩٢٨)دا پلەی بەکالۆریۆس لە ڕامیاری و ئابوریدا تەولو دەکات کە یەکەم قوتابی ئوردونی بووە لەو زانکۆیەدلو یەکێك لە هەڤاڵەکانی لەوێدا خوالێخۆشبوو (عەلی حەیدر سلێمان)بوو کە خەڵکی ڕەواندزو وەزیرو سەفیر بوو لە عێراقدا لە سەردەمی پاشایەتیدا.

مامۆستا عەلی ساڵی (١٩٢٩) بە مامۆستای زمانی ئینگلیزی لە قوتابخانەی ئامادەیی عەمان دامەزرا. دوای پێنج ساڵ کرا بە سکرتێری ئەنجومەنی ئامادەیی عەمان. دوای پێنج ساڵی تر کرا بە سکرتێری ئەنجومەنی یاسادانانی ئوردون. دوای ئەوە واتا لەساڵی (١٩٣٨)کرا بە بەڕێوەبەری ئامادەیی شاری (کرك)، دوای ئەوە بە گەلێك قوتابخانەی تردا گەڕاوە وەك لە بەڕێوەبەری ئامادەیی (عەمان)و (سلط)و (اربد) تا ساڵی (١٩٤٨). لەوە بەدواوە گوێزراوەتەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە بە پلەی سکرتێری یەکەم و دوای ئەوە بە (قائم بالاعمال) لە شاری (جدە) دوای سەربەخۆیی ئوردونیش ساڵی (١٩٤٦) لە پلەی وەزیری (مفوض)دا لە ئەنقەرەو شام و سعودیەو یەمەن ئیشی کردووە، تا لەساڵی (١٩٦٣)دا خانەنشین کراوە.

کە باوکی مرد، پارچەیەك زەوی گەورەو بەنرخی لەناوچەی (ام انینە) لە عەمان بۆ بەجێهێشتن کە گەشاوەترین شوێنی پایتەختە، پانتایی ئەو پارچەیە بە تەنها

(٢١٠) دۆنم بووە ئەمیش وەك براگەورە لەگەڵ كەسوكاریا بەشیان كردووە، بۆیە ئێستا لەخوا بەزیادبێ باروبۆخی ژیانیان نەك هەریاشە بەڵكو دەوڵەمەندی تەواون.

مامۆستا سیدۆ گەورانی لەماوەی هەڵسوڕانیشیا لە كاروباری میریدا گەلێك ئافەرینی وەرگرتووە، بەتایبەتی كە لەبواری فێركاری و ڕامیاری (تعلیم و سلكی سیاسی)دا ئیشیكردوە. ئەو ئافەریمانەش ئەمانەن:

١ـ وسام الكوكب الاردنی– لە پلەی دووهەمدا.

٢ـ وسام التربیه الاردنیه– لەپلەی یەكەمدا.

٣ـ وسام الاستحقاق السوری لەپلەی دووهەمدا.

٤ـ وسام الكوكب الساطع لە حكومەتەكەی چینی (تایوان).

مامۆستا عەلی سیدۆ دوو كوڕی هەیە.

یەكەم: دوكتۆر (ئەشرف) پسپۆڕە لە (اعصاب)دا، خوێندنی نوشداری(پزیشكی) لە بەغدا تەواوكردووەو لە لەندەن (اختصاص)ی وەرگرتووەو بۆ گەلێك كۆنگرەی زانیاری و نوشداری لە هەموو لایەكەوە بانگ دەكرێت. ژنەكەی خەڵكی بەسرەی لای خۆمانە. ئەویش چوار كوڕی هەیە دووانیان ماستەریان هەیە لە كارەباو میكانیدا، ئەوانی تر هەر لەبەر خوێندندان.

ئەشرەف لەم دواییەشدان بووبە وەزیری تەندروستی لە ئوردن

دووهەم: مازن (مەزن) قوتابخانەی تایبەتی هەیە هەر لە باخچەی منداڵانەوە (ڕەوزە) تا دەگاتە ئامادەیی (اعدادی). مازنیش دوو كوڕی هەیە هێشتا لەبەر خوێندندان. مامۆستا سیدۆ لەم ماوەیەدا چ بەدانان، یاخود بە وەرگێڕان بێجگە لە كتێبە بەنرخەكەی یەكەمجاری (من عمان الی عمادیە) چەند كتێب و دەستخەتی بەپێزی تری هەیە وەك:

١ـ کوردەکان. نووسینی– حەسەن ارفع. لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە.

٢ـ گەشتێك بەناو پیاوە ئازاکاندا. نووسینی ڕۆژنامەنووسی ئەمریکایی (دانا شمیدت) لە ئینگلیزیەوە وەریگێڕاوە.

٣ـ کۆماری مەهابادی کوردی. نووسینی (ئیجلتۆن)ی ئەمریکایی ئەویش هەر لە ئینگلیزیەوە وەرگێڕاوە.

٤ـ کوردەکان. نووسینی (تۆماس بوا) لە ئینگلیزیەوە وەرگێڕاوەو لە زۆر شوێندا شتی تێدا ڕوونکردۆتەوە. لێرەدا مامۆستا سیدۆ ئەڵێت: ئنجا دێمە سەر باسی کچی مەحمو ئاغای تۆمەریەکی که دانیشتووی یەکێك لە دێهاتەکانی نزیك دیاربەکر بوو لە ناوچەی کوردستانی تورکیا. ئەو خاتوونە بەڕێزەی کە ئەمامی خۆشەویستی زمانی باوویاپیرانی لە گیانما ناشت. هەروەها پێشکەشە بەو میللەتی کوردەی کە زمانەکەی خۆی پاراستووە، وەکو ڕیشەی پتەوی لە مێژوودا داکوتاوە، بەرهەڵستی داگیرکەرانی لە ئەکەدیەکان و... عەجەم و ڕۆمان و بێزەنتییەکان و زۆری تری کردووەو تا ئەمڕۆی هێناوە، لەکاتێکدا کە ئەو دەوڵەتانە زۆریان سەرەونگوون بوون و میللەتەکانیان تێکەڵاو بە گەلانی تر بوون...

بەمجۆرە مامۆستا عەلی سیدۆ فەرهەنگەکەی پێشکەش کردووە، لە پێشەکیەکەشیدا دەفەرمووێ:" ئەوەی پاڵی پێوە نام بۆ دانانی ئەم فەرهەنگە ئارەزووی فێربوونی زمانی باوویاپیرانم بوو، لەکاتێکدا کە تا ساڵی (١٩٣١) یەك وشەم لێ نەدەزانی، ئەوەبوو هەر لەو ساڵەدا هەستام چووم بۆ بەغداو لەوێوە بۆ شارە کوردنشینەکان لە بەشی ژووروی عێراق، کە بەناو هاوڕێکانما لە دێهات و شارەکانی کورد زماندا دەگەڕام و نەمدەتوانی بەکوردی قسە بکەم، ئارەقی خەجاڵەتیم دەردەدا، هەر ئەوەبوو پاڵی پێوەنام کە بڕیار بدەم کوردی فێربیم، بەڵام لەسەر بناغەیەکی زانیارانەی ڕاست و دروست.. ئەو کۆسپەی لە ڕێگا مابوو نەبوونی سەرچاوەبوو، بۆیە ڕوومکردە ئەنکم کە ئەوسا تەمەنی لە سەد ساڵ نزیك بوویۆوە،

بەڵام تابلێی بیرەوەریی تیژو بەهێز بوو، بەمجۆرە ڕۆژی بیست وشەم لێ وەردەگرت و بەرامبەرەکەیم دەنووسی، هەمووی بەپیتی عەرەبی، تاکو هاتمە سەر وشەی (شیر کە ماستی لێ دروست دەکرێ)و (شێر کە درندەی دارستانە) لەمەدا ئیشەکەم لێتێکچوو... بۆیە لەو ڕۆژەوە دەستم دایە نووسینی کوردی بە لاتینی کە زۆر لەبارە بۆ ئەو جۆرە شتانەو بەتایبەتی کە زمانی کوردیش زمانێکی ئارییە.

ساڵی (١٩٣٢) میر (جەلادەت عالی بەدرخان) یەکەم گۆڤاری بەکوردی کرمانجی لە شام دەرکرد، بەڵام بەپیتی لاتینی، بەوە توانیم زەخیرەیەکی باش لە وشەی کوردی کۆبکەمەوە، ئەوەبوو لەساڵی (١٩٣٥)دا نەنکیشم خوا بردیەوە قاپی ڕەحمەتی خۆی، منیش لە عەمان بێکەس مامەوە، واتا کەس نەبوو لە ڕووی زمانەوە دەستم بگرێ ئێستا خوا کوردەکانی تورکیای بۆ ڕەخساندم کە دەهاتن بۆ سەردانی کە سوکاریان لە عەمان کە یارمەتیان دەدام، تا لە شەستەکاندا گەنجێك لە کوردەکانی جزیرەی سوریا (لام وایە مەبەستی لە جزیرەی ئیبن عومەرە- ج. ب) هاتە عەمان ناوی (حەسەن عەبدوڵلا علیکی) بوو، هەر لەوێ دانیشت و کوردییەکەی گەلێك بەهێزبوو، بەشێوەی (بۆتان)یش ئاخاوتنا، ئەو شێوەیەی کە کوردەکان بەشێوەی (قریش)ی دادەنێن بەرامبەر بە زمانی عەرەبی زۆر سوودم لەو پیاوە وەرگرت، دوای ئەوە ڕەوتی زمان لەبەردەمما گەلێك فرلوان بوو، کتێب و گۆڤار بەکوردی لە شام و بەیروت و ئەریڤان و پاریس واشنتەن و بەغدا و شارەکانی کوردستانی باشور لە عێراق دەستیانکرد بە دەرچوون، لەوانە (فەرهەنگی مەهاباد)ی (گیوی موکریانی)و فەرهەنگی خاڵ و (ڕێزمانی کوردی) هی (کەمال بادللی) نوێنەری شاری ئۆرفە (ڕها) لە پەرلەمانی تورکیا، ئینجا کتێبی (گرامەری سون)و کتێبی (فردیناند جوستی) بەئەڵمانی و (الهدیە الحمیدیە)ی (ضیاءالدین پاشای خالیدی).

بێگومان ئەم فەرهەنگە لە کەموکوڕی بێبەش نییە، بەڵام لە ترسی مردن و فەوتانی خستمە ژێر چاپ.

لەبەر دووری عەمان لە کوردستانەوەو لەبەر دەستنکەوتنی کەسێکی وەها کوردیش بزانێ، بۆیە هەر تەنها پشتم بە مامۆستا حەسەن عەبدوڵلای ناوبراوو هەندێ کەس لە فەلەکان لەوانەی کوردییان دەزانی بەست.. بۆیە دەڵێم کەوا ئەم فەرهەنگە لە هەڵە خاڵی نییە. منیش بەشێوەی ڕۆژئاوایی دامڕاشتوەو (بنکە)کەی شێوەی کرمانجی ژووروە، جگەلە وشە بەشێوەو (بنکە)کەی شێوەی کوردەکانی ئێرانی تێدا نییە، لەبەرئەوەی کە سەرچاوەیەکی ئەوتۆم دەستنەکەوت بڕوای پێبکرێت.

دوای ئەم پێشەکییە تکا لە خوێنەر دەکات و بەتایبەتی زمانەوانەکان کە هەڵەکانی فەرهەنگەکەی بۆ ڕاستکەنەوە تاکو لە چاپەکانی ئایندادە ئەویش ڕێکیان بخات. دواتریش سوپاسی کۆمەڵەی سەلاحەدینی خەیری دەکات لە ئوردون کە دەورێکی گەورەیان بووە لە چاپکردنی فەرهەنگەکەدا ئەویش بەرامبەر بەوە نرخی فرۆشتنی فەرهەنگەکەی هەموو پێشکەش کردن، بۆئەوەی بەشداری زیاتر بکات لە کارە بەخێرەکانی ئەو کۆمەڵەیە کە لە دواییدا دەگەڕێینەوە سەری.

ئەنجا مامۆستای بەڕێز زمانی کوردی دەکات بە چوار شێوەی سەرەکی لە سێ ناوچەی کوردستاندا بڵاوە:

١- شێوەی ژوورو (باکور)

٢- شێوەی خوارو (باشور)

٣- شێوەی ژووروی ڕۆژئاوا

٤- شێوەی لوڕو بەختیاری

هەرچی کوردەکانی تورکیاو ڕۆژهەلات و ڕۆژهەڵاتی خوارووی تورکیاو کوردەکانی قەوقاسی خوارو لە کۆمارەکانی (ئەرمینیاو جۆرجیاو ئازربایجان) لە یەکێتی سۆڤێت (مەبەستی پێش هەرەس هێنانیەتی)و کوردەکانی سوریاو لوبنان و ناوچەکانی سنجارو زاخۆو عەقرەو زێبارو عەمادیەو شێخان لە پارێزگای دهۆک و

کوردەکانی ئازربایجانی باکورو رۆژئاوا کوردەکانی لیوای (قوچان)و (بجنورد) لە ئێران، ئەمانە هەموو بەشێوەی باکور قسە دەکەن.

کوردەکانی عێراق خوار خەتی رەواندز بۆ موسڵ و کوردەکانی ئێران خوار (گۆمی ورمی)و خوارووی رۆژهەلاتی تا دەگاتە سنوری ولایەتی (کوردستان)و (بەختیاری، ئەمانە بەشێوەی باشور دەدوێن).

رۆلەکانی ئێلەکانی (دومەلی)، یاخود (زازا – ظاظا) کە لە ناوچەکانی (دەرسیم و پالۆو گەنج و جبلچورو معدن و پیران واکیل و سیورك و بیجار، جیرموك – جرمیك) بەشێوەی سێهەم دەدوێن کە شێوەی ژووروی رۆژئاوایە.

دوای ئەوە شێوەی باشور دابەش دەکات بە سێ لقی گەورەوە:

١ـ شێوەی بابان و سۆران کە لە پارێزگاکانی سلێمانی و کەرکووك و هەولێر لە عێراق و شێوەی موکری و ئەردەلانی و کەلهوڕی لە ئێران شێوەی موکری لە ولاتی (شنو)، (لاجان)، (سابلاخ) (سەردەشت)وە دەگاتە سنوری (میان دواو).. شێوەی ئەردەلانیش لەناوچەکانی (بیجار) (گروس) (جوانرۆ) (بانە)و رۆژهەلاتی گوێ چەمی سیروان.

٢ـ هەورامی و گۆرانی. شێوەی هەورامی لەناوچە شاخاویەکانی هەورلماندا بلاوە، گۆرانیش لەناو (حەقە)کاندا کە ناوچەکەیان نزیك رێگای خانەقین– کرماشان، ئەو دوو شێوەیەش زۆر لە شێوەی (زازا)وە نزیکن کە لە ژووروی رۆژئاوای تورکیادان.

٣ـ شێوەی لوڕو بەختیاری و لەك. کە رۆلەکانی لورستانی گەورەو بچووك بەکاری دەهێنن.

دوای ئەم دابەشکردنە مامۆستا گەورانی پشت بەقسەی هەندێك شارەزایانی بێگانە دەبەستێ دەلێت: "سێرسدنی سمیس (نووسەری کتێبی ئاشور) دەلێت:" کوردی نە لە فارسییەوە هاتووەو نە لێوەی وەرگیراوە، بەلکو زمانێکی سەربەخۆی تەواوە. مێجەر ئەدمۆنسیش دەلێت:" کوردی زمانێکی ئاری تەواوە. تێیدا خاسیەتی خۆی هەیەو لە کۆنەوە پەرەی سەندووە." وە مێجەرسوتنیش دەلێت:" زمانی کوردی زمانێکی سەرلێشێواو نییە لە فارسیشەوە نەهاتووە، بەلکو خاسیەتی

ئاریایی خۆی هەیە کە ئێستاش پاراستویەتی لە کاتێک کە زمانی فارسی ئەو خاسیەتەی ونکردووە."

دوای ئەوە باسی لێچواندنی زمانی کرمانجی و ئەڵمانی و لاتینی هەندێک زمانی سلاڤی دەکات لەبارەی جۆێکردنەوەی قسەی نێر لەگەڵ مێدا.

جگە لەمانە زمانی کوردی زۆر لەبارە بۆ گۆڕین و وشە لێدروستکردن و دانەپاڵی پارچەو وشە بۆ پێشەوە، یاخود بۆ دواوەی ڕستە. وەك Yar خاوەن، کردار (Cotyar) نڤیسیار نووسەر (danyyar) دانیار، دانەر، مۆلف. هەروەها (ber) دژن بەرامبەر پێش) (bernivej) دژی ژەمر.

ئنجا فەرموون بۆ نموونەی هەندێ وشەی ناو فەرهەنگەکە.

المدافع عن مؤخره الجیش: پاشپارێز– pasparez

الاسلاف: پێشینان (pesunan)

شهم، حسن، جیدبهی: (ڕەند) (rind)

خاتمه نتیجه: (سەرئەنجام) serenjam

نزهه: (سەیران) seyran

ستمائه: (شەسسەد) sessad

صرح، حصن: (شورە) Svrhe

تقلیب: (تیکەڵ کردن) Tegilirin

کواو ملابس: (اوتوچی) utici

فرج المرأه: (ڤرچك) vircik

جمر: (کەلەمور) xelamur

قریب: (خزم) xizm

ثقیل اللسان: (زمان گرتو) Zimangirt

خبير اقتصادي: (ئابوری ناس) Aborinas

عالم اقتصادي: (ئابوری زان) Aborizani

ماعز جبلي: (بزنه كێوی) bizinkuvi

مذهب: (بەزێر) bizer

طلب الغيث: (بووكه بارانێ) buka barane

شقائق النعمان: (بوك و زاوا) bukazawa

ثرثرة: (چەنەبازی) Cene bazi

الصفع: (شەپەلدان) Cepildan

طاحونه حجريه: (دەستاڕ) destar

انانيه: (ئەزپەرستی) ezpersti

اوامر، تعليمات: (فەرمان نامه) Ferman name

غلاء، قحط، ثقل، وقار: (گرانی) Girani

اخ في الدين: (هاودین) hevdin

اناخه: (يخدان) Ixandin

يوم الجمعه: (ئەينی) InI

تزوج: (ژنهێنان) Jinanin

مصيب: (كارراست) Kar rast

ارنب: (كەرگوێ، كروێشك) Kergu

ارتداو اللباس: (لەچككردن) Lacik Kirin

ملعقه: (ميلاق، كروچك) melag

هداف: (نيشاندار) nisandar

صملاخ الاذن: (كريشی گوێ) Qirejagoh

* هاوكاری (١٤٤٧)رۆژی (٩ی ئايار ١٩٩٢)

## ٣

## دیسانەوە دوو سەعات لەگەڵ عەلی سیدۆ گەورانیدا

بۆ ئەم فەرهەنگە جگەلە دەم و زمانی خەڵك کەلێی وەرگرتوون مامۆستا سیدۆ سوودی لە گەلێك سەرچاوەی بەنرخ وەرگرتووە وەك (نەوبەهاری ئەحمەدی خانی)و (هدیەی حەمیدیەی زیا پاشای خالیدی)و (ڕابەری گیوی موکریانی و فەرهەنگی مەهابادەکەی)و (فەرهەنگی جگەرخوێن)و (فەرهەنگی ئەورەحمانی زەبیحی)و (فەرهەنگی عەزیز عەقراوی)و گەلێك فەرهەنگی لاتینی و ئەڵمانی و تورکی- بۆ کوردی تر.

ئەم فەرهەنگەی جزوبەندکراوەو بەرگێکی چاك و پاك و قەشەنگی تێگیراوە، لە چاپخانەی (شرکە الشرق الاوسط للطباعة/ مارکا- عمان - اردن) لەچاپ دراوە، هەرچەندە نرخەکەی لەسەر نەنووسراوە، بەڵام سێ دینارو نیوی ئوردونییە، ئێستا لە عەمان لەلایەن کۆمەڵەی سەلاحەدینی خێرخوازەوە دەفرۆشرێ، چونکە قانزاجەکەی بۆ ئەو کۆمەڵەیەیە.

پەرتووکی (من عمان الی عمادیە).

لە عەمەناوە بۆ عەمادیە، یاخود (جولة فی کردستان الجنوبیة).. ئەمە بەنرختریـن مێژووی کوردستانی باشور، یاخود کوردستانی بابان و سۆران و بادینانە ساڵی (١٩٣٩)لە چاپخانەی (السعادە)لە (میسر) لەچاپ دراوە.

مامۆستا عەلی سیدۆ لەو پێشەکیەیدا دەڵێت: "زۆر شت پاڵیان پێوەنام بۆ نووسینی ئەم کتێبە، بۆئەوەی دڵنیابم لەو نووسینانەی لە پەرتووکی ڕۆژئاواییەکان و ئەمریکاییەکاندا کە لە بارەی کوردو کوردستانەوە دەمخوێندەوە، بۆئەوەی ئەو بۆشاییەی لە مێژووی ئیسلام و جوگرافیای ڕۆژهەڵاتی دووردا هەیە تاکو دراوسێکانی کورد بیرێکی ڕاست و ڕەوان لە بابەتیانەوە وەربگرن، چونکە تائێستا نووسینێکی

ئەوتۆ نییە کە باسێکی تەواوەتی ئەم میللەتە بکات، جگەلەمانە ئەوەی بەدوای مێژووی تەواوەتی ئەم میللەتە بگەڕێ، جگەلەمانە ئەوەی بەدوای مێژووی تەواوەتی ڕۆژهەڵاتدا وێڵە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لەو ڕۆژانەدا کە گەلانی ڕۆژهەڵات ڕووبەڕووی گەلانی ڕۆژئاوا وەستابوون، پارێزگاریی زەمینی پیرۆزو قەراخی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاستیان دەکرد، بێگومان ئەوە دەبەوێ بارودۆخی گەلانی ڕۆژهەڵات تێبگا بەتایبەتی کوردەکان کە بەشداری سەرەکی ئەو جەنگانە بوون کە لە سەردەمی دەوڵەتی نوری و سەلاحەدیندا ڕوویان داوە.

## کۆمەڵەی سەلاحەدینی خێرخواز

لەمەوپێش یەك دووجار ناوی ئەم کۆمەڵەیەم هێنا کە لە عەمان پێکهاتووە، منیش پێش سەردانەکەم لە مامۆستا گەورانی دەمبیست کە لە ئوردون شتێکی وا هەیەو کوردەکانی ئەوێ پێکیان هێناوە، بۆیە کە چوومە خزمەت مامۆستا لەوم پرسی، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: "لەڕاستیدا من ڕێخۆشکەرو هاندەری دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیەم، کە لە سەرەتاوە پارچەیەك زەوی بەنرخم پێشکەش کردن کە نرخەکەی شەست هەزار دیناری ئوردونی بوو، بەڵام لەدواییدا وا بە باشزانرا کە ئەوە بفرۆشرێ و بە نرخەکەی زەوییەکی کە کڕا کە شوێنێکی ڕێکوپێکی هەیەو کوردەکانی ئوردون بەزۆری ڕووی تێدەکەن." ئنجا بۆم دەرکەوت کە حکومەتی ئوردونیش دە هەزار دیناری ئوردونیان وەك یارمەتی پێبەخشیون، ئەمەش زیاتر ئاوڕدانەوەو بێ فەرقی خاوەن شکۆ مەلیك حوسەین ڕوون دەکاتەوە کە ئەویش دوو زاوای هەن، هەردووکیان کوردن، یەکێکیان مێردی خوشکیەتی و ئەویتریان مێردی کچیەتی.

مامۆستا سیدۆ دەڵێت: "دوای ئەوەی خوێندنم لە دانشگای (ئەمریکان) لە بەیروت لەساڵی (١٩٢٨)دا تەواوکرد، خۆم ئامادەکرد بۆ ئەم گەڕانە، تا خوا کردی

لەساڵی (١٩٣١)دا بە كوردستانی عێراقدا گەڕام و زۆر هەوڵمدا ئەوەی بەچاوی خۆم دیومە بینوسم". لەدواییدا دەڵێت: "ئەم كتێبە لە سێ ڕوو ئەدوێ".

یەكەمیان: باسی مێژووی كورد بەشێوەیەكی گشتی و كوردستانی عێراق بەشێوەیەكی تایبەتی.

دووەمیان: باسی مێژووی كورد بەشێوەیەكی گشتی دەكات لە دێرزەمانەوە تاكو ئەمڕۆ.

سێهەمیان: لە ژیانی كۆمەڵایەتی و وێژەیی كورد دەدوێ. مامۆستای بەڕێز وەك وتمان لە هاوینی ساڵی (١٩٣١)دا لە عەممانەوە بەرەو شام جوڵاوەو لەوێوە بە دەشتە كاكی بە كاكییەكەی شاما بەرەو بەغدا هاتووە لە (١٥)ی تەموزدا گەیشتووە، لەوێوە بە شەمەندەفەر بەرەو كەركوك كەوتۆتە ڕێ و لەوێشەوە بەرەو سلێمانی و لەوێوە بۆ هەڵەبجەو بیارەو تەوێڵە. لەم بەینەدا بەدوورودرێژی باسی مێژووی شارەزووری باقی ناوچەكە لە كۆنەوە دەكات بەتایبەتی لە سەردەمی بابانەكان و ئینگلیزو شێخ مەحموداو هۆی شۆڕشەكانی كورد دەهێنێنەوە.

ئنجا باسی شتێكی خۆش دەكات: كە هاوڕێكانی دەعوەتی دەكەن بۆ سەرچنار دەڵێ:" كە دانیشتبووین لەسەر زەوی لەو كاتەدا مارمێلكەیەك بەلاماندا تێپەڕی، منیش كورج هەڵمگرتە بەردێك و وام هاویشت بیكوژم، بەڵام بەری نەكەوت، پیاوێكی پیر لەلامانەوە دانیشتبوو بەبێ دەنگ چرپانی بە گوێی ئەوەی تەنیشتیا.. ئایە گوناهی ئەو مارمێلكەیە چیە؟ وا ئەم پیاوە ئەیەوێ بیكوژێ!" وە دەڵێ:" هەرچەند ئەوساكە كوردیم باش نەدەزانی، بەڵام كە هاوڕێكەم بۆی باسكردم زۆر سەرم لەو كەسانەو لەو سەرچاوانە سووڕدەما كە كورد بە شەڕانی و شەڕفرۆش دادەنێن، ئەوان كوشتنی گیانلەبەرێكی وەهایان لا گوناهە، ئەی لەبەر بەرگری گیان و مافی خۆیان نەبێت خۆ هارنەبوون بچن بەگژ خەڵكدا." لەم گەڕانەیدا زیاتر مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەگەڵدا بووە.

مامۆستا دوای ئەوەی دوو هەفتەی پێدەچێت لە (٢٦)ی تەموزی ئەو ساڵەدا بەرەو هەولێر دەکەوێتە ڕێ، لەوێوە بۆ شەقڵاوەو ڕەواندزو بێخاڵ. لێرەدا بە دوورودرێژی باسی مێژووی هەولێرو باسی پاشای ڕەواندز (میر محەمەدی گەورە)، دوای گەڕانەوەی بۆ هەولێر سەرێکی کۆیەش دەدات، کە ئەوسا کاکەی حاجی مەحمود میوانداریی کردوەو دەچێتە چنارۆکیش بۆ خزمەت (حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە) (باپیری کاک مەسعود محەمەد) کە ئەویش ئەم بەیتەی بۆ هەڵدەدا بەسەر ناوچەکەو بەروبومیدا: هەناری نازەنین و قۆخی میران و سێوی شەقڵاوێ.

بە حەققەت جەنەتەل عەدنن چنارۆکیش لەبەر ئاوێ.

دوای ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ هەولێرو لەوێوە بۆ موسڵ، لەوێشەوە بەرەو دهۆك و عەمادیە (ئامێدی)و لەناو ئاخندا باسی دانیشتوان و شۆڕشەکانی بارزان و باسی تەیارییەکان دەکات و باسی (سۆلاڤ و بامەڕنێ و شێخ بەهادینی نەقشبەندی و شێخ غیاثی کوڕی) کە ئەوسا ئەندامی ئەنجومەنی ریشسپیان (اعیان) بووە.

دوای ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ موسڵ و لەوێوە لە ڕۆژی (١١ ئابی ١٩٣١)دا بەڕێگای (دیر الزور)دا دەگەڕێتەوە بۆ شام و لەوێوە بۆ عەممان.

لە (نیظامی اساسی) کۆمەڵەی سەلاحەدیندا هاتووە (هەڵسان بەکاری خێر بۆ دەستگیرۆیی و بەخشین، بە پێشکەشکردنی یارمەتی مادی و کۆمەلایەتی بۆ هەژارو دەستکورتەکان، سەرپەرشتیکردن و ڕێگاپیشاندانی گەنجەکان، لەڕێی کۆمەلایەتی و وەرزشەوە، هەڵسان بە کاروباری ڕۆشنبیری و پەروەردەیی، کردنەوەی شوێنی دروومان. کردنەوەی باخچەی منداڵان، کردنەوەی مەڵبەند بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواریی).

لە مادەی سێهەمیشدا دەڵێت: "کەوا ئەم کۆمەڵەیە هەرگیز خۆی لە کاروباری ڕامیاری و ئاینی و تائفی هەڵناقورتێنێ و خزمەتی خۆی بۆ گشت نیشتمانیەك بەبێ جیاوازی پێشکەش ئەکات."

لە مادەی چوارەمیشدا ناوی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکەی تۆمارکردووە کە ئەمانـە هەندێك لەو ناولەن وەك خۆیان کە نووسراون: (محەمەد عەلی ئـەلکردی، الحـاج خـزر ئەحمەد، محەمەد فەهمی عیسی، سلێمان محەمەد زازا، ئەحمەد محەمـەد ئـەلکردی، یاسین عەلی ئەلکردی، محەمەد مستەفا ئەلکردی).

هەر کەسێکیش چ ژن بێ چ پیاو بۆیان هەیە ببن بە ئەنـدام لـەم کۆمەڵەیـەدا بـەو مەرجانەی کە لە (نزام)ەکەدا دانراون.

وەك تێگەیـشتم خـەڵك بـەزۆری سـەر لـە مەڵبەنـدی ئـەم کۆمەڵەیـە دەدەن، خواردنەوەی مەی قەدەغەیـە، بێجگەلـەوە خـواردن و خواردنـەوە لـە (یانـە)کەیانـدا هەیە، وەك بیستم مەڵبەندێکیشیان بۆ بەرگدروون کردۆتـەوەو ئیـشیان بـەرەو باشـی دەڕوات.

## کۆمەڵەی سەلاحەدینی عەممان و یانەی سەلاحەدینی بەغدا.

دوا قـسەم لێکـچواندنێکە لەبـەینی کۆمەڵـەی سـەلاحەدینی عـەممان و یانـەی سەلاحەدینی بەغدا.

ئەوەی پێویست بوو لە بابەت ئەوەی عەممانـەوە وتمـان تـەنها ئـەوە نـەبێت کـە کۆمەڵـەی سـەلاحەدین عـەلی سـیدۆ گـەورانیان هەڵبـژاردووە بـە سـەرۆکی (فـەخری) کۆمەڵە بەرامبەر بە یارمەتیەکانی.

یانـەی سـەلاحەدینی بەغـداش (نووسـەری ئـەم باسـە)یـان بـەگوێرەی بڕیـاری دەستەی بەڕێوەبەر هەڵبژارد بە سەرۆکی فەخری یانەی سەلاحەدین، بەوەدا کە ئـەو دامەزرێنـەری یانـەی سـەلاحەدینە، هـەر دوولا (واتـا کۆمەڵـەو یانـە) کـورد دایـان مەزراندوون، بەلام بۆ هەر کەسێك کە (مـەرج)ی نیزامـی تێدابێت مـافی ئەندامیـەتی هەیە.

هەروەها لە پایتەختدان ئەو لە عەممان و ئەم لە بەغدا، لە زۆرو هەموویانەوە ناوی هەروەها بەناوی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی (مایەی شانازی و سەربەرزی کوردو عەرەب و ئیسلام)یەوە ناونراون و زۆر لێکچواندنی تریان لە بەیندایە.

دەمێنێتە سەر ئامۆژگاریەکی دڵسۆزانە، بەتایبەتی کەوا هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری نوێی یانەی سەلاحەدینی بەغدا لە مەیداندایەو بەڕێوەیە داوا لە دەستەی نوێ دەکەین و دەڵێین کەوا کاتی ئەوە هات، بیر لەوە بکرێتەوە کە یانەی سەلاحەدینیش هەر تایبەت نەبێ بۆ خواردن و خواردنەوە بەس، بەڵکو هەندێ خزمەتی کۆمەڵایەتی تر بگرێتە ئەستۆ بەگوێرەی نیزامەکەی، جگەلە زیندووکردنەوەو پەرەپێدانی جوڵانەوە ڕۆشنبیرییەکانی جاران و پێشانگای کتێب و هونەرمەندان پێشاندان و لەم بابەتە ئیتر خوا هەموو لایەك سەرخات بۆ خزمەتی گەلی کوردو هەر گڵۆپێکی ڕوون و پرشنگدار بێت بۆ مێژوو بۆ زمان بۆ ڕۆشنبیری...

هاوکاری. ژمارە– ١٤٢٥ ڕۆژی ١٢ ئازاری ١٩٩٢

بەداخ و پەژارەوە ئێستا (دوای نەمانی بەعس) یانەی سەلاحەدین وێران کراوەو کەس لێی ناپرسێتەوە ئەو یانەیەی بە دڵ و بە گیان وەك بیلبیلەی چاومان ئەمانپاراست، کەچی لەم ڕۆژانەدا کە چمکێك لە جڵەوی حوکم بەدەست خۆمانەوەیە، یانەی سەلاحەدین بۆ بە سەرە نوێلك. کەسێك لە کار بەدەستانی خۆمان لێی ناپرسێتەوە و هەوڵی ئەوە نادەن گیانی بەبەرا بکەنەوە.

لاوانی کورد له بەغداد  له باخچەی مۆد له صاڵحیه   1925



## لاوانی کورد لە بەغداد لە باخچەی مۆد لە صاڵحیە ١٩٢٥/٥/٨

ڕیزی پێشەوە:
(منداڵەکە سەلاحەدین ساڵح زەکی لە تەنیشتیەوە یونس ساڵح زەکی)٠

دانیشتوەکان لە چەپەوە بۆ ڕاست:
(١ـ محەمەد فایق/ هەولێر (حربیە) ٢ـ عەبدولکەریم ئیسماعیل/سنجار (دارمعلمین) ٣ـ مستەفا بەهجت / سلیمانیە (دار معلمین) ٤ـ عەبدولقادر رشید/ هەولێر (کۆلیچی حقوق) ٥ـ مستەفا سائب/ سلیمانیە (هەندەسە) ٦ـ عەلی رەفیق/ کەرکوك (دارمعلمین) ٧ـ عبدولەێ عزیز/ هەولێر (دار معلمین)٠

وەستاوەکان لە چەپەوە بۆ ڕاست/ ڕیزی پێشەوە:
(١ـ یوسف عونی/ کەرکوك (دارمعلمین) ٢ـ رەشید محەمەد/ هەولێر (شەریعە) ٣ـ عبدلێ مجید بابان/ سلیمانی (هندسە) ٤ـ ئەنور سائب/ سلێمانی (هندسە) ٥ـ عەبدوڵێ ئەمین/ (عمادیە) ٦ـعەبدولخالق قتب/ کەرکوك (دار المعلمین) ٧ـ رەشید عارف/ کویسنجاق (هەندەسە) ٨ـ ئەحمەد ئەمین/ کەرکوك دارمعلمین ) ٠

وەستاوەکان لە چەپەوە بۆ ڕاست/ ڕیزی پشتەوە:
(١ـ فوئاد رەشید/ سلیمانیە دارمعلمین ٢ـ رەئوف نجیب/ سلیمانی (صیدلە) ٣ـ عەبدولواحد مەجید (ع٠ و٠ نوری)/ سلێمانی (دارمعلمین) ٤ـ عەبدولرەحمان نورجان/ کویسنجاق (دارمعلمین) ٥- سەعید فهیم/ کویسنجاق (دارمعلمین) ٦ـ بەهائەدین قتب/ کەرکوك (حقوق)٠

